# کورد له میسر

## به درێژایی سەدەکان



نووسینی:
دورییە عەونی
مەحمود زاید
مستەفا عەوەز

حوسێن مستەفا
لە عەرەبییەوە کردوویە بە کوردی
2013

# کورد لە میسر
# بە درێژایی سەدەکان

نووسین و ئامادەکردنی:

دوڕییە عەونی          مەحمود زاید          مستەفا عەوەز

وەرگێڕانی لەعەرەبی:

حوسێن مستەفا

٢٠١٣

ناوی کتێب: کورد لە میسر بە درێژایی سەدەکان
لە نووسینی:
دورییە عەونی،
مەحمود زاید،
مستەفا عەوەز
وەرگێڕانی لە عەرەبی: حوسێن مستەفا
نەخشەسازی ناوەوەی کتێب: سامی فەتاح
بەرگ: تەیب موعتەسم
وێنەکان: لە ئینتەرنێتەوە
بڵاوکراوەی : خانەی چاپەمەنی سۆران
چاپی یەکەم: ٢٠١٣
تیراژ: ٥٠٠ دانە
نرخ: ٤٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن : لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان
ژمارەی سپاردنی (٢٦٥٦)ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە

## دیاریو پێشکەشە:

بەو جوامێرانەی
تەمەنێکی دوورو درێژ
دەڕێدابوونو تێکۆشان.
زۆرجار کەوتنو هەستانەوەو تێکنەشکان!
لە مەیدانی رمبازێنو تیخو شیرا
لە مەیدانی فەلسەفەو هونەرو بیرا
بەناو هەزاران دڕکەزێی دوژمنانی سەختگیرا
خۆیانو مێژووی لەت لەتو
بە جەستەی پڕ برینو ژانەوە،
هەر رۆیشتنو نەکەوتنو نەپسانەوە!
بەڵام ئاخ!! نەگەیشتنە ئەم رۆژگارە
تا ببینن ئەو ئاڵایەی بۆی تێکۆشان،
وا باڵاکەی گەیشتۆتە قوببەی ئاسمان!!

(وەرگێڕ)

## ناوەرۆك:

## پێشەکی وەرگێڕ:

بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی، چەندین نەتەوەی جیاجیا لە تۆرەمەو پشتی نەتەوەی تردا کەوتوونەتەوەو لێرەو لەوێ بەسەر خاکو لەوەڕگاو زەوی بەراودا راگەیشتوون‌و ئاوایان کردۆتەوە، بەڵام لەگەڵ هێزو ویستی ئاوەدانکردنەوەشدا، هێزی تەماعگێرو خۆویست، هەرکاتێ کە خۆی بەهێز دیتبێ‌و دەوروبەرەکەشی بە لاوازو بێدەسەڵات، ئەوا شوولی داگیرکاریی لێ هەڵکردووەو نەك هەر ماڵ‌و موڵکیان زەوت کردوون، بەڵکو قڕیان دە خەڵکەکەیش خستووەو لەناویان بردوون، یان لەناو خۆیاندا تواندوویانیانەتەوە. بۆیە ئەگەر لەملا نەوەتەوەو تۆرەمەی نوێ سەریان لە قاپێڵ دەرهێنابێ، لەولاشەوە نەتەوەی دی ناویان چۆتەوە ناو لانکان‌و ببڕای ببڕ سەریان هەڵنەداوەتەوەو مێژووەکەشیان کوێر بۆتەوە. لەو ناوەشدا نەتەوەو گەلی وا هەبووە سەرسەختانە بەرگری لەبوونی خۆی کردووەو بە نرخی سەرو گیانی رۆڵەکانی، ناوو مێژوو و ناسنامەی خۆی‌و خاکەکەی لەدەستی دەستدرێژکارانی دەسەڵاتدار پاراستوە. دیارە ئەو پارێزگاری لە بوون‌و ناسنامەیە هەروا بە ئاسانی نەبووەو چیرۆکی ناو ئەفسانەکانیش نییە، بەڵکو ئەمە سەربوردەو واقیعێکی راستەقینەی تاڵ‌و بەسوێیە، کە بە درێژایی ژیانی مرۆڤایەتی هێشتا ئەو شوێن زامانە هەروا خوێن‌و زوخاویان لێ دەتکێ.

یەکێك لەو گەل‌و نەتەوانەی بە درێژایی مێژوو تا ئەمڕۆشی لەگەڵدابێ، وەك ئاردی ناو تەڕاشان پەرت‌و بڵاوکراوەتەوەو خاك‌و نیشتمانەکەی داگیرو دابەش کراوەو رۆڵە بێوەی‌و مرۆڤدۆستەکانی بە شمشێرو خومپارەو بە پیلان‌و رێککەوتننامەکان خەڵتانی خوێن کراون‌و خاك‌و زێدیشیان سووتێندراوە، گەلی کوردە. بەڵام ئەو گەلە ژیاندۆستە لە ئاست ئەو هەموو دوژمنە زۆرو زەوەندانەی هەرچوار کەنار، سەرو ماڵی خۆی ناوەتە پارسەنگی ئازادی‌و زیندوو هێشتنەوەی ناسنامەکەی، بۆیە ئەگەر لەسەر دەستی دوژمنە داگیرکارە

دڵڕەقەکان ڕووبەڕووی قڕکردن بۆتەوە، بەڵام ئەو کوردە نە خۆی داوەتە دەستی قەدەری دوژمنان، نە لە ترسی سەری خۆی دەستبەرداری خاکو مێژوو و ناسنامەکەی بووە. بۆیە ئەگەرچی سەدان ساڵە لە هەموو لاوە ڕاودەنرێو دەکوژرێ، بەڵام سەری زیندووی خۆیو مێژوو و ناسنامەکەی بە بڵندی هێشتۆتەوەو لە مەیدانی سەختی ململانێدا وەك سواری برینداری نەبەز، هەر بەسەر پشتی ئەسپی شۆڕشدا لە مەیداندا جەنگاوەو تا ئەمڕۆش، کە هەرچەندە خوێن لەسەراپای گیانو جێ زامەکانی دەتکێ، بەڵام وەك دەیان نەتەوەی بزر بوو، بزر نەکراو نەتوێنرایەوەو لەناو نەچوو، بەڵکو تا ڕۆژگار زیاتر هەڵدەکشێ، ئەو کوردە زیاتر لە مەیداندا دەردەکەوێو بە دەنگی نێرەوە بە ڕووی دوژمناندا چەقیوەو داوای هەموو سەروەرییەکانی خۆی دەکاتەوەو هەوڕێ بێ یان سبەی، تەواوی خاکو مافو سەروەرییەکانی خۆی وەردەگرێتەوە.

لەناو ئەو ململانێ سەختو دژوارانەدا، هەرچەندە کە کورد خۆی گرتو نەتوایەوە، بەڵام لەهەندێك قۆناغو وێستگەی ئەو کاروانە خوێناویەدا، چ بۆ دەربازکردنی سەرو گیان بووبێ تا دەرفەتی هەڵسانەوەی بۆ دێتە پێش، چ بۆ گەڕان بەدوای سەرچاوەکانی ژیانو ژیاریو خوێندەواریو زانست بووبێ، چ وەك دوورخستنەوەی بێ ویستی خۆی بووبێ، لێرەو لەوێ، پەنای وەبەر پەسیوان بردووەو لە وڵاتانی دوور یان نزیك، لەبەرچاوان یان لاتەریك، خۆی گرتۆتەوەو تێکەڵ بە کۆمەڵگاکانیان بووەو وەك میوانێکی ڕەزا قورس نا، بەڵکو وەك هاوڵاتییەکی خۆجێیی وەفای نواندووەو دڵسۆزو ئەمەك لەچاو بووە بۆ نیشتمانی دووەمو پەناگەی ژیانی، بەڵام وەنەبێ لە بنەچەی ڕەسەنی خۆی هەترە بووبێو حاشای لە کوردبوونیەوە کردبێ. خۆ ئەگەر بەدوای سەلماندنی ئەو ڕایەشماندا بگەڕێینو بمانەوێ سۆراخ لە دۆتمام و پسمامەکانمان لە قوژبنەکانی جیهاندا بکەین، دەبێ بست بە بستی وڵاتانیان بەدوادا بپشکنین و دۆکیۆمێنتە مێژووییەکان هەڵدەینەوەو بە ڕەچەڵەکی هەر یەکەیاندا

بچینەوەو سەریان ببەینەوە بەر دەرگای ماڵە باوانیان لە هەوارە بەجێماوەکانیان. خۆ ئەگەر ئێمەش خۆمان زاتی ئەوەمان نەبوو دەست لەخۆمان بنێین‌و سەرێ لەسەری دۆستو ئەحبابان هەڵکەین، ئەوا مێژوونووسان لێرەو لەوێ، مینا ئەو سێ بەرێزەی ئەم کتێبەیان بە دەستەجەمعی نووسیوەو لێفەیان لەسەر هەندێ لە ئاشنا دابڕاوەکانمان هەڵداوەتەوە، یان هەر خودی ئەو نەوە رەسەنزادانەی هەترە لە نیشتمان‌و زێدی باوان، وەك ئاوی ساوی جۆگەلەی بنار، بەرەو رووباری بەخورِ دادەگەڕێن‌و تێکەڵی دەبنەوە، ئەوان بەخۆیان‌و بە دەستچنی مەعریفەو پیشەو ناوو ناوبانگیانەوە، ناسنامەی کوردبوونی خۆیان ساغ دەکەنەوە.

ئەم کتێبە، (کورد لە میسر، بەدرێژایی سەدەکان) چاپی یەکەمی ٢٠١١ی قاهیرەیەو مامۆستا نوری بێخاڵی لە میسر بەدیاری بۆیهێنام، لە نووسینی هەریەکە لە نووسەرانی میسری (خاتوو دورِەییە عەونی- نووسەرو رۆژنامەوانی بە رەسەن کورد، مەحمود زاید - مامۆستای یاریدەدەر لە زانکۆی ئەزهەرو پسپۆر لە کاروباری کورد لە مێژووی هاوچەرخ، مستەفا عەوەز - مامۆستای مێژوو و شارستانییەتی ئیسلامی لە زانکۆی ئەزهەر) دەربارەی مێژووی کوردیان نووسیوە لە میسر. رەنگە کەم تا زۆر خوێنەران‌و رۆشنبیرانی کورد ئاشنایەتییەکیان بە ناودارانی کورد هەبێ لە میسر، بەڵام زۆر دەگمەنن ئەوانەی قورسایی پێگەی کورد لە مێژووی میسر درك پێ دەکەن، بەتایبەتی لە سەردەمی دەوڵەتی ئەییوبی، لەسەردەستی سەرکردەی قارەمانی کورد سەلاحەددینی ئەییوبی‌و دەوڵەتی هاوچەرخی میسر لەسەر دەستی پاشایەکی بوێرو دانا، کە محەمەد عەلی پاشای گەورە بووە. وێرای ئەو هەموو پلەو پایەو خزمەتە زۆرەی کە قارەمانان‌و خوێندەوارانی کورد بە دڵسۆزییەوە پێشکەشیان بە وڵاتی میسرو ئیسلام کردووە لە هەموو بوارێکەوە.

ئەم کتێبە ئەگەرچی زۆر بە کورتیش بێ، بەڵام تیشك ئەخاتە سەر

بەشێکی گرنگی مێژووی کورد لە تاراوگە، بۆ ئەمەش پشتیان بە دەیان سەرچاوەی گرنگی مێژوویی‌و ئەو سەردانە مەیدانیانە بەستووە، کە راستەوخۆ بۆ سۆراخپرسین بە گوندو شارەکانی کورد لەناو میسر دا گەڕاون، کە زۆرینەی خەڵکەکەیان لە بنەچەی کوردە رەسەنەکانن. بەڵام وەك ئەو نووسەرە بەڕێزانە لە کۆتا پەرەگرافی کتێبەکەدا وەك روونکردنەوە رایانگەیاندووە، ئەمەی لەو کتێبەدا هاتووە، نەك هەموو مێژووی کورد نییە لە میسر، بەڵکو ئەمە تەنها بەشێکی کەمەو لە کاتی هێنانەوەی نموونەکانیش، تەنها نموونەیان لەچەند خانەوادەیەك وەرگرتووەو زۆربەی خانەوادەکانی تر، کە هەر ناویان هاتووەو کەسایەتییە گرنگو ناودارەکانیان لەم کتێبەدا بەسەر نەکراونەتەوە، کە خۆزگە وا نەبووایەو تا بکرابووایە هیچ کام لەو کوردە خاوەن وەزیفەی باڵای میری‌و پێگەی مەعریفی‌و رۆشنبیری فەرامۆش نەکرابووان، بۆ ئەوەی ئێمەمانان‌و خوێنەری غەیرە کوردیش، بەتایبەتی عەرەبەکان، باشتر ئاشنای کورد ببان‌و درکیان بە تواناو بوێری‌و دڵسۆزی‌و پاکی ئەو کوردانە ببردبا، کە سەرتۆپی مێژووی سەدان ساڵی رابردووی عەرەب‌و ئیسلام بوونە.

ئەم کتێبە کە لاپەڕەیەکی نوێیە لە سەربردەی ژیانی کورد لە تاراوگە، وەنەبێ کۆتا پەڕەو دوا جۆگەلەی ساو بێ، بەڵکو وەك پێشتر گوتمان، ئاوڕ وەهەر لایێ بدەینەوە، ئەوە پسمامو خاڵۆزاو پورزاکانمانن، لەناو کۆمەڵگای فارس‌و چەرکەس، تورك‌و ئەرمەن، عەرەب‌و رۆم‌و رووس، ئینگلیزو فەرەنگ‌و ئەمریکی، کە وەك نێرکی رێواس بە ناسکی سەریان دەرهێناوەو هەموو لایەکیشیان هۆگر بە خۆشمێری‌و خۆشتەبعی خۆیان کردووەو ئەوڕۆ کورد ئەگەر وەك نەتەوەش لەناویاندا تاقانەی غەریبە بێ، بەڵام تاکەکانی کورد وەك هاوڵاتی نیشتمانی دووەمیان، پێگەیەکی مەعنەوی باشیان هەیەو تا دێ ئاست‌و کاریگەرییان لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا دەردەکەوێ.

لەو روانگەیەوە، وەرگێڕانی ئەو کتێبەم بۆ زمانی کوردی زۆر بە گرنگ

زانی، تا رۆڵەی کورد بێئاگا نەبن لە مێژووی پڕ سەروەریی و پەرش و بڵاوی گەلەکەیان. دەمەوێ ئەوەش بە خوێنەری خۆشەویست رابگەیەنم، کە بەندە ئەوەندەی پێمکرابێ لە وەرگێڕاندا تایبەتمەندی نووسینی ئەو سێ نووسەرە بەرێزەم لەبەرچاو گرتووەو وردو درشتی نووسینەکەیانم وەك خۆی وەرگێڕاوە، چونکە کتێبەکە زادەی سێ شێوازی نووسینە، یەکێکیان کە تایبەتمەندە لە بواری رۆژنامەوانیی و بەو پێیەشەوە کە خۆی لە رەچەڵەکی کوردە، بۆنی هاوسۆزیی بۆ باوان و رەچەڵەکەکەی لێ دێت و خوێنەر تام بەو هەستەی ئەو دەکات، بێ ئەوەی بەنی زیادی دەدوا دابن. ئەو دوو بەرێزەی تریش کە تایبەتمەندی بواری مێژوون لە زانکۆی ئەزهەر، شێوازو دیدگای تایبەتیان هەیە بۆ نووسینەوەی مێژوو. بۆیە من بە پەیبردن بە تایبەتمەندیی و شێوازی نووسینی ئەوان، نەمویستووە ئەو مۆرکە نادیدە بگرم، بەڵکو وەك خۆیی و بە سادەیی و کوردییەکی رەوان رستە بە رستەم وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. وەلێ دەبێ ئەوەش بزانین کە سەرەڕای ئەوەی شێوەزمانی میسری بۆ خۆی تایبەتمەندییەکی هەیەو چەندین وشەو ناو و زاراوەی هەن، کە لە شێوەزاری دیکەی عەرەبیدا نین، بەڵام وێڕای هەموو ئەمانەش کتێبەکە پڕە لە وشەو دەستەواژەی تورکی کۆن، بەوپێیەی کە ئەو بەشەی مێژووی میسر کە پەیوەستە بە کورد، بە حوکمی ئەوەی زۆرینەی کەسایەتیی وماڵباتە کوردەکانی روویانکردۆتە میسر لە کوردانی بن دەستی تورکیای سەردەمی عوسمانی بوونە، هەمیش بەهۆی کاریگەریی و پێگەی دەوڵەتی عوسمانی، وشەو دەستەواژەگەلی جۆراوجۆر، نەخاسمە لەبواری سەربازی، خزاونەتە نێو زمانی نەتەوەکانی دەوروبەر، بە تایبەتی بۆ ناو زمانی کوردیی و عەرەبی، بۆیە لە زۆر شوێندا پێویستی کردووە کە ناو و دەستەواژەکان وەك خۆیان بنووسرێنەوەو لە پەراوێزدا مانایان بۆ بنووسرێ، جا چ پەراوێزی نووسەرە بەرێزەکان، کە ئاماژەیان بۆ سەرچاوەکان کردووەو

له ژێرەوەی لاپەڕەکاندا نووسراونەتەوە، چ ئەو پەراوێزو تێبینیانەی بەندە نووسیونی، کە لە هەمان شوێن و لەناو رستەکەدا لە ناو کەوانەیەکدا بە ئاماژەی (...– و) نووسیومن، یان ئەوانەی لە ماڵپەڕی ویکیپیدیاوە وەرمگرتوون (...– ویکیپیدیا–و). چونکە ئەو ناو و زاراوانە بوونەتە بەشێك لە ناو و زاراوەو وشەی بەکارهاتوو لەناو زمانەکانی دیکەدا. بەڵام کاتێك کە گەیشتوومەتە سەر ناوی شوێنەکان، هەروەها ئەو سەرچاوانەی کە نووسەران پەنایان بۆ بردووە، هەموویانم هەر بە زمانی عەرەبی نووسیونەتەوە، بۆ ئەوەی کاتێك کە کەسێك بەدوای شوێنەکە یان سەرچاوەکەدا بگەڕێ، ناوەکەی بە عەرەبی لەبەردەستدا بێ ئاسانترە تا ناوێکی وەرگێڕدراو، چونکە کاتێك کە ناوەکان لە زمانێکەوە بۆ سەر زمانێکی دیکە وەردەگێڕدرێن، بەهۆی جیاوازی پیتەکانی زمانەوە، گۆڕان بەسەر فۆنەتیکی ناوەکاندا دێتو جۆرێکی تر وەردەگرن، ئەوکاتیش دۆزینەوەی ناوە راستەقینەکە ئەستەمتر دەبێت.

ئەوەش لای خوێنەرو رۆشنبیری کورد روونە کە هیچ هەوڵو نووسینێك بێ کەمو کوڕی نییەو هەمیشە کەسانی دیکە هەنگاوی تر هەڵدەگرنو زیادەیەك دەخەنە سەر خەرمانەی ئەوەی نووسراوەو ئەوەی کراوە. بەهەمان شێوەش، ئەم کتێبە وەك گوتم چونکە بە کورتی لێبڕاوەتەوەو باسی لە چیرۆكو مێژووی تەواوی کوردانی میسر نەکردووە، بۆیە کەمو کوڕی تێدا بەدی دەکرێو هیوامان وایە ئەو بەڕێزانە، یان هەر دڵسۆزێکی تر ئەو چەند لاپەڕە مێژووە درەوشاوەیەی میسر بنووسێتەوەو ئەم هەنگاوەی ئەو سێ نووسەرە تەواو بکات. هەروەها دەبێ ئەوەش بڵێم کە وەرگێڕانەکەی منیش بێ کەمو کوڕی نییە، بەتایبەت کە وەك پێویست دەستم وە سەرچاوە لە بوارەکەدا رانەگەیشت. بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە زانیارییەکانی ئەم کتێبە سەبارەت بە کورد زۆر تازەو گرنگن، نە خاسمە بۆ ئەوانەی لە بواری مێژوودا سەرەدەرییان هەیە.

**سەرزەمینی بلیمەتان:**

رەگەزی میسریی کە دەکەوێتە جەرگەی کیشوەری ناوین، خاڵ‌و شوێنی بەیەکگەیشتنی نەوەی (حامییەکان و سامییەکان)ە. (سامییەکان بە عەرەب‌و بەنی ئیسرائیلی‌و نەتەوەکانی رۆژهەڵات دەگوترێ‌و دەگەڕێنەوە سەر نەوەی سامی کوڕی نوح، بەڵام حامییەکان بە ئەفریقیەکان‌و قبتی‌و نەتەوەکانی رۆژئاوایی دەگوترێ‌و دەگەڕێنەوە سەر نەوەی حامی کوڕی نوح...– و) لە میسردا، ئەوروپای سپی‌و ئاسیای زەردو ئەفریقای رەش بەیەك دەگەن. بۆیە میسر ئەو تێکەڵە کیمیاییەی نێوان خوێنەکانی ناسی، بەڵام خودی گەلەکەی تێکەڵ نییە[1]... رەسەنایەتی خودی میسریەکە خۆیەتی، یان مۆرك‌و شەقڵ میسریەکەیە، کە ناوەندو کۆیە لە هاوسەنگی‌و گونجاندنێکی نایابدا".

جەمال حەمدان [2]

" شەرەفێکی گەورەیە بۆ وڵاتی کوردان دوو قارەمانی نەمری بە جیهانی ئیسلامی بەخشیون، کە سەلاحەددین‌و محەمەد عەلی گەورەن، ئەوان لە ژینگەی کوردیدا بەیەکدەگەنەوە، لە بزاوت‌و گەشەکردنیشدا لە میسر، لەرەچەڵەکیشدا لە قەڵای یوسفییە بەیەکدەگەنەوە، (واتە قەڵای سەلاحەددین لە قاهیرە)، چونکە دروستکردنی ئەو قەڵایە دەگەڕێتەوە بۆ سەلاحەددین‌و نۆژەنکردنەوەشی بۆ محەمەد عەلی گەورە"

عەباس مەحمود عەققاد [3]

---

١– بەو مانایەی کە ئەو لە چەند رەگەزی جیا پێکنەهاتووە، وەك ئەوەی ولایەتە یەکگرتووەکان‌و قەوارەی زایۆنی.

٢- (شخصیة مصر–ج ٤)، دار الهلال– قاهرة. ل ل٥٠٤– ٥٠٨.

٣- کۆواری (المصور)ی میسری، ژمارە (١٣١١) رێکەوتی ٤ی سەفەر ١٣٦٩ك/ ٢٥ی تشرینی دووەمی ١٩٤٩ز، ل٥٦.

## کورد لە کتێبە ئاسمانییە پیرۆزەکاندا:

شایانی باسە لە کتێبە ئاسمانییەکاندا ئاماژە بە کوردو کوردستان کراوە، وەك:

**تەورات**: تەورات سەرەتای دروست بوونی مرۆڤ لە دونیادا دەگەڕێنێتەوە بۆ خاکی کوردستان: تیایدا هاتووە کە : (ان الله خلق الجنة له فیما بین نهري دجلة و فرارت) [٤] واتە (خوداوەند بەهەشتی لەنێوان هەردوو رووباری دجلەو فورات دروست کرد)، وەك زانراویشە کە ئەو دوو رووبارە لە کوردستان دان. هەروەها لە (کتێبی یەکەمی موسا لە سورەتی ١٢ ئایەتی ٨-٥١ دا هاتووە : (الله خلق جنته في شرق ئیدن، و فیها خلق الله ذلك الانسان واسکنه فیها، وبعد ذلك اخرج الله في ئیدن نهرا لیروي جنته: نهر بایسان، ونهر کهان، ونهر دجلة، ونهر الفرات)[٥]. واتە : (خواوەند بەهەشتەکەی لە خۆرهەلاتی ئیدن دروست کردو لەوێشدا مرۆڤی خولقاندو لەوێشی جێگیر کرد، دواتر خوداوەند لە ئیدن رووباری بایسان، رووباری کهان، رووباری دجلەو رووباری فوراتی هەڵقولاند، تا بەهەشتەکەی پیێ پاراو بکات).

**ئینجیل**: لە کتێبی دووەمی (الملك) سورەتی ١٧ ئایەتی ٦ هاتووە کە : (في السنة التاسعة لنبوة هوشیا، ملك الاشوریین قام باحتلال وطن السومریین، وتم اسر جمیع الیهود واسکنهم في مدن (هالاه)و (هابور)[٦] علی نهر (کوزان) وفي مدن میدیا). واتە : (لە نۆیەم ساڵی پەیامبەرایەتی هۆشیا، مەلیکی ئاشوورییەکان هەڵسا بە داگیرکردنی وڵاتی سۆمەرییەکانو هەموو یەهودیەکانی بە دیل گرتو لە شاری هالاه و هابوور، لەسەر رووباری کوزانو شارەکانی دیکەی میدیا نیشتەجێی کردن).

**قورئانی پیرۆز**: لە قورئانی پیرۆزدا کوردستان بە " المنزل المبارك- زێدی بەپیتو پیرۆز" چوێندراوە، وەك ئەوەی لەسەر زمانی حەزرەتی نوح (سلاوی خودای لیێ بێت) هاتووە، خوداوەند دەفەرموێ: (وقل ربي انزلني منزلا مبارکا وانت خیر المنزلین) ئا٢٩[٧] واتە: (بشلێ: ئەی پەروەرندەی

خۆم! له شوێنێكی بەپیتم دابەزێنەو، تۆ لە هەموو میوانداران باشتر میوان بەخێو دەكەی– و: مام هەژار). پاش كۆتایی هاتنی تۆفانە گەورەكەش، كەشتییەكەی حەزرەتی نوح (سلاّوی خودای لیّ بیّت) لەسەر كێوی جوودی نیشتەوە، كە دەكەوێتە كوردستانی توركیا. خوداوەند دەفەرمووێ : (واستوت علی الجودي)[8]، واتە (لەسەر جودی نیشتەوە)، ئەو شوێنە پیرۆزەی كە حەزرەتی نوح داوای كردبوو. لەو شوێنەوە ژیانێكی تازە بۆ نەوەكانی ئادەم لەسەر رووی زەوی دەستی پێكردەوە. وەك زانراویشە ئەو تۆفانە هیچ شتێكی لەسەر رووی زەوی نەهێشتووە، جگە لەوانەی لەسەر پشتی كەشتییەكەی حەزرەتی نوح بار كرابوون[9]. دوای نیشتنەوەی كەشتیەكەش، هەرچی لەسەر پشتی دابوو، لەمرۆڤ (كە هەشتا بوون، چل پیاوو چل ژن)،( راستترە بگوترێ چل مرۆڤی نێرو چلی مێ، چونكە رەنگە منداڵیشیان لەگەڵدا بووبن– و)و لە غەیرە مرۆڤیش. دیسان لەسەر خاكی كوردستانەوە دەستیان كردەوە بە ئاواكردنەوەی سەرزەمین، بە كشتوكاڵو ئاژەڵداریو پیشەگەریو بازرگانی. ئێستاش گۆڕی زۆرێك لە پێغەمبەران لە كوردستاندایە، وەك " نوح، یونس، دانیال، نەوم، هەباك". سلاّوی خوا لە هەموویان[10]..

---

[4]- مصطفی مختار: امة الكرد بین ظلم اعدائها وجهل اصدقائها. كتێبخانەی جزیری لەدهۆك، چاپی یەكەم ٢٠٠٧ز، ٢٤.

[5]- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[6]- هابور: هەمان ئەو خابوورەی ئێستا لە زاخۆ لە باكووری دهۆك لە كوردستانی عێراقە.

[7]- سورەتی (المومنون)، ئایەتی ٢٩.

[8]- سورەتی هود، ئایەتی ٤٣. چیای جودی یەكێكە لە بەرزترین لووتكەكانی زنجیرە چیای باشووری توركیا (باكووری كوردستان– و) بەرزییەكەی زیاتر لە حەوت هەزار پێیە(واتە نزیكەی ٢٣٠٠م) لەسەر ئاستی دەریا. لە ناوەڕاستی ئایاری ١٩٤٩ز، یەكێك لە شوانەكان بەناوی (رەشید سەرحان) هەندێك تەختەی پاشماوەی كەشتی حەزرەتی نوح (سلاّوی خوای لیّ بێت) لەسەر لووتكەی چیای جوودی دۆزینەوە كە بەڵگی ئاویان گرتبوو. توێژینەوەكانی دواتریش راستی و دروستییان پشتڕاست كردۆتەوە، بڕوانە (د. زغلول نجار: الاشارات الكونیة في القرءان الكریم و مغزی دلالتها العلمیة) لە رۆژنامەی (الاهرام المصریة) ژمارەی رۆژی ١٢ی كانوونی یەكەمی ٢٠٠٥ز . هەروەها بڕوانە كتێبەكانی تەفسیری قورئان سەبارەت بەو ئایەتە.

[9]- بڕوانە ( سفر التكوین٧/ ١٨–٢٤). (د. زغلول النجار) هەمان سەرچاوە.

[10]- مصطفی مختار: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥.

## پێشەکی (نوسخە عەرەبییەکە):

وڵاتی میسر هەمیشەو لە هەموو سەردەمەکاندا وڵاتێکی سەرنجڕاکێش بووە بۆ مەردووم، لە هەر کوێیەکی دونیادا بووبن‌و هەر رەگەزو ئایینزایەك بووبن، بووەتە جێگایەك، کە کەم جێگای دیکە هەیە وەها بووبێتە پەناگەیەك، کە هەرکەسەی بەویستی خۆی رووی تێکردبێ ئاوێتەی خۆی کردووە، ئەویش بە هۆی جوانی سروشتەکەی‌و شارستانیەتە رەسەنەکەی‌و چاکی‌و لێبووردەیی خەڵکەکەی، کە زۆر دوورن لە هەر خۆپەرستییەك. ئەو خەسڵەتانەشیان لە هەڵکەوتەی شوێنگەکەوە وەرگرتووەو تا ئەوپەڕی دڵسۆزییش بۆی دڵسۆز بوونە.

لەگەڵ ئەو تێکەڵی‌و چوونە ناو یەکییەشدا، زۆرێك لەوانەی روویان کردۆتە میسرو تێیدا جێگیر بوونە، رەچەڵەکی خۆیان لەبیر نەکردووە، هەرچەندە لە سەردەمی زۆر دووریشەوە بووبێ. جێی سەرسامی نییە کە چاوت بە میسرییەك بکەوێ لەوپەڕی سعێد، یان لە بیابانەوە یاخود لە قووڵایی دەلتادا شاگەشکەت بکا بەوەی کە بابو باپیرانی لە دەرەوەی میسرەوە هاتوونە.

لەنێو هەموو ئەو نەتەوانەی روویان کردۆتە میسرو تێیدا جێگیر بوونەو لەناو کۆمەڵگاکەیدا تواونەتەوەو رەچەڵەکی خۆشیان ون نەکردووە، ئەو کوردە میسرییانەن کە هێشتا رەچەڵەکی دوور یا نزیکی خۆیان وەبیر دێ، کە باوانیان لە سەردەمی جیاجیادا هاتوونەتە میسرو نەوەو نەوەزاکانیان لەبیریان نەکردوون، سەرەڕای ئەوەی کە هەموو پەیوەندییەکی خزمایەتییان لەگەڵ باپیرانیان لە کوردستاندا پچڕاوە.

جێی داخیشە هەر کاتێك مێژوونووس‌و لێکۆڵەرەکانی هاوچەرخ، کاتێ بنەچەکەی ناودارانی ئەو کوردانە دەنووسن، کە لە میسردا ژیاون‌و بە دڵسۆزیشەوە خزمەتیان پێ کردووە، یان ئەوەتا بە تورك ناویان ئەبەن، یان ئەلبان، یان هەر رەگەزێکی تر. ئەو مافە بە کورد نادەن باسی بنەچەکەی

خۆی بکات. رەنگە ئەوە بەهۆی نەزانینیانەوە بێ، یان زۆر ورد نەبن لە نووسینەوەی مێژوو، یان لەبەر ئەوەیە کە ئەو کوردە ئەوەندە خزمەتی بە ئیسلامو شارستانیەتی عەرەبیو زمانەکەی کردووە، تا ئاستێك کە نووسەر لەبیری دەچێ بنەچەکە غەیرە عەرەبییەکەی بنووسێ، نموونەش لەسەر ئەمە زۆرنو لەو کتێبەدا روونیان دەکەینەوە.

بەوەی باشە کە زۆرێك لە توێژەرەکانی سەدەکانی کۆنو ناوەڕاست ناوی بنەچەکەی رەسەنی کوردیان هێناوە، ئەویش بۆ زانیاریو سوود وەرگرتن، ئێمەش پشتمان بە نووسینەکانیان بەستووە.

دەمانەوێ ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین زۆرێك لە کوردان لە دەرەوەی کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە. ئیدی بە زمانی خەڵکی ئەو وڵاتانە نووسیویانە کە تێیدا نیشتەجێ بوونە. بۆیە ژمارەیەکی کەمی خەڵك زانیاری تەواویان لەسەر گەلی کورد هەیە، سەبارەت بەو خزمەتە زۆرانەی کە لە سەردەمە جیاجیاکانی مێژووی ئیسلامدا خزمەتی زۆر گەورەیان کردووەو قوربانی زۆریان لە پێناو بەرگری لە شارستانییەتی ئیسلامیو رۆشنبیری عەرەبیدا داوە.

کوردستان بە قەڵای پێشەوە بۆ وڵاتانی ئیسلامی ناوزەد کراوە، چونکە قەڵایەکی قایم بووە بۆ خەلافەت بە رووی هێرشی ئەو رۆمیانەی هاوسێی وڵاتانی ئیسلامی بوون. بە ناوبانگترین قەڵاش قەڵای حەسن کیفە (حصن کیفا)[11].

مێژوونووسان کوردیان بە شوانو جوتیارو شەڕکەر وێنا کردووە، بەڵام وەك پێویست تیشکیان نەخستۆتە سەر ئەوەی، کە ئەوان پیشەوەرو بازرگانو زاناو سەرکردەو سەربازیش بوونە لەناو سوپای رێکخراودا.

گەلی کورد تا ئەو سەردەمانەش کۆڵەگەیەکی پتەو بوو بۆ دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامی و شارستانیەتەکەی. بۆ نموونە: دەوڵەتی مەڕوانی، کە ئەحمەدی کوڕی مەڕوان دامەزرێنەری بوو. دەوڵەتی ئەیوبی، کە

دامەزرێنەرەکەی سەلاحەددینی ئەییوبی بوو. هەروەها دەوڵەتی میسری هاوچەرخ، کە دامەزرێنەرەکەی محەد عەلی پاشا بوو.

شایانی باسە کاتێك کورد هاتنە میسر، رواڵەتە تایبەتییەکانی شارستانیەتی خۆشیێن لەگەڵ خۆیاندا هێنا کە پێی دەناسرانەوەو تێکەڵیان کرد بە رواڵەتە شارستانیەتە نوێیەکەیان، کە ئەوکات میسر تیایدا دەژیا. بەم دووانە شارستانییەتە کارلێکیان لەگەڵ یەکدا کردو وایان کرد کوردیش رەگەزێکی چالاكو بەشدار بێت لە رابوونی میسر، لە سەدە یەك لەدوا یەکەکاندا.

ئەم کتێبە تیشك دەخاتە سەر ئەو بەخششانەی گەلی کورد، کە پێشکەشی کردووە بە شارستانیەتی ئیسلامیو عەرەبی بە گشتیو میسری بە تایبەتی. مافی ئەوە میسرییەکانیانە بە تایبەتیو گەلی میسری بە گشتی، کە شانازی بەو باپیرانەیان بکەن. هەروەها مافی گەلی کوردیشە، کە مێژوو، بە سیاسەتو پیشەسازیو کۆمەڵایەتیو شارستانیو راگەیاندنەوە - تا ئێستاش- ستەمی لێ کردووە، لە پێناو پارێزگاری لە ناسنامەو کەسێتییەکەی، شانازییان پێوە بکات.

ئەم کتێبە جەخت لە بوونی کورد لە میسر دەکاتەوە بە درێژایی سەدەکان. سەرەتا بە ئاشنا بوون بە گەلی کورد، وە لە کوێوە هاتوون، هەروەها پەیوەندی نێوان میسری فیرعەونیو ئیمپراتۆریەتی میتانی کوردی لە (میزۆپۆتامیای ئێستا) واتە کوردستان، کە سەرەتا بە شەڕ دەستی پێکردووە، دواتر ئاشتەواییو ئینجا هاوسەرگیری سیاسی. هەروەها باس لە رۆڵی گەلی کورد دەکات لە فتوحاتی ئیسلامی، کە بەهەموو هێزی خۆیانەوە بەشدارییان تێدا کرد، لەوساتەوەی لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتابەوە (ر) سایەی ئیسلام بەسەر مەملەکەتەکەیاندا داکەوت. هەروەها باس لە گرنگترینو ناودارترین ئەو سەرکردە کوردانە دەکات، کە لە سەدەی ئیسلامییەوە هاتوونەتە میسر، تا ئەگاتە دەوڵەتی ئەییوبی، کە دامەزرێنەرەکەی

سەلاحەددینی ئەییوبییەو کەس نکۆڵی لە کورد بوونەکەی ناکات. هەروەها باس لەو شوێنەوارە بیناسازییانەش دەکەین، کە کوردە ئەییوبییەکان لە میسردا بنیاتیان ناوە.

هەرچی سەبارەت بە سەدەی نوێو هاوچەرخە، ئەوا باس لە سەردەمی عوسمانی دەکەین بەر لە هاتنی محەمەد عەلی بۆ میسر، کە لە (١٥١٧ز) دەستی پێکرد. پاشان باسی سەردەمی محەمەد عەلی گەورەو دامەزرێنەری میسری هاوچەرخو نوێ دەکەین، وە بە دیکۆمێنت بۆمان دەرکەوتووە محەمەد عەلی بە بنەچەکە کورد بووە لە کوردانی دیاربەکر، ئەو لە (قۆلە) لە دایك بووە، (ئێستا کەوتۆتە مەقدۆنیا) ئەویش بەپێی تیۆری بڵاوبوونەوەی کورد لە شارە ئیسلامییە گەورەکان، کە ئەوکات وەك ئێستا سنووری سیاسییان لەنێواندا نەبووە.

رەنگە بەشی ئەوە سەبارەت بە محەمەد عەلی پاشاو دەسکەوتەکانی نووسرابێ، بەلام ئێمە لەسەر بوونی کورد لە سەردەمی ئەوو کوڕو نەوەکانی پوختی ئەکەینەوە، هەروەها چۆن ئەو بۆ سەقامگیری حوکمەکەیو بۆ دروستکردنی دەوڵەتە نوێیەکە پشتی پێبەستوونە، لەگەڵ شەڕە دەرەکییەکانی. هەروەك چۆن باس لە گرنگترین سەرکردەو زاناو نووسەرانی کورد دەکەین لەو سەردەمدا.

دواتر دەچینە سەر کۆچی نوێی کوردان، لە سەروەختی سەربەخۆیی میسر لە سەردەمی محەمەد عەلیو هۆکارە سیاسیو رۆشنبیریو پەروەردەییەکان، کە لە حوجرەی کوردان لە ئەزهەری شەریف بەرجەستە بووە. هەروەها چۆنیەتی تێکەڵبوونیان لە پێکهاتەی ئەمڕۆی میسری، کە زۆرێك لەوان بەهۆی کارە گەورەکانیانەوە ناوبانگیان دەرکردووە. هەوڵ دەدەین لیستێك بە ناوی بەناوبانگترینیانو پوختەی کارەکانیان بنووسین.

جێی ئاماژە بۆ کردنە لە میسردا رەوەندی کوردی بوونی نییە، هەموو ئەو

میسرییانەی بنەچەکەیان دەگەڕێتەوە سەر کورد ئەوانەن، کە لە پشتی دەیان هاوسەرگیرییەوە لە نێوان کوردو غەیرە کوردەکانی دانیشتووی میسر کەوتوونەتەوە، ئیدی خوێنیان بۆتە میسری، بەڵام ئێمە ویستمان ئەو خۆشەویستییە بۆ رەچەڵەکەکەیان دەربخەین، هەرچەندە سەردەمەکەشیان وەدوور کەوتبێ.

لە دوا بەشی ئەم کتێبەدا رووماڵێکی ئەو گەشتە مەیدانیانەمان دەکەین، کە پێی هەڵساوین بۆ لای هەندێك لە نەوەکانی کورد لە قاهیرەو ناوچەکانی سعێدو دەلتا، روونیشی دەکەینەوە کە ئەوان چۆن تا سەر ئێستا میسرین، بەبێ ئەوەی باپیرانی خۆیان لەبیر کردبێ، کە بەر لە سەدان ساڵەوە هاتوونەتە میسر.

## کوردەکان کێن و لە کوێوە هاتوون؟

گەلی کورد بە یەکێك لە سێ گەلە رەسەنەکانی ناوچەکە دەژمێردرێ، کە گەلی عەرەب و گەلی فارس و گەلی کوردن. مەبەست لە رەسەن لێرەدا ئەوەیە، کە بەپێی مێژووی زانراودا بوونی ئەو گەلانە لەو ناوچانە بۆ سەرەتای مێژوو دەگەڕێتەوە، کە هەمیشە لەسەر ئەو خاکەدا ژیاون و ئێستاش لەسەری دەژین. بۆ نموونە گەلی تورك نەگەیشتبووە ئەوەی ئێستا پێی دەگوترێ تورکیا، تا سەرەتاکانی سەدەی یازدەهەم کە لە مەغۆلیاوە لە ناوەڕاستی ئاسیاوە هاتن، بە پێچەوانەی ئەو گەلانەی کە باسمان کردن.

گەلی کورد گەلێکی ئارییە لە کۆمەڵەی گەلانی هیندۆ- ئەورووپی، لە خێزانی ئێرانی، کە گەلی کوردو فارس و ئەفغانی و ...تد لەخۆ دەگرێت.

کورد زمانی تایبەت بە خۆی هەیە، بە هەردوو زاراوەی سۆرانی و کرمانجی **(جگە لەم دوو زاراوەیە کورد چەندین زاراوە دیکەیشی هەن و پێیان دەئاخڤێ، وەك زاراوەی زازایی، لوڕی، هەورامی، گۆران، ....و)**، تێکڕای گەلی کورد

ئایینەکەیان ئیسلامە لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی. کەمایەتییەکی شیعەیشی هەیەو لە دکوردستانی عێراق پێیان دەگوترێ "کوردی فەیلی"، لە کوردستانی تورکیاش بە "عەلەوی‌و ئەهلی حەق" ناسراون. هەروەها لە مەسیحی‌و ئێزدیشی تێدا هەیە (هەروەها کاکەیی‌و شەبەک‌و سابیئەشی هەیە..-و)، کەمایەتییەکی زۆر کەمیش یەهودی تێدایە، کە زۆربەیان بەرەو ئیسرائیل کۆچیان کرد.

هەرچی سەبارەت بە ژمارەی کوردانە، هێشتا توێژەران رووبەرووی ئاستەنگ




دەبنەوە لە دیارکردنی سەرژمێرییەکی وردو دروست، ئەوەش ئەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتی ئەو وڵاتانەی خاکی کوردستانیان بەسەردا دابەش کراوە، ئەمە وا دەکات نەتواندرێ بە وردی سەرژمێری بۆ بکرێ. مەزەندەی هەرە نزیک لە راستیش ئەوەیە کە ژمارەی کوردان ئەمڕۆ لە دونیادا گەیشتۆتە چل ملیۆن، دابەش بوونە بەسەر خاکی کوردستانی دابەش کراو لە نێوان تورکیا (نزیکەی ٢٠ ملیۆن)، ئێران (نزیکەی ١٠ ملیۆن)، عێراق (نزیکەی ٦ ملیۆن)، سوریە (نزیکەی ٢ ملیۆن) و رەوەندێکیش هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە

**پەنایان بردۆتە بەر وڵاتانی ئەوروپاو ئەمریکا (نزیکەی ٣ ملیۆن) دەبن "هەموو ئەو خەمڵاندنانەی بۆ ژمارەی کوردان لە پارچەکانی کوردستانو سەرتاسەری جیهاندا دەکرێن راست نین، یان لانی کەم هی سەردەمی پێشووترنو ئێستا ژمارەکە زۆر زیاترە، بەڵام بەهۆی نەبوونی سەرژمێرییەکی باوەڕپێکراوی نێودەوڵەتی بۆ کورد، ئەوا دانانی هەر ژمارەیەك لەلایەن هەر کەسو لایەکەوە بێت تەنها گریمانەیە نەك هەقیقەت، ئەمە سەبارەت بە رووبەرەکەیشی هەر راستە..—و".**

کوردستان دەکەوێتە بەشی رۆژئاوای کیشوەری ئاسیا، رووبەرەکەی نزیکەی (نیو ملیۆن کیلۆمەتر دووجا) دەبێ، واتە زیاتر لە کۆی رووبەری بەریتانیاو هۆڵەنداو بەلجیکاو سویسراو دانیمارك بەیەکەوە، وە بەقەد نیوەی رووبەری میسر ـەبێت. هەر لە کۆنیشەوە تا ئێستاشی لەگەڵ دابێ، کوردستان بۆتە جێی گرنگی پێدانی ئەو توێژەر و زانایانەی، کە بە لانکەی مرۆڤایەتییان داناوە.

گەلی کورد خاوەن مێژوویێکی گەورەیە، دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی میدییە، کە دەکەوتە باکووری رۆژئاوای ئێرانو لە ساڵی (٦١٢ پ.ز تا ٥٥٠ پ.ز) بەردەوام بووە، پایتەختەکەشی "ئاکباتانا" بووەو درێژ ببووەوە تا ناوەڕاستی ئاسیای بچووك "تورکیای ئێستا" لە خۆرئاوا، بۆ کەنداوی عەرەبی لە باشوور، بۆ چین لە رۆژهەڵاتو لە باکووریشە تا دەریای ئۆراڵ.

میدییەکان هاوپەیمانییان لەگەڵ کلدانییەکان کردووەو ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییان لەناو بردووەو "نەینەوا"ی پایتەختیان لە ساڵی (٦١٢ پ.ز) دابەش کردووە. ئیمپراتۆریەتی میدی تا ساڵی (٥٥٠ پ.ز) بەردەوام بووە، دوای ئەوە ئیمپراتۆریەتی میتانییان دامەزراندووە، شارستانییەتێکیان لە هەزارەی دووەمی پێش زایین لەسەر خاکی کوردستان دروست کردووە. پەیوەندییەکی پتەویش لە نێوان زمانی میتانیو زمانی کوردی ئێستادا هەیە،

هەروەها پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان ئیمپراتۆریەتی میتانیو فیرعەونەکانی میسر هەبووە، سەرەتا بە شەڕ دەستی پێکردووە، دوایی بە ژنو ژنخوازیو هاوسەرگیری کۆتایی پێهاتووە، هەروەك لەم کتێبەدا روونی دەکەینەوە.

دوای ئیسلام بوونی کورد، رۆڵێکی بەرچاویان گێڕاوە لە فتوحاتەکانو لە دروست بوونی دەوڵەتە ئیسلامییەکانیش، کە دواتر لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دروست بوون، هەروەك چۆن چەندین ئیمارەتی کوردی ئیسلامی سەربەخۆ و نیمچە سەربەخۆی دروست کرد، وەك:

- رودی، لە تەبرێزی ئێستا (لە ٢٣٠- تا ٦١٨ ك).
- الاری، لە ئازەربایجان (لە ٣٠٠- تا ٤٢٠ ك).
- دۆستەکیو مەڕوانی، لە دیاربەکر لە کوردستانی تورکیا (لە ٣٥٠- تا ٤٧٦ ك).
- دەوڵەتی ئەییوبی، لە میسرو شامو یەمەن (لە ٥٦٧- تا ٦٨٥ك).
- ئەردەلانی، لە ئێران (لە ٦١٧- تا ٦٨٤ ك).
- پاشانشینی کوردی، لە خراسان (لە ٦٤٣- تا ٧٨٥ ك).

**بارودۆخی ئێستای کورد:**

لە عێراقدا، لە دوای رووخانی سەددام حوسێن کوردەکان هەرێمی کوردستانیان پێکهێناوە، ئەوەش دوای تێکۆشانێکی دوورو درێژ، کە هەر لە سەرەتای دروست بوونی دەوڵەتی نوێی عێراقەوە لەساڵی (١٩٢٦ن)[١٢] بەو سنوورەیەوە دەستی پێکردووە تا دەگاتە ئەمڕۆ، کە دەوڵەتی فیدراڵییە. هەرچی سەبارەت بە کوردەکانی ئێرانو تورکیاو سوریەیە، تا ئێستا تێکۆشانی کوردان هەر بەردەوامە بۆ سەلماندنی ناسنامەی کوردبوونیان، بۆ بەدیهاتنی حوکمی خۆبەڕێوەبەری فیدراڵی لەو سنوورە سیاسییەی تێیدا دەژین. بەئەنجام نەگەیشتنی مافە سیاسیو نەتەوەییەکانی گەلی کورد بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێنەوە لەوانە: هەڵکەوتەی شوێنی ستراتیژی کوردستانو جیۆسیاسییەکەی. بەو پێیەش کە ناوچەکە سامانێکی زۆری نەوتو



گازو رووبارو کانیو کانزاکانی تێدایە، بۆیە هەمیشە بۆتە جێی چاوتێبڕینی داگیرکارانو دەستیان بەسەر سامانەکەیاندا گرتووەو خەڵکی خاوەن زەویو خاکیشیان لە هەژاریو دواکەوتوویی هێشتۆتەوە. ئەمەش بۆتە هۆی دابڕانی گەلی کورد لە براکانی خۆی لە وڵاتانی دیکە. بەمەش گوتاری سەرۆکە کوردەکان بەبێ یەکێتییەکی نێوانیان، وەدەستهێنانی مافە نەتەوەیی و نیشتمانییەکانیان وە دژوار خستووە.

بەڵام بارودۆخی ئەمڕۆ جیایە لەگەڵ پێشان، ئێستا تێکۆشانی کوردان بۆ بەدیهێنانی مافە نیشتمانییەکان بەردەوامی هەیە، هەرچەندە کە بە سستییش بێ.

---

۱۱- حەسن کیف ئێستا دەکەوێتە پارێزگای باتمان لە کوردستانی تورکیا. ئەو ناوچەیە لەژێر هەڕەشەی نقوومبوونە لەژێر ئاو، بەهۆی دروست کردنی بەنداوەکانەوە لەلایەن حکومەتی تورکیا، وەك بەنداوی iiisu.

۱۲- مێژووی دروست بوونی دەوڵەتی ئێستای عێراق بۆ ساڵی (۱۹۲۱ز) دەگەڕێتەوە. بەڵام تورکیا داوای ویلایەتی موسڵی (کوردستانی باشوور) دەکردەوە، کە بە کێشەی موسڵ ناسراوە، تا ئەوکاتەی کە تورکیا لە ساڵی (۱۹۲٦ز) بۆ عێراق دەستبەرداری بوو؛ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (مشکلة الموصل) لە نووسینی (فاضل حسین).

## پەیوەندی فیرعەونی - میتانی:

کۆنترین پەیوەندیی مێژوویی لە نێوان کوردو میسرییەکان تۆمار کرابێت دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شازدەی پێش زایین، لە ژێر ڕۆشنایی ڕووداوەکانی نێوان فیرعەونی و مەملەکەتی میتانی، کە باپیرانی گەلی کورد لە دەوروبەری ساڵی (١٥٠٠ پ.ز) دایانمەزراندووە و پایتەختەکەی "واشوکانی"، بووە لەسەر ڕووباری خابوور لە هەرێمی کوردستانی عێراقی ئێستا. دەسەڵاتی ئەو میرنشینە تا هەموو خاکی کوردستان درێژ بۆتەوە. میسرییەکانیش بە "نهارین" ناویان بردوون. ئەو میرنشینەی میتانی لەسەر دەستی مەلیکی ئاشووری (ئاشوور ناسرپال) لە ساڵی (١٣٣٥ پ.ز) کۆتایی پێهاتووە، چونکە ئەو بە بەهێزترین هاوپەیمانی میسرییە فیرعەونیەکانی دادەنا.



( مەلیکی ئاشووری - ئاشوور ناسرپال)

لە سەرەتادا (مەملەکەتی میتان)ی کوردی لەسەر دەستی تەحتەمسی یەکەم تووشی هێرش و پەلاماری داگیرکاری میسری هات، بەڵام میتانییەکان بەهۆی بەستنی هاوپەیمانێتی لەگەڵ حیسسییەکان لە کۆتایی سەدەی سێزدەی پێش زایین، توانییان لە شوێنکەوتوویی میسریەکان دەرباز بێن‌و خۆیان ببنە خودان بڕیاری سەربەخۆی خۆیان.

بەڵام لە سەردەمی مەلیکی میتانی (توشرتا) لە دەوروبەری (١٣٩٠ پ.ز)، پەیوەندی فیرعەونی‌و کوردەکان چەسپاو جێگیر بوو. دیکۆمێنتە میسریەکان مەلیك توشرتایان بە "دۆستێکی لاگری میسر" ناوبردووە. لە نێوان ئەو مەلیکە و مەلیکەکانی میسر پەیوەندی ژنخوازی و ڕەچەڵەکی هەبووە. نامەی درێژیشی هەن لەگەڵ ئەمنحۆتبی سێیەم، کە لە ساڵی (١٣٧٥ پ.ز) دا مردووە و لەگەڵ



ئەمنحۆتبی چوارەم، کە لە (١٣٥٨پ.ز) دا مردووە.
هەندێك لەو نامە ئاڵوگۆڕکراوانە لە (تل العمارنة) لە پارێزگای (المنیا) دۆزراونەتەوە، کە بە زمانی میتانی نووسراونو نزیکەی شەشسەد دێڕ دەبن.
سەرچاوە مێژووییەکانی مێژوونووسانی کورد[١٣] دووپاتی دەکەنەوە، کە یەکێك لە خوشکەکانی پاشای میتانی، یەکێك بووە لە خێزانەکانی ئەمنحۆتبی سێیەم، بەپێی هەمان سەرچاوە یەکێك لە کچەکانیشی بە ناوی (نەفرتیتی) خێزانی ئەمنحۆتبی چوارەم (ئەخناتون) بووە.

لە یەکێك لەو نامانەی ئەو پاشا میتانییە، کە بۆ خوشکی خۆی (نەفرتیتی) خێزانی فیرعەونی میسر ئەمنحۆتبی چوارەم ئەخناتونی ناردووە، بەم رستە سۆزدارییانە رووی تێ دەکات و دەنووسێ: **(لەسەرەوە لە سەرچاوەی یەکەم نووسراوە نەفەرتیتی کچی پاشای میتانی بووە، بەلام لەو نامە دۆزراوەی پاشای میتانی کە ناردوویەتی بۆ خوشکەکەی (نەفەرتیتی) دەردەکەوێ کە خوشکی بووە؟!– و)** :

" بۆ پاشای گەورە، پاشای میسر، برا و زاواکەم کە خۆشیدەوێم و خۆشمدەوێ، هیوادارم کە لە دۆخێکی باش دابیت، هەروەها ماڵ و خوشکەکەم و تەواوی خێزانەکانت، منداڵەکانت، سوارییەکانت، ئەسپەکان و سوپاکەت، وڵاتەکەت و سەرجەم مەملەکەتەکەت لە خۆشی دابن و ئاشتی زیاترت بەسەردا بباری"[١٤].

کەوابوو، بەپێی سەرچاوە کوردییەکان، مەلیکە نەفرتیتی میتانییە، واتە کوردی رەسەنە، بەلام سەرچاوە میسرییەکان وایدەبینن کە هێشتا ئەو بابەتە جێی مشتومڕو گفتوگۆیە، مامۆستا (د. محمد جمال الدين مختار) کە لە پێشدا

سەرۆکی دەستەی شوێنەواری میسریی بوو، دەڵێت " تا ئێستا مەسەلەی نەفرتیتی جێی گفتوگۆو مشتومڕی توێژەرە تایبەتمەندەکانە، چونکە لە هیچ نووسراوێکدا ناوی باوکی نەهاتووە، هەندێکیش پێیانوایە ئەو سەر بە خێزانێکی بیانی بووبێ، لەو خێزانانەی لە سەردەمی ئەمنحۆتبی سێیەم کە دیوەخانی پاشایان پڕ کردبوو، دواتر ناوێکی میسریی بۆ خۆی داناوە، وەك ئەوەی کە ئەوکات نەریت بووە". ناوبراو زیاتری دەخاتە سەر و دەنووسێ "خودان ئەو بیروڕایانە لەنێو خۆیاندا جیاوازن، هەیە بنەچەکەی بە میتانی دادەنێ و هەشە بە جۆرێکی دیکەی دەبینێ"[15].

بنەچەکەی ڕەسەنی نەفرتیتی هەرچییەك بێت، ڕایەك هەیە کە ئەو ئەدەنە پاڵ بیانییە نامیسرییەکان، با ئەوە بۆ مێژوو جێبێڵین تا یەکلایی بکاتەوە، بەڵام گومانی تێدا نییە ئەو یەکێکە لە گەورەترین مەلیکەی میسر، خێزانی ئەخناتونی گەورە بووەو پاڵپشتیشی بووە لە کاروانی یەکگرتندا.

ئەوەی لای ئێمە گرنگە، پەیوەندی نێوان میسری فیرعەونی و گەلی کوردە. ئەوەی کە شکی تێدا نییە ئەوەیە کە دیوەخانی فیرعەون، -وەك ئەوەی کە مێژوونووسە میسری و کوردەکان دووپاتی دەکەنەوە- جمەی هاتووە لە خاتوونە کوردەکان، کە خاتوونی کۆشکی فیرعەونی بوونە لە چەرخی هەژدەمین خێزان لە دەوڵەتی نوێی میسر.[16] هەروەك چۆن دیوەخانی میسری، تیپی مۆسیقاو خزمەتگوزاری بەکاردەهێنان بۆ پتەوکردنی پەیوەندی نێوان هەردوو وڵاتەکە.[17].


( نامەکانی تل العمارنە )

نامەکانی (تل العمارنة) ئەوە روون ئەکەنەوە، کە دەسەڵاتی میسریی بۆ ناوچەکانی ژێر قەڵەمڕەوی میتانییەکان درێژ دەبووەوە، هێزەکانی "خیتا" لە سەردەمی مەلیکەکەیان "شوبیولیوما" هەڵسان بە

هێرش کردنە سەر ئەو ناوچانە و لە چەرخی ئەمنحۆتبی سێیەم دەستیان بەسەردا گرت، بەڵام کاتێك ئەمنحۆتبی چوارەم "ئەخناتون" دەسەڵاتی گرتە دەست، شوبیولیوما، بەبۆنەی دانیشتنی ئەخناتون لە دوای باوکی لەسەر عەرشی میسر، نامەیەکی دۆستانەی دبلۆماسی بۆ نارد و پیرۆزبایی خۆی پێراگەیاند[18].

نامەکانی (تل العمارنة) ئەوەیان بەدەرخستووە، کە هەریەکە لەفەرمانڕەوا ناوخۆییەکانی وەك سوریە و وڵاتی شام لە ناوچەی دەسەڵاتداری میسری، داوای پارێزگاری و کۆمەکیان لە میسر کردووە، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی چاوچنۆکی حیسسییەکان و پەلوپۆ هاوێشتنیان، کە ئەوکات دەوڵەتی حیسسییەکان وەك دەوڵەتێکی تازەی گەشەسەندوو دەرکەوتبوو[19].

بەڵگەنامەکانی (تل العمارنة) بە گرنگترین سەرچاوە دادەنرێن، کە زانیاری گرنگ دەربارەی میتانییەکان لە ماوەی ناوەڕاستی سەدەی (پازدەمی پ.ن) لەخۆ دەگرێت. لەو بەڵگەنامانەدا هەوەڵ دەسپێشخەرییەکانی پەیوەندی دبلۆماسی نێوان ئەوانو فیرعەون تەحتەمسی سێیەم ڕوون دەبێتەوە، کە بە زەبر و زۆری گەیشتبوە ئاسیا. سەرکردایەتی هێرشێکیشی کرد بۆ سەر مەملەکەتی قادش لە ساڵی (١٤٧ پ.ن)، هەروەك چۆن ڕواڵەتی پەیوەندیی میسری- کوردی لەو نامە ئالوگۆڕکراوانەی نێوان مەلیکەکانی میتانی و فیرعەونە میسریەکانی هەژدەمین خێزان بەدەر دەکەوێ، بە تایبەتی دوای هاوسەرگیری، لانی کەم بۆ سێ پشت لە نەوەکانیان، تا لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتی میتانی لەسەر دەستی مەلیك (شوبیولیوما)ی حیسسی. ئەو نزیکبوونەوەو خزمایەتییە لە بەڵگەنامەکانی (تل العمارنة) دووپات کراوەتەوە، کە یەکەم هەڵکۆڵینی لە ساڵی (١٨٨٧ ن) بۆ ئەنجام درا و یارمەتی مێژوونووسانی دا بۆ ڕاستکردنەوەی زۆر لایەنی گرنگ لە ڕووداوەکانی پەیوەست بە مێژووی جیهانی کۆن.

مەسەلەکە هەر لەوەدا کورت نەبۆتەوە کە لە بەڵگەنامەکانی (تل العمارنة) دا هاتووە، بەڵکو لە چەندین نووسینی بزماری کە لەسەر قوڕ هەڵکۆڵدراون و لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زایین ئالوگۆڕ کراون، ئاماژەیان بۆ کراوە. وشەکان گوزارشتیان لە پەیوەندی توند و تۆڵ کردووە، کە لە نێوان میتانی و فیرعەونەکانی خێزانی هەژدەمین لە دەوڵەتی نوێدا لە ئارا دابووە، بە تایبەتی لە نێوان مەلیك شوتتارنای کوڕی ئارتاتامای هاوچەرخی تەحتەمسی چوارەم و ئەمنحۆتبی سێیەمی کوڕی، کە لە دایکە میتانییەکە (جیلو حیپا)ی ناسراو بە (مۆت ئۆوم ئۆیا) لە دایك بووە. بە گوتەی فیلیپ فاند نیبرج[20]، لەگەڵ هاتنی ئەو بۆ ئەو وڵاتە، هەندێك دابونەریتی ئایینی لەگەڵ خۆی هێناوەتە میسر. گرنگترین ئارەزووی مەلیکی حیسسی (شوبیولیوما) لە نێوان سالانی ( ١٣٤٠پ.ز–١٣٨٠پ.ز) بریتی بووە لە لەناوبردنی میرنشینی میتانی، چونکە ئەوەیانی بە بەهێزترین هاوپەیمانی میسر دەزانی لە ئاسیادا، هەروەها بە بەرپرسیاری دەزانی لەو بارودۆخە ئالەبارەی بەسەر وڵاتەکەیدا هاتبوو، بۆیە هاتە ناو (واشوکانی) پایتەخت و شوێنەوار و بیناسازییەکانی خاپوور کرد. لێرەوە نهێنی رووخانی خێرای مەملەکەتی میتانیمان بۆ روون دەبێتەوە.

## دۆزینەوەی پەیکەری فیرعەونی میسری "توت عنخ ئامون" لە دهۆك، لە کوردستانی عێراق:


(توت عنخ ئامون )

وەك بەرجەستەبوونێك لە پەیوەندی نێوان فیرعەون– کورد، ئاژانسی دەنگوباسی کوردستان "ئاکانیوز" لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٩ ز لە زاری (حسن احمد)ی بەڕێوەبەری دەستەی شوێنەواری شاری دهۆك لە کوردستانی عێراق گواستییەوە، کە گوتی: "

پەیکەرێکی بچووکی فیرعەونی میسری "توت عنخ ئامون" کە یەکێکە لە فیرعەونەکانی خێزانی هەژدەهەم، لەنێوان ساڵەکانی (١٣٢٤- ١٢٣٣پ.ز) دەستی پێکردووە، لە نزیك قەڵای فیرعەون لە گەلی دهۆك دۆزراوەتەوە".
ئاماژەشی بۆ ئەوە کردووە " زانیارییە مێژوویی یەکان دەریدەخەن کە پەیوەندی سیاسیو خێزانی لە نێوان دەوڵەتی میتانیو فیرعەونەکانی میسر دا هەبووە، لە ڕێی ئەو پەیوەندییانەشەوە نەریتە ئایینییەکانی کوردستان گواستراونەتەوە بۆ میسر، تا بۆتە هۆی ئەوەی کە فیرعەون ئەخناتونی هاوسەری مەلیکە نەفرتیتی هان بدات بۆ پاداشت کردنی پاشای میتانییەکان لەپێناو بڵاوکردنەوەی ئەو نەریتانە. هەروەها دەڵێت:"دۆزینەوەی ئەو پەیکەرە ئەوەمان بۆ روون ئەکاتەوە کە ناوی قەڵای فیرعەون لە دهۆك لەخۆڕا نەهاتووە، بەڵکو حەقیقەتێکی مێژوویی هەبووەو ئاماژەیەکە بۆ سەردەمێکی درەوشاوە لە مێژووی کورد، ئەمەش وا دەکات کە پەیوەندییەك لە بواری توێژینەوەی شوێنەوار لە نێوان هەرێمی کوردستان و کۆماری میسری عەرەبی دروست ببێ[٢١]. (د. زاهي حواس)، وەزیری پێشووی دەوڵەت بۆ کاروباری شوێنەواری میسری ئەوەی ڕاگەیاندووە، کە دۆزینەوەی پەیکەری توت عنخ ئامون لە کوردستانی عێراق شتێکی سروشتییە، بەو پێیەی کە ئیمپراتۆریەتی میسری بەر لە (٣٠٠٠ ساڵ) فەرمانڕەوا بووە بەسەر تەواوی ناوچەکانی سوریەو فەلەستین و عێراق.
حەوواس ئەوەش روون ئەکاتەوە کە ئەو دۆزینەوەیە کتوپڕ و لەناکاو نەبووە، چونکە سەرکردەی سەربازی (حور محب) چەندین هەڵمەتو هێرشی بردوونەتە سەر خۆرهەڵات، دووریش نییە کە ئەو پەیکەرە لە سەروەختی ئەو هێرشانە گواسترابێتەوە بۆ ئەو ناوچەیە. ئاماژەش بۆ ئەوە ئەکات، کە چەندین شوێنەواری میسری لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتدا دۆزراونەتەوە[٢٢].

- محەمەد عەلی عەونی لە وەرگێڕانی کتێبی (خلاصة تاريخ الكرد والكردستان)ی محەمەدئەمین زەکی، ل ٩٧.

١٤- فيليب حتي: تاريخ سوريا و لبنان وفلسطين، بيروت دار الثقافة ١٩٥١ ل١٦٢-١٦٣. محەمەدەمین زەکی، سەرچاوە پێشوو، ل ٩٧.

١٥- د. محەمەد جەمالەددین موختار لە پێشەکیەکەی بۆ کتێبی (نفرتيتي الجميلة)ی نووسەر جولیل سامسون ل ١٢-١٣.

١٦- د.جمال رشيد: ضهور الكرد في التاريخ،ج٣، ص١٩٢-١٩٣.

١٧- سیدر لەگەڵ ا. محمود الحلوجي، جێگری بەڕێوەبەری مۆزەخانەی مسری، ڕۆژی (٢١ی تەمموزی ٢٠١١ن).

١٨- مختار ئەلسیوفی، لە پێشەکیەکەی بۆ کتێبی (نفرتيتي الجميلة)ی جولیا سامسون، کە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی. ل ل ٢٨-٢٩.

١٩- جوليا سامسون: نفرتيتي الجميلة،.....ل١٦٩.

٢٠- د. جمال رشيد: ظهور الكرد.... ج١، ل ل ٢٥٤-٢٦١.

٢٢-http://www.iraqhurr.org/content/article/1681769.htm.

٢٢- http://www.toutankharton.com/montada/viewtopic.php?d=331.

# کورد لە میسر، بەر لە دەوڵەتی ئەییوبی

یەکەم:

سەردەمی پێش ئیسلام

سەردەمی یۆنانی

سەردەمی رۆمانی

هاتنی مەسیحییەت بۆ میسر

دووەم:

هاتنی کورد بۆ ناو ئیسلام

سێیەم:

بوونی کورد لە میسر، بەر لە دەوڵەتی ئەییوبی

**یەکەم:**

**سەردەمی پێش ئیسلام:** میسر لە مێژووی خۆیدا ماوەیەك بە تاریکیدا ڕەت بووە، کاتێك کە فیرعەونەکانیان لەناو بردوون. دوای ئەوە چەندین دەوڵەت و ئیمپراتۆریەت یەك لەدوای یەك داگیریان کردووە، وەك : فارسەکان، یۆنانییەکان، بەتلیمۆنەکان (**چاخی بەتلیمۆنی چاخی ئەسکەندەری مەکەدۆنییە لە میسر، بەڵام لە دوای مردنی ئەسکەندەر و لەبەر نەبوونی میراتگر، ئیمپراتۆریەتەکەی لەنێوان سەرکردەکانی سوپا دابەش کرا، میسریش وەبەر بەتلیمۆسی یەکەم کەوت. بەتلیمۆنەکان نزیکەی سێ سەد ساڵ حوکمی میسریان کرد، لە بەتلیمۆسی یەکەمەوە تا کلیۆپاترای دوا مەلیکەیان و بەتلیمۆسی پازدەهەمی کوڕی- سایتی ویکیپیدیا-و**)، ڕۆمانییەکان و چەندانی تر. لەو سەردەمانەدا گەلی میسری جۆرەها شێوازی لە ستەم و دڵڕەقی و زۆرداریدا دیت.

**سەردەمی یۆنانی ئەغریقی:** دوای سەرکەوتنی ئەسکەندەری مەکدۆنی لە وەدەرنانی فارسەکان لە میسر لە ساڵی (٣٣٢پ.ز) کە داگیرکارییەکەیان نزیکەی (١٢٠ ساڵی)خایاند، میسر کەوتە ژێر نیری داگیرکاری یۆنانی. بەمشێوەیە میسر لەدەست داگیرکارێکەوە کەوتە دەست داگیرکارێکی تازەوە. هەرچەندە هەندێك توێژەر دەڵێن ئەسکەندەر بۆ وەدەرنانی فارسەکان داوای هاوکاری لە گرووپێکی دەریاوانی میسری و گرووپگەلی دۆزەرەوەی میسری[٢٣] کردووە، بەڵام هیچ ئاماژەیەکمان چنگ نەکەوتووە بۆ بوونی کورد لەناو میسر لەو کاتدا، یان پەیوەندییەك کە لەنێوان میرنشینە کوردەکان و دەسەڵاتداری یۆنانی حوکمڕان بەسەر میسردا هەبووبێ. لە ساڵی (٣٣٠ پ.ز) میسر کەوتە ژێر حوکمی بەتالیما و پازدە پاشای بەتالیما حوکمی میسریان کردووە، حوکمی ئەو دەوڵەتە بەردەوام بووە تا ڕۆژگارێك کە کزی و ڕووخانی تێکەوتووە و ڕۆمانەکان لە ساڵی (٣٠پ.ز) لەناویان بردووە[٢٤].


( ئەسکەندەری مەکدۆنی )

**سەردەمی رۆمانی** : رۆمانەکان لە ساڵی (٣٠پ.ز) میسریان داگیرکرد، بۆیە میسر نەك هەر بوو بە یەکێك لە ویلایەتەکانی دەوڵەتی رۆمانی، بەڵکو بوو بە گرنگترین ویلایەتی، ئەویش بەهۆی گرنگی ئابوورییە مەزنەکەیەوە. بۆیە ئەوکات میسر بە "سەبەتەی خۆراکی دەوڵەتی رۆمانی" ناسرا، ئەویش بەهۆی بەرهەمهێنانی زۆری دانەوێڵەوەوە. ئەسکەندەرییەش کە پایتەختی میسر بوو، بوو بە دووەم گرنگترین و گەورەترین شارەکانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی لە دوای شاری رۆما[٢٥]. رۆمانییەکان لە میسردا دوورەپەرێز و لاتەریك بوون لە گەلی میسری، ئەوان میسریەکانیان بە کۆیلە دەزانی، پێیانوابوو کە کاری میسریەکان خزمەتکردنی ئەو رۆمانیانەیە کە حوکمیان بەسەردا دەکردن، ئەرکیش بوو لەسەریان کە جگە لەو بنەمایە هیچ هەڵسوکەوتی دیکە نەنوێنن. بۆیە جێی سەرسوڕمانی نییە کە ئەو میسریانە کاردانەوەی ئەرێنییان هەبی بەرامبەر بە فتوحاتی ئیسلامی، بە سەرکردایەتی عومرو کوڕی عاس.

**هاتنی مەسیحییەت بۆ میسر:** لەسەردەمی حوکمی رۆمانیەکان لە میسر، بە تایبەتی لە سەردەمی "نیرۆن" لە ساڵی (٥١ ز)، کاتێك قەشە مارکۆسی ئینجیلی (کە قوتابی پەترۆسی نێردراو بووە) بۆ ئەسکەندەرییە، یەکەم کلێسای لە میسر و سەراپای ئەفریقیا دروست کرد، ئەوکات مەسیحییەت لە نیوەی یەکەمی سەدەی یەکەمی زایینی لە نێوان رۆڵەکانی گەلی میسری بڵاوبووەوە. بەڵام میسرییە مەسیحییەکان رووبەڕووی دژواری بوونەوە، بەهۆی بەگژداچوونەوەی دەسەڵاتدارانی رۆمانی بۆ ئەو ئایینە، بە تایبەتی لە سەردەمی حوکمی ئیمپراتۆر دقلدیانۆس، تا ساڵی (٣٢٤ز) کاتێك کە ئیمپراتۆر

قستەنتین هاتە سەر حوکم، ئەو ئایینی مەسیحی کردە ئایینی فەرمی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی و بارودۆخەکە هەر بەم شێوەیە مایەوە تا هاتنی فتوحاتی ئیسلامی بۆ میسر[٢٦].

**دووەم:**

**هاتنی کورد بۆ ناو ئیسلام:** ئایینی فەرمی گەلی کورد بەر لە هاتنی ئیسلام بریتی بوو لە ئایینی "زەردەشتی"[٢٧]، کە لەنێو گەلانی ئاریدا بڵاوبوو، وە بە ئایینی نیشتمانی خۆیان دادەنا[٢٨].

هەندێك لە گەورە مێژوونووسانی وەك (البلازري، الواقدي، ابن الاثير) دەڵێن: کورد خۆبەخشانە و بە خواستی خۆی ئیسلام بووە، ئەوان بە ئاشتی پێشوازییان لە ئیسلام کردووە نەك بە شەڕ. ئایینی ئیسلامی لەسەر دەستی هەردوو هاوەڵ (خالد بن وليد و عياض بن غنم) لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (ر) گەیشتە سەراپای کوردستان.

هاتنی کورد بۆ ناو ئیسلام هێزو گوڕێکی تازەی پێ بەخشی، بەتایبەتی لە کاتی فتوحاتی ئیسلامی. چونکە زانرابوو کە پیاوانی کورد ئازا و بەهێزن، لە بواری جەنگدا خاوەن هەیبەت و شکۆن، ئەو خەسڵەتانە زمانی جیاکەرەوە بوون لە زۆربەی ئەو شەڕانەی سوپای ئیسلام بەرامبەر بە دوژمنەکانی. زۆرێك لەو جەنگاوەرە کوردانە خاك و زێدی خۆیان بەجێهێشت و لە باکوور و باشوور و رۆژهەڵات و رۆژئاوا بەشدارییان لە فتوحاتی ئیسلامی کرد، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە بە شێوەیەکی بەربڵاو بەناو چەندین ویلایەتدا بڵاوبوونەتەوە.

بەهەرحاڵ، کورد لە تێکۆشان نەکەوت و چرووکییان بە بەنرخترین شتیان نەکرد بۆ پشتگیری و کۆمەکی شارستانیەتی ئیسلامی و عەرەبی. تا دواتر رەنگی دایەوە لەو سەردەمەی کە بە سەردەمی زێڕینی کورد ناسراوە لە سەدەکانی ناوەڕاست، کە سەردەمی سوڵتان سەلاحەددینی ئەیوبی، دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەیوبی کوردییە، کە لە باکوورەوە لە باشووری

قەفقاسەوە درێژ دەبووەوە تا سەنعای یەمەن لە باشوور، لە ڕۆژهەڵاتەوە لە قووڵایی دجلە تا تەرابلس لە ڕۆژئاوا[٢٩]. ئەویش دوای سەرکەوتنیان لە وەدەرنانی خاچپەرستان لە زێدی ئیسلام و رزگارکردنی شوێنە پیرۆزەکانی ئیسلام لە دەستی چەپەڵیان.

**سێیەم:**

**بوونی کورد لە میسر، بەر لە دەوڵەتی ئەییوبی:** بوونی کورد لە میسر بەر لە دەوڵەتی ئەییوبی، هەرگیز وەك سەردەمی دەوڵەتی ئەییوبی نەبوو، لەگەڵ هەندێش کورد بە شێوەیەکی تایبەتی ڕۆڵی گرنگی لە مێژووی میسر و لە مێژووی ئیسلامدا هەبووە. لە سەردەمی فاتمیەکان، (عادل بن السلار) کە کوردێکی رەسەن بووە، وەزیری خەلیفە "الظافر بامر الله الفاطمي" بووە،



( پۆرترێتی سوپای سەلاحەددین )

وەزیر عادل بەرگری لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا کردووە دژ بە خاچپەرستان و هەمیشە بەرەو ڕوویان وەستاوەتەوە، خاوەنی کتێبی ( العلاقات السياسية بين الدولة الايوبية والامبراطورية الرومانية المقدسة) دەربارەی عادل دەڵێ: ئەو هەموو شەش مانگ جارێك هەڵمەتێکی سەربازی دەنارده سەر شاری عەسقەلان٣٠، بۆ بەرپەرچدانەوەی خاچپەرستان و بەرگری کردن لە شرێنە پیرۆزەکان، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو هەڵمەتانەی ساڵی (٥٤٧ك/ ١١٥٢ز) دژ بە

**خاچپەرستانە. دوای مردنی (کوڕی سالار) بارودۆخەکە گەڕاوەتەوە سەر دۆخی یەکەمجار. ئیدی بارودۆخەکە بەم شێوەیە ماوەتەوە تا هاتنی سەلاحەددینی ئەیوبی و سەرلەنوێ جیهاد دژ بە خاچپەرستان دەستی پێکردۆتەوە[٣١].**

---

٢٣- عمر الاسكندري: الميجر ا.ج، سفد ج: تاريخ مصر الى الفتح العثماني، چاپی چوارەم، دارلمعارف، قاهیره، (١٩٢٠ن)، ل ٩٨-٩٩.

٢٤- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٥.

٢٥- د. مصطفى العبادي: الامبراطورية الرومانية "النظام الامبراطوري ومصر الرومانية". دارالعرفة الجامعية. قاهره، ل ١٠٩، ١٥٧، ١٥٨.

٢٦- اسكندر صيفي: المنارة التاريخية في مصر الوثنية والمسيحية، المطبعة العصرية، قاهره، ل٦٥.

٢٧- د. بله ج شيركوه: القضية الكردية "ماضي الكرد وحاضرهم"، قاهره (١٩٣٠ن)، ل ٦.

٢٨- تا ئێستاش ئەو ئایینە لەنێو هەندێك لە ئارییەکان هەر ماوە.

٢٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٧.

٣٠- ئێستا دەکەوێتە نێو سنووری خاکی ئوردن.

٣١- د. عادل عبدالحافظ حمزة: العلاقات السياسية بين الدولة الايو والامبراطورية الرومانية المقدسة. المطبعة والناشر، الهيئة المصرية العامة للكتاب ٢٠٠١م، ص ٦٦.

# سێیەم :
# کورد لە میسر لە سەردەمی ئەییوبی

یەکەم : هاتنی یەکەمجاری کورد بۆ میسر

دووەم : هاتنی دووەمجاری کورد بۆ میسر

سێیەم : هـاتنی سێیەمجاری کورد بۆ میسر

چوارەم : سەلاحەددینی ئەییوبی کوردی و حکومەتەکەی لە میسر

پێنجەم : کورد لە سوپای سەلاحەددینی ئەییوبی لە میسر

شەشەم : ناودارانی کورد لە میسر لە سەردەمی ئەییوبی

حەوتەم : شوێنەواری ئەییوبییە کوردەکان لە میسر

## یەکەم: هاتنی یەکەمجاری کورد بۆ میسر لە ساڵی (٥٥٨ك/١١٦٣ز)

ئەو بزووتنەوە خاچپەرستییەی کە لە کۆتاییەکانی سەدەی (پێنجەمی کۆچی/ یازدەی زایینی) هاتبووە وڵاتانی خۆرهەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی، چەندین ئەنجامی گرنگی لێکەوتەوە، گرنگترینیان: گۆڕینو پێشخستنی نەخشەی سیاسی وڵاتی شامو میسر بوو. لە وڵاتی شامدا خاچپەرستان لە دوای هەڵمەتی یەکەمیان، سەرکەوتوو بوون لە دانانی چەند ئیمارەتێکی خاچپەرستی بۆ خۆیان، وەك: رەها، ئانتاکیە، تەرابلس و مەملەکەتی بەیتولمەقدس.

هەرچی میسر بوو بارودۆخەکەی باشتر نەبوو لە وڵاتی شام، چونکە دەوڵەتی فاتمی شیعی لەلایەك بۆ لایەکی تر تێکەڵ پێکەڵی دەکرد، تا کوردەکان بە سەرکردایەتی ئەسەدەددین شێرکۆ هاتن، کە سەلاحەددینی برازاشی لەگەڵ دابوو، توانییان سەربکەون بەسەر دەوڵەتی فاتمیو بنیاتنانی دەوڵەتی ئەییوبی، دواتر لە چوارچێوەی یەکێتی ئیسلامی دەسەڵاتی خۆیان بەسەر وڵاتی شامدا سەپاند[٣٢]. بۆیە دەتوانین بڵێین، ئەو سەدەیە سەدەی خوێن رشتنی ئیسلامی عەرەبی بووە، وە سەدەی پەلکێشیی بووە بۆ خاچپەرستان لە وڵاتی موسڵمانان.

باسی ئێمە لەسەر وڵاتی شام نییە، بەڵکو باسەکە لەسەر میسرە، کە ئەوکات بەهۆی دەوڵەتی فاتمی بەدەست پیریو لاوازی خەلیفەکانیو لێکهەڵوەشانەوەی سەردەمی خەلافەتو لەدەستدانی شکۆکەی دەیناڵاند. بەڵگەش بۆ ئەمە، دەست تێوەردانی وەزیرەکان بوو لە کاروباری دەوڵەت، تەنانەت لە کاروباری خودی خەلیفەشەوە[٣٣]. وەك ئەوەی لە کاتی مردنی خەلیفە (الظافر)ی فاتمی بە کوژراوی روویدا. بۆیە وەزیر (طلائع بن زريك)ی بە رەسەن ئەرمەنی بە تاکڕەوی بەسەر کاروباری میسردا راگەیشت، چونکە خەلیفە (الفائز)ی کوڕی خەلیفە (الظافر) بە تەمەن بچووك بوو[٣٤].

بەمشێوەیە وەزیرەکان کاروباری میسریان گرتبووە دەستو چۆنیان ویستبا

وایان هەڵدەسوڕاند، بارودۆخەکە بەمشێوەیە مایەوە تا کاتێ کە مەلیک (عموري) مەلیکی مەملەکەتی بەیتولموقدسی خاچپەرستان هاتو لە ساڵی ( ٥٥٨ك/ ١١٦٣ز) میسری داگیرکرد، تا گەیشتە بلبیسو ئابلۆقەی دا، بەڵام (ضرغام)ی وەزیری فاتمی توانی پێشی پێبگرێو ناچاری بکات بکشێتەوە.
لەو ساتەوەختەدا وەزیری دووەمی فاتمی "شاور" پەنای بردە بەر یارمەتیو بەهاناوەهاتنی (نورالدین محمود)ی بە رەسەن تورکمانی ئاتابەکو حاکمی موسڵ، تەماعی ئەوەشی وەبەرنا تا دەست بەسەر میسردا بگرێو لە دەستی خاچپەرستانی رزگار بکات. بۆیە نورەددین مەحمود لە (٥٥٩ك/ ١١٦٤ز) پەلەی کرد لە ناردنی سوپا بۆ میسر بە سەرکردایەتی ئەسەدەددین شێرکۆ[٣٥]، کە سەلاحەددینی برازایو ژمارەیەك جەنگاوەری کوردی لەگەڵ دابوو. لەو هەڵمەتەدا سەلاحەددین سەرکردایەتی دەستەی پێشەوەی دەکرد. (ابن شداد) دەڵێت: ئەسەدەددین شێرکۆ نەیدەتوانی هیچ کارو فرمانێك بەباشی ئەنجام بدات، یان دەست بۆ کاروبارێك ببات بەبێ ئەوەی پرسو راوێژ بە سەلاحەددین ئەییوبی بکات، چونکە سەلاحەددین خاوەن عەقڵێکی باشو پلاندانەرێکی پەسەندو جوان بوو[٣٦].
شێرکۆو سەلاحەددین لە ساڵی (٥٥٩ك/١١٦٤ز ) لەگەڵ سوپایەك لە سەربازو سەرکردەی کورد لە هەڵمەتێکدا گەیشتنە قاهیرە، بەتایبەتی سەربازەکانی ئەسەدەددین شێرکۆ، وەك (شهاب الدين محمود الحارمی) خاڵی سەلاحەددین. لەو کاتەدا سوپاو یاریدەدەرانی (ضرغام) لێی جیابوونەوە، کە هاوپەیمانی خاچپەرستەکان بوو. بۆیە کارەکەی بە کوشتن گەیشت. "شاور"یش حکومەتەکەی گرتە دەست، بەڵام شاور پەیمانی خۆی لەگەڵ نورەددین مەحمود نەگایەندە سەرو داوای لە شێرکۆ کرد لە میسر بچێتە دەرێ، بەڵام شێرکۆ پێی گوت ئەو بەڵێنەی کە بە نوورەددین مەحمودی داوە بیگەیەنەتە جێ، بەڵام شاور وەڵامی شێرکۆی دایەوەو گوتی: "ئێوە سەربازنو بە فرمانی

نورەددین مەحمود هاتوون، لەسەرتانە تەنها فرمانەکانی بەجێ بگەیەنن‌و بەس، کاری لێکتێگەیشتن لەگەڵ نورەددین بۆ من بەجێ بێڵن" ، شێرکۆ بەوە بەرپەرچی دایەوە کە دەست بەسەر بلبیس‌و شەرقییەدا دەگرێت.

بۆیە شاور پەلەی کرد لە داواکردنی کۆمەك‌و یارمەتی لە خاچپەرستەکان، (عموري)یش ئەو دەرفەتەی قۆستەوەو زوو خۆی گەیاندە میسرو لە دەلتا خۆی قایم کرد، دواتر هەڵسا بە گەمارۆدانی شێرکۆ لە شەرقییە، دوای ماوەیەك لەو گەمارۆدانە، لەسەر ئەوە رێککەوتن کە هەردووکیان، واتە (عموری‌و شێرکۆ) لە میسر بچنە دەرێ، ئەوەش لە کۆتاییەکانی ساڵی (٥٥٩ك /١١٦٤ز) بوو[٣٧].

بەم شێوەیە ئەوە جاری یەکەم بوو کە سەرباز و سەرکردە کوردەکان بێنە میسر، لە دوای ئەو دووجارەی کە فاتمیەکان خاچپەرستانیان بە دژی برا موسڵمانەکانیان بەکار هێنا، ئەویش بە مەبەستی پارێزگاری کردن لە دەسەڵاتەکەیان، بەڵام لەم جارەیاندا تەنانەت نیمچە سەقامگیرییەکیش بۆ کورد لە میسر دروست نەبوو.

## دووەم: هاتنی دووەمجاری کورد بۆ میسر لە ساڵی (٥٦٢ك/ ١١٦٦ز):

دوای سێ ساڵ لە چوونە دەرەوەی سوپای هەڵمەتبەری شێرکۆو سەلاحەددین لە میسر، خەلیفەی فاتمی (العاضد) لە ساڵی (٥٦٢ك/ ١١٦٦ز) لە بارەی ئەو جەورو ستەمەی شاوری وەزیر، کە لە میسر ئەنجامی دەدا، نامەیەکی بۆ نورەددین مەحمود ناردو سکاڵای لێکرد. داواشی لە نورەددین مەحمود کرد ئەو خۆی نێبهەڵقورتێنێ، نورەددینیش بۆ جاری دووەم سوپایەکی بە سەرکردایەتی شێرکۆو سەلاحەددین نادرە سەر میسر، کە لە (٢٠٠٠) لە باشترین لەو جەنگاوەرانە پێکهاتبوو، کە لە شەڕو کوشتاردا زۆر کارامەو شارەزا بوون. بێگومان ئەو سوپایە دوای سەختی‌و دژوارییەکی زۆری رێگا، گەیشتە (اطفیح)[٣٨]. لەوێشەوە توانییان بگەنە جیزە[٣٩].

بۆیە شاور بۆ جاری دووەم پەنای بردە بەر مەلیك عەموریو بۆ جاری سێیەمیش پەنای بردە بەر وەزیرە فاتمیەکان. مەلیك عەموری هەرزوو داواکەی پەسەند کردو بە پەلە خۆی گەیاندە میسرو لە ئەسکەندەرییەدا سەلاحەددینی گەمارۆدا. سەلاحەددین دژ بە خاچپەرستان بەرگری کرد، میسریەکانیش لە بەرامبەر ئەو بەرگریەدا یارمەتییان دا، تا لە کۆتاییدا شێرکۆو عەموری گەیشتنە رێککەوتنامەیەك، کە بۆ جاری دووەم لە میسر بچنە دەرەوە. بۆیە هەردوولا ئەو رێککەوتننامەیان جێبەجیٚ کردو لە میسر چوونە دەرەوە[٤٠].

## سێیەم: هاتنی سێیەم جاری کورد بۆ میسر لە سالی (٥ك/١١٦٧ز):

مەلیك عەموری رێککەوتننامەکەی لەگەلٚ شێرکۆ نەگەیاندە جیٚو دەستپێشخەری کرد لە هێرش بردنە سەر میسر، ئەویش بە بیانووی ئەوەی کە شاوری وەزیری فاتمی پەیمانی خۆی لەگەلٚ خاچپەرستان نەگەیاندۆتە سەر. بۆیە هێرشی بردە سەر دەلتای نیل. لای خۆشیەوە خەلیفە (العاضد) بۆ جاری دووەم بە پەلە هانای بردەوە بەر نورەددین مەحمود، لە هەمانکاتدا شاوری وەزیر نامەیەکی بۆ نورەددین مەحمود ناردو داوای یارمەتیو بەهاناوە هاتنی لێکرد. نورەددین مەحمود هەوالی نارد بۆ شێرکۆ کە لە دیمەشق بوو، داوای لێکرد کە ئامادە بیٚ بۆ بردنی سوپاکەی بۆ میسر. (٥٠٠) سەربازی تایبەتو هەلبژاردەی کوردی لەگەلدا هاتن، بەلام ئەمجارە سەلاحەددین حەزی نەکرد بچێتە میسر، ئەویش بەهۆی ئەو گەمارۆیەی کە لە ئەسکەندەرییە درابوو لەلایەن مەلبك عەموری، بەلام دواتر لە راکەی خۆی پەشیمان بووەو داواکەی سولتان نورەددین مەحمودی قبولٚ کردو لەگەلٚ سوپاکەی بەرەو میسر بەرێکەوت[٤١].

شێرکۆو سەلاحەددینو ئەو سوپایەی کە لەگەلیان بوو، لە بیابانی رۆژهەلات پەرینەوەو گەیشتنە قاهیرە. خەلکەکە بە هاتنیان زۆر دلخۆش بوونو بە باشترین شێوە پێشوازییان لێکردن. هەرچی مەلیك عەموری بوو بارودۆخەکەی

تێکچوو، چونکە هیچ هاوپەیمانێکی شك نەبرد لەوکاتەدا بەرگری لێ بکات. لە هەمانکاتدا سوڵتان نورەددین مەحمود لە شام فشاری خستە سەر خاچپەرستان، بۆیە عەموری لە سەرەتای ساڵی (٥ك/ ١١٦٩ز) بڕیاریدا بە پەلە بەرەو فەلەستین پاشەکشێ بکات[٤٢].

## سەرەتای دەرکەوتنی کورد لە میسر:

خەلیفەی فاتمی (العاضد) نامەی بۆ شێرکۆ ناردو داوای کرد. کاتێك کە چووە لای، خەلیفەی فاتمی بەرگی وەزیری کردە بەر شێرکۆو ناسناوی (المنصور)ی لێنا[٤٣]. بەم جۆرە شێرکۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەتی میسری کەوتە ئەستۆ، کە زانیشی شاور پیلانی لە دژدا دەگێڕێ، خۆی لێ رزگار کرد، کاتێك کە لە ساڵی ( ٥٦٤ك/ ١١٦٩ز) بە فرمانی شێرکۆو بە دەستی سەلاحەددین کوژرا، بەلام مەرگ مۆڵەتی زۆری نەدایە شێرکۆو لە رۆژی شەممە رێکەوتی (جماد الاخر ٥٦٤هـ/ مارسی ١١٦٩ز) کۆچی دوایی کرد[٤٤].

## چوارەم: سەلاحەددین ئەیوبی و حکومەتەکەی لە میسر:

لە ناو سوپای شێرکۆدا کۆمەڵێك میری کورد هەبوون، کە دوای کۆچی دوایی شێرکۆ بەتەمای حکومەت بوون، بەلام سەرچاوە نوێیەکانی رووداوەکە ئەوە دووپات دەکەنەوە کە خەلیفەی فاتمی (العاضد) دەیەویست حکومەت بدرێتە دەست سەلاحەددین، چونکە باوەڕی وابوو سەلاحەددین بەو تەمەنە بچووکەیەوە کەم ئەزموونە. پێشی وابوو کە زۆر ئاسانیش ئەبێ بۆ خەلیفە هەر کاتێ بیەوێو پێویست بکات خۆی لێ دەرباز بکات[٤٥].

## دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەیوبی کوردی لە میسر:

ناوی یوسف کوڕی نەجمەددین ئەیوب کوڕی شادی کوڕی مەروانە (مەبەست سەلاحەددینە- و)، لە بنەچەیەکی کوردی رەسەن لە هۆزی کوردە روادییەکانە، باوکی خەڵکی گوندی "دوین" بووە، کە دەکەوێتە باکووری خۆرهەلاتی شاری هەولێر لە هەرێمی کوردستان[٤٦].

## پێگەیشتنی سەلاحەددین ئەیوبی:



سەلاحەددین لە ساڵی (٥٣٢ك) لە شاری تكریت لە عێراق لەدایك بووە، ئەو شەوەی كە سەلاحەددین لەدایك بوو، باوكەكەی و شێركۆی مامی تكریتیان بەجێ هێشت و روویان كردە عیمادەددینی زەنگی حاكمی موسڵ و چوونە ژێر فرمانی ئەو، كاتێكیش كە عیمادەددین زەنگی لە ساڵی (٥٣٤ك) شاری بەعلەبەگی گرت، نەجمەددین ئەیوبی باوكی سەلاحەددینی كردە حاكمی ئەوێ و سەلاحەددینیش یاوەری باوكی بوو[٤٧]، بۆیە سەلاحەددین بەشێكی ژیانی منداڵی خۆی لە بەعلەبەگ بردۆتە سەر، بەڵام مێژوو زیاتری لەسەر ژیانی منداڵی ئەو باس نەكردووە[٤٨].

## خەسڵەتەكانی سەلاحەددین ئەیوبی:

سەلاحەددین حەزی لە دادپەروەری و رقیشی لە زوڵم و زۆری بوو، حەزی لە حوكمێك بوو كە بەپێی شەریعەتی ئیسلامی بێ، حەزی لە شوێنكەوتوویی پێغەمبەری ئیسلام و یارانی دەكرد، رێزیشی لە بیروڕای ئەوانی دیكە دەگرت و پێشی رازی دەبوو، تەنانەت ئەگەر راست و لەجێی خۆی بووایە جێبەجێشی دەكرد، لە هەست و سۆزدا نەرم و چاو بە فرمێسك بوو، زۆر حەزیشی لە زانست و كۆڕی زاناو دانایان بوو[٤٩].

لەو چاكانەی كە لێی دەگێڕنەوە ئەوەیە، كە كاتێك خودا یاریدەیدا بۆ رزگاركردنی قودس، مامەڵەیەكی زۆر باش و جوامێرانەی لەگەڵ دیلەكان كرد، لە بەرامبەر فدیەیەكی كەم، هەرچەندە كە رەمزییش بووایە، ئازادی كردن، بە پێچەوانەی ئەوەی كە خاچپەرستان كردبوویان كاتێك كە قودسیان گرت و دەستیان كرد بە كوشتارو دزی و تاڵانی و بڵاوكردنەوەی بەدرەوشتی. ئەمەش

ئەو بەهاو شکۆیە دەردەخات، کە سەلاحەددین پێی دەناسرایەوە، ئەویش لە سایەی پەیڕەویی لە ئیسلامو سۆزو بەزەییەکەیەوە.

## سەلاحەددین لە دیدگای ڕۆژئاواوە:

مێژوونووسی ئینگلیزی (ئەمیرۆتۆ) دەربارەی سەلاحەددین دەڵێت: " دوای هێرشی دووەمی خاچپەرستان، ماوەیەك بوو ئەوروپا بە هیچ چالاکییەکی سەربازی دژی موسڵمانان هەڵنەستابوو، لەوکاتەدا گەورەترین ڕووداو لە مێژووی شەڕی خاچپەرستان ڕوویدا، ئەویش دەرکەوتنی سەلاحەددینی ئەییوبی بوو. سوپاو سەربازگەی ئیسلامی گەیشتە پلەیەکی زۆر باڵا، ئەویش بەهۆی قارەمانێکی نوێ، کە خودان کەسایەتییەکی سیاسی سەربازی بەرز بوو، کە سەردەمی جەنگی خاچپەرستان ناسیویەتی، نە تەنها لە قارەمانێتی جەنگدا، بەڵکو لە خەسڵەتە کەسییەکانی، کە هەمیشە لەنێوان ناوداران و پیاوچاکانی مێژووی جیهان لە لووتکەدا دەیهێڵێتەوە"[٥٠].

سەلاحەددین پێگەیەکی بەرزی هەیە لەلای ڕۆژئاواییەکان، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو ڕێزە زۆرەی پاشاو مێژوونووس و زانا ڕۆژئاواییەکانە بۆی. کاتێك کە ئیمپراتۆری ئەڵمانی سەردانی سوریەی کرد، چووە سەر گۆڕی سەلاحەددین و چەپکە گوڵی لەسەر داناو گوتی:" من زۆر خۆشحاڵم لەسەر خاکی وڵاتێکدا وەستاوم، قارەمانێکی وەك سوڵتان سەلاحەددین تیایدا ژیاوە، ئەو پیاوەی کە بە ئازایەتی لە رادەبەدەرو بە جوامێریی توانی لە پیاوانی سەردەمی خۆی تێبپەڕێنێ و پایەو شکۆی لەگەڵ ئاسۆدا هاوتا بێ"[٥١].

## سەردەمی فەرمانڕەوایی سەلاحەددین ئەییوبی:

کاتێك کە سەلاحەددین دوای کۆچی دوایی شێرکۆ، لە سەردەمی خەلیفەی فاتمی (العاضد) فەرمانڕەوایی گرتە دەست، کردەوەکانی بوونە مایەی تووڕەیی و نارەزایی خەلیفە، ئەویش لەبەر ئەم هۆیانە:

ئەوازش‌و راكێشانی دڵی خەڵكەكە بۆ خۆی، بەهۆی كارە چاكەكانیەوە، وەك كەمكردنەوەی باج لەسەر هاوڵاتییانی میسری.

لاگیری‌و ملكەچی مەلیكەكانی شێركۆ بۆ سەلاحەددین، كە ژمارەیان (٥٠٠) جەنگاوەری كورد دەبوون، بە تەواوی خستنیە ژێر ركێفی خۆیەوە، بە پێچەوانەی ئەوەی كە خەلیفەی فاتمی پێشبینی دەكرد.

ناردنی كۆمەڵێك سەربازو جەنگاوەری كورد لەلایەن سوڵتان نورەددین مەحمود بۆ لای سەلاحەددین، لەناویشیاندا " توران شا– برای سەلاحەددین" كە بووە هۆی بەهێزبوونی پێگەی سەلاحەددین، ئەمەش هیچ جێی رەزامەندی (العاضد) ی خەلیفەی فاتمی نەبوو.

سەركەوتنی سەلاحەددین لە دابرینی هاوكاری بۆ خەلیفەی فاتمی (العاضد). بۆ نموونە: سەركەوتوو بوو لە نەهێشتنی ئەو سەربازە سودانییانەی لایەنگیری دەوڵەتی شیعەی فاتمی بوون لە میسر.

رەزامەندی نورەددین مەحمود لەسەر داوایەكی سەلاحەددین بە ناردنی كەس‌و كارەكەی بۆ میسر، بە تایبەتی نەجمەددین ئەییوبی باوكی، خەلیفەی فاتمی ئەوەشی بە هێزو پاڵپشتی لێكدایەوە بۆ سەلاحەددین[٥٢].

## بەرپەرچدانەوەی هێرشەكانی خاچپەرستان بۆ سەر میسر:

كاتێك كە خاچپەرستان لە ساڵی (٥٦٤ك/ تشرینی یەكەمی ١١٦٩ز) بە رێی وشكانی بەرەو (دمیاط) كەوتنە رێ، سەلاحەددین بەو هاتنەی زانی‌و هەستا بە قایم كردنی بلبیس و قاهیرەو ئەسكەندرییەو مەڵبەندەكانی



( پۆرترێتی سەركەوتنی سەلاحەددین لە قودس )

دیکەی پێشەوە، چونکە باوەڕی وابوو هێرشی خاچپەرستەکان راستەوخۆ بەرەو قاهیرە دێت. بەڵام ئاراستەکە بەرەو دمیات بوو. ئەم حاڵەتە لە جەنگی سەلاحەددیندا دەرنەچوو، بەڵکو توانای مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییە کتوپڕەی هێرشەکەیانی بۆ دەرکەوت، بۆیە هەواڵی بۆ نورەددین مەحمود نارد و داوای کۆمەکی لێ کرد، ئەویش سەرباز دوای سەربازی بۆ بەڕێ کرد، بە تایبەتی سەربازە کوردەکان، پشت پێبەستنی زەنگییەکانیش بە پلەی سەرەکی لە سوپاکەیاندا لەسەر کوردەکان بوو[٥٣].

سەربازە کوردەکان رۆڵێکی گەورەیان دیت لە بەرگریکردن لە دمیات، هەندێکیشیان رۆڵی سەرکردایەتییان هەبوو لە شەڕەکەدا، وەك تەقییەددین عومەر ( برازای سەلاحەددین)و شهابەددین مەحمود حارمی (خاڵی سەلاحەددین)، کە زۆرێك لە سەربازی کوردیشیان لەگەڵ دابوو، توانییان بگەنە دمیاتو بچنە ناوی. سەلاحەددینیش یارمەتیو کۆمەکی سەربازیی گەیاندنیو توانییان لە شکاندنی گەمارۆی سەر دمیات سەرکەوتوو بن. لەو ئانو ساتە مەلیك عەموری پێی زانی کە نورەددین مەحمود هێرشی بردۆتە سەر وڵاتی شام، بۆیە مەلیك عەموری بە پەلە گەڕایەوە قودس، بۆ پارێزگاری لە کەلوپولەکانی خاچپەرستان[٥٤].

## پێنجەم: کورد لە سوپای سەلاحەددین لە میسر:

سەلاحەددین لە کاروباری سیاسیو جەنگی، بە شێوەیەکی بنەڕەتی پشتی بە سوپاکەی دەبەست، هێزی سەلاحەددینیش لە هێزی سوپاکەی دابوو، سوپاکەی ئەو لە خەڵکی نامۆو بیانی پێکنەهاتبوو، وەك سوپاکەی فاتمییەکان، بەڵکو سوپاکەی سەلاحەددین لە سەربازانی رێکوپێكو رێکخراو (نیزامی) پێکهاتبوو، بناغەی سوپاکەشی کورد بوون. ئێمە لە رێی چەند توێژینەوەیەکی زانستی، سوپای کوردانمان لە میسردا ناسی (ئێمە واتە نووسەرانی کتێبەکە—و).

لەسەرەتای حوکمی سەلاحەددین لە ساڵی (٥٦٧ك/ ١١٧١ز) سەرژمێری کوردان لەناو سوپای سەلاحەددین (١٧٤ تولب) بووە (تولب یەکەی سەربازی بووە)، کە ( ١٤ هەزار) جەنگاوەریان هەبووە. لە ساڵی (٥٧٧ك/ ١١٨١ز) سەرژمێری کوردان لە سوپای سەلاحەددین (٨٦٤٠) جەنگاوەر بووە بە تەواوی کەلوپەلەکانیانەوە[٥٥]، لە ناویاندا (١١١) میری کوردو (٦٩٧٦ طواشي) [٥٦] و ( ١١٥٣ قراغلام)[٥٧]. بەو سوپایەوە بوو کە سەلاحەددین توانی لە شەڕی حەتین سەرکەوتن بەدەست بێنێ[٥٨].

تۆرەمەی کوردان لەناو سوپاکەی سەلاحەددین لە رووی قەبارەو چەکەوە لە هەموو تۆرەمەکانی تر گەورەتر بوو، سەلاحەددینیش دەیەویست زۆرینەی هەرەزۆری سەربازانی سوپاکەی لە تۆرەمەکەی خۆی، واتە (کورد) بن، چونکە دەیزانی راددەی ئازایەتیو دڵسۆزییەکەیان لە شەڕداو سنگفراوانییان لە کاتی بەرگری لە وڵاتی ئیسلام چەندە. ئەمەش زۆرینەی کورد لە سوپاکەی ئەییوبیدا دەردەخات.

چەندین بەڵگەش لەبەردەستن بۆ سەلماندنی پشتپێبەستنی سەلاحەددینی ئەییوبی بە تۆرەمەو رەگەزی کوردی لەناو سوپاکەیو لەشەڕ دژ بە خاچپەرستان. (ابن شداد) کە خاوەنی کتێبی (النوادر السلطانية) یە، دیار دەکات کە "سەلاحەددین لە کاتی گەمارۆدانی یافا لە ساڵی (٥٨٨ك) داوای سوپای ئیسلامی کردووە لە میسر، زۆربەی ئەو جەنگاوەرە موسڵمانانەش کە گەیشتوونەتە لای لە تۆرەمەی کورد بوونە، لەناو ئەو سوپایەی لە میسردا گەیشتوونەتە لای، مەجیدەددین هلدریو سەیفەددین یازکچی کوردییان لەگەڵ دابووە، لە گەڵیشیاندا دەستەی ئەسەدی کوردی هەبوونە، کە بریتی بوونە لە سەربازەکانی ئەسەدەددین شێرکۆی مامی". هەروەها ئیبن شەدداد دەڵێت : "ئەو سەربازانەی بەر لە هەموویان گەیشتنە لای سەلاحەددین، بریتی بوون لە سەربازانی کوردی موسڵ"[٥٩].

ئـــیـــبن شـــەدداد بـەڵـگـەیـەکـی دی دێنێتەوە لەسەر باوەڕ بـوونو پشـتـقـایمـی سـەلاحـەددیـن بـە سەربـازە کـوردەکـانو دەڵێت: "کـاتـێك کـە سەلاحەددین بە (رملە) دا رۆیشت، فرمانی بـە سەربازەکانی کـرد کـە



( پۆرتریتی جەنگی حەتتین )

بۆ وڵاتەکانیـان بـگـەڕێـنـەوە، ئـەو سـەربـازانـەی بـەر لـە هـەمـوان گـەڕانـەوە وڵاتەکانیان سەربازانی هەولێر بوون، دوای ئەوانیش سەربازانی موسڵو سنـجـار بوونو هەموو ئەو سەربازانەش کورد بوون"[٦٠].

کاتێك سەلاحەددین ئامادەکاری دەکرد بـۆ گـەڕانـدنـەوەی قـودس لـە دەسـتـی خاچپەرستان، سەربازگەی خۆی لە دیمەشق دامەزراند، کاروبارەکانی خـۆیشـی لە میسر دایە دەست مەلیك عادلی برای. ئەو بۆیە سەربازگـەکـەی لـە دیمـەشـق دانا تا لە دوژمنەکەی نزیك بێت. ئەوەش یەکێك بوو لە تایبەتمەندییەکانی ئەو. وەك لێی زانراوە ئەو دەیەویست بۆ خۆی ئاگاداری بارودۆخی دژمەنەکەی بێت. لە دیمەشقیشدا ریزەکانی سوپاکەیو جموجۆڵیـانـی لـە مـیـسـرو حـەلـەب، لـە جەزیرەو دیاربەکر لە کوردستانی تورکیا رێکدەخستەوە. کاتێـکـیـشـ کـە زانـی ریزی هێزەکانو ئامادەکارییەکانی تـەواو بـووە، لـە (٥٨٣ك/ مـارسـی١١٨٧ز) دیمەشقی بەرەو (کرك) بەجێ هێشتو چـووە نـاویو رووی کـردە (شـوبـك)ی هاوسێیو ئەوێشی گرت، سەربازگەشی لە بـانـیـاس دامـەزرانـد، بـۆ ئـەوەی لـە نزیکەرە چاودێری بارودۆخەکە بکات[٦١].

## ڕۆڵی کورد لە سەردەمی حوکمی سەلاحەددین:

سەرەتا پێویستە لەچوارچێوەی مێژوویی ئەو سەردەمەدا بوەستین، دواتر لە سەردەمی سوڵتان سەلاحەددین ئەییوبی. لەڕاستیدا میرە ئەییوبییەکان حوکمی ئەو شارانەیان گرتبووە دەست کە ئەییوبییەکان ئازادیان کردبوو، ڕۆڵێکی گەورەیان لە دەوڵەتی ئەییوبیدا هەبوو، ڕۆڵێکی گەورەو کاریگەریشیان گێڕا لە سەردەمی حوکمڕانی سوڵتان سەلاحەددین و هەروەها دوای مردنیشی. دوای ئەوەی، کە سەلاحەددین لە ژێر فەرمانی نورەددین مەحمود ڕزگاری بوو، هەوڵیدا هەموو ئەندامانی خێزانەکەی لە سەردەستەی ئەو تیپانە دابنێ، کە سوپاکەی لێ پێکهاتووە. هەوڵیشیدا کە چنگیان لەسەر ئەو شارانە قایم بکەن کە بەڕێوەیان دەبرد[٦٢]، ئەوانەش کە لەلایەن شێرکۆ گلۆڵەیان کەوتبووە لێژی، سەلاحەددین گێڕاندنیەوە بۆ فەرمانڕەوایی حەمس، ئەویش دوای ئەوەی کە دەست و پێوەندەکانی سوڵتان نورەددین مەحمودی لێ دوور خستەوە[٦٣].

هەروەها میر تەقیەددینی عومەری برازای سەلاحەددین ڕۆڵێکی چالاك و جوامێرانەی هەبوو لە سەرکەوتنە جەنگییەکانی سوڵتان و هەروەها لە ژیانی سیاسی ئەو لەو سەردەمدا. تەقیەددین لە سەرەتای رووتێکردنی سەلاحەددین بۆ ڕۆژهەلات، بەشدارییەکی کارای هەبوو لە پارێزگاری کردن لە حەماه (سوریەی ئێستا). هەرچەندە میر تەقیەددین سەربەگێچەڵ و ئاژاوەگێڕ بوو، بەلام سەلاحەددین توانی بەجۆرێك ڕەفتاری لەگەڵدا بکات، تا دواجار هێنایەوە سەر ڕێگای ڕاست. ئەویش لە هێرش و پەلامارە سەربازییەکاندا بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەستا، تا بوو بە یەکێك لە گرنگترین ئەوانەی کە بەشداری کارایان هەبوو لە فراوانکردنی دەسەلاتی خێزانی ئەییوبی لە ڕۆژهەلاتدا[٦٤].

## کۆچی دوایی سوڵتان سەلاحەددین ئەییوبی:

دوای ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی موسڵمانان بە سەرکردایەتی قارەمانی کورد سەلاحەددیی ئەییوبی لە جەنگی حەتتین، کە لە (١٤ سفر ٥٨٩هـ/ مارسی


( گۆڕی سەلاحەددین )

١١٩٣ن) بەدەستیان هێنا، سوڵتان بۆ پێشوازی کردنی ئەو حاجییانەی لە مەککە دەگەڕانەوە لە شار چووە دەرەوە. دوای کۆتایی هاتنی ئەو ئاهەنگەی بۆ هاتنەوەی حاجییان لە مەککە سازکرا، سوڵتان سەلاحەددین گەڕایەوە بنکە و بارەگای خۆی، هەر ئەوکات هەستی بە تا و لەرزێکی توند کرد و نیشانەکانی تالێهاتنی لێ دەرکەوتن و نەخۆشی تای زەردوویی داگرت. ڕۆژ دوای ڕۆژ نەخۆشییەکەی توندتر دەبوو، تاکو مەرگ گەیشتە سەری و لە ڕۆژی چوارشەممەی (٢٧ سفر ٥٨٩هـ/ ٤ی مارسی ١١٩٣ن)، دوای بیست ساڵ حوکمڕانی، لە تەمەنی نزیك پەنجا و حەوت ساڵی[٦٥] کۆچی دوایی کرد. کاتێك کە خەڵك هەواڵی کۆچکردنیان بیست، دەنگی گریان و ناڵە بەرزبووەوەو ماتەمین و خەم سەراپای جیهانی ئیسلامی داگرت[٦٦].

کۆچی دوایی سەلاحەددین تەنها زیانێکی گەورە نەبوو بۆ ماڵباتەکەی و بۆ کورد، بەڵکو بە گشت جیهانی ئیسلامی کەوت، بە تایبەتیش بۆ میسر. بەسە بۆ ئەو کە دوژمنەکانی شایەدی ئەوەیان بۆ داوە، کە ئەو گەورەترین کەسایەتی بووە، کە سەردەمەکانی جەنگی خاچپەرستی بەخۆیەوە دیوە، بەپێی گوتەی مێژوونووسانی مەسیحی[٦٧].

سەلاحەددین، ئەو قارەمانە کوردەی کە زۆر شاکاری مەزنی پێشکەش بە جیهانی ئیسلامی کرد، قوربانی زۆریدا لە پێناو بەرزیی ئیسلام و گەلەکەی. لە بەخشینی سەروەت و سامانی خۆی بە خەڵك ڕژدی و چرووکی نەکرد. لە خەزێنەی ئەودا جگە لە بەرەیەکی یەکگرتووی ئیسلامی هیچی تر بەجێنەما، هیواشی خواست هەروا بمێنێتەوە، مەگەر بەهێزتر و پێشکەوتووتر نەبێت لە هێز و پێشکەوتنی ئەوەوە. خاچپەرستانیشی فێرە وانەیەك کرد کە بە درێژایی

ژیانیان لەبیریان نەچێتو تا سەدەکانی نوێش هەر دە سنگیاندا هەڵیانگرتبوو! ! بەخشندەیی خوا بۆ ئەو کەسەی کە بە دڵسۆزییەوە لەرێی خوا تێکۆشاو نەفرەتی خواش لەو کەسە بێت کە کەمتەرخەمو خیانەتکارە ؟!

## دەوڵەتی ئەییوبی کوردی لە دوای سەلاحەددین ئەییوبی:

سوڵتان سەلاحەددین ئەییوبی بەر لە کۆچی دوایی، هەستا بە دابەشکردنی پێگە گرنگەکانی دەوڵەتی ئەییوبی بەسەر رۆڵەکانیماڵباتی ئەییوبی کوردی، کاروباری سوریە و فەلەستینی دایە دەست کورەکەی خۆی مەلیك ( افضل ابي حسن نورالدين علي)، فەرمانڕەوایی میسریشی دایە مەلیك (عزيز عثمان)، حەلەبی دایە دەست مەلیك (ظاهر غازی غیاث الدين)، مەلیك (عادل)ی برای خۆیشی کردە فەرمانڕەوا بەسەر بەشێك لە دەوڵەتەکەی، وەك (جزیرێ بۆتان). شاری حەمسیشی دایە دەست کورەکانی شێرکۆی مامی، (سيف الاسلام طغتكين)ی برازاشی دانایە سەر یەمەن[٦٨].

ئەوەی لێرەدا تێبینی ئەکرێ ئەوەیە، کە سوڵتان بۆ دوای مردنی، کەسێکی بۆ جێگرەوەی خۆی دەستنیشان نەکردووە. لەدوای خۆی حوکمڕانیشی بۆ هیچ کام لە میراتگرانی دیار نەکردووە، بەڵکو کاروباری دەوڵەتە یەکگرتووەکەی بەسەر هەمرواندا دابەش کردووە، بەو هیوایەی کە ببن بە یەك دەستە و پارێزگاریش لەو یەکێتییەیان بکەن، نەبادا بەرەی رۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامی بگەرێتەوە سەر دۆخی جارانی، بەر لەوەی کە ئەو حوکمڕانی بەسەردا بکات.

دوای مردنی سەلاحەددین، حەڤدە کوری لەپاش بەجێمان، کە بریتی بوون لە : ( افظل علي، ظاهر خضر، قطب الدين موسى، عزيز عثمان، اعز يعقوب، ظاهر غازي، زاهد داود، معز اسحاق، موءيد مسعود، اشرف محمد، محسن احمد، غالب ملكشاه، ابوبكر النصر، جواد ايوب، اشرف توران شاه، عمادالدين شادي، نصرة الدين مروان، تاقانە کچێکیشی هەبووە بەناوی (موءنسة خاتون)[٦٩].

**ئەو شوێنەوارە بیناسازییانەی سەلاحەددین ئەییوبی بەجێی هێشتوون:**

سەلاحەددینی ئەییوبی هەندێك بیناسازی لە وڵاتی میسر دروست کردن، تا ئێستاش گەواهی بۆ پێشکەوتنی ئەو سەردەم لێ دەدەن، هەروەك چۆن مێژووو شارستانیەتو شێوازی ژیانی کوردانی ئەوێشیان پاراستووە. هەندێك لەو شوێنەوارانەی کە سەلاحەددین لە میسر بەجێی هێشتوون ئەمانەن:

- قوتابخانەیەك لە قەرافەی گەورەو بچووك لە تەنیشت گۆڕی ئیمامی شافعی.
- قوتابخانەی (قاهرة المعزیة) لە تەنیشت مەزارگای ئیمام حوسێن. ! ( **ڕەنگە مەبەست لە حوسێنییە بێت، چونکە گڵکۆو مەزارگای ئیمام حوسێن لە شاری کەربەلایە لە باشووری عێراق- و)**
- قوتابخانەی (الشافعیه)، کە ئێستا لە میسر بە قوتابخانەی (زین التجار) دەناسرێ.
- قوتابخانەیەك بۆ شوێنکەوتووانی مەزهەبی ئیمام مالك، نزیك لە قوتابخانەی شافعییە.
- قوتابخانەیەك بۆ حەنەفیەکان لە ساڵی (٥٧٢ك/١١٦٧ز)، کە دواتر (البطائحي) وەزیر کردی بە بنەگەی ماڵەکەی، ئێستا بە قوتابخانەی (سیوفی) دەناسرێ[٧٠].
- نەخۆشخانەیەك لەناو کۆشکی خۆی لە قەلا، بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشەکان[٧١].

هەرچی سەبارەت بە تەکیەو خانەقاکانە[٧٢] کە سەلاحەددین دروستی کردن، ئەوا بەر لەوە میسر ئەو جۆرە بیناسازییەیان نەدەزانی، بەڵکو لەگەڵ هاتنی کوردە ئەییوبییەکانەوە هاتە ناو میسر. قلقەشەندی کە خاوەن کتێبی (صبح الاعشی)یە، ئەو بینایانەی دیتوون و دەربارەیان دەڵێت:" هەرچی سەبارەت بە خانەقا و تەکیەکانە ئەوا خانووەکانی میسر بەر لە دەوڵەتی ئەییوبی وا نەبوونە". لە ساڵی (٥٦٩ك/١١٧٣ز) سەلاحەددین خانەقای (سعید السعداء) بۆ



سۆفیگەری دروست کرد، شێخێکیشی بەسەردا کردە سەردار ناسراو بوو بە شێخی شێخان، هەموو پێداویستییەکیشی بۆ دەستبەرکرد، تا لە سۆفیو دەروێشە هەژارەکان خەرجی بکات[٧٣].

وێڕای هەموو ئەو شوێنەوارانە، نابێ ئەو هەموو قەڵاو قونگرە قایمانەش لەبیر بکەین، کە سەلاحەددین دروستی کردنو سەرپەرشتیشی کردن و زۆر گرنگیشی پێدان، بە مەبەستی پارێزگاریو بەرگری لە وڵاتانی ئیسلامی، بە تایبەتیش میسر و شام، بۆیە دەبینین کە سەلاحەددین ژمارەیەك قەڵای لە میسر و شام دروست کردوون[٧٤].

(قلعة الجبل) لەو قەڵایانەیە لە قاهیرە، کە قەڵای سەلاحەددین ئەییوبییە و ئەو گەڕەکەش کە قەڵاکەی تێدا دروست کراوە بە (حي القلعة) ناسراوە. کە لەسەر باسکێکی جیابووەوە لە چیای (المقطم) دروستی کردووەو دەڕوانێتە سەر دەرگاکانی شاری قاهیرە. ئەو قەڵایەی سەلاحەددین ئەییوبی بەگەورەترین قەڵای جەنگی دادەنرێت لە سەدەکانی ناوەڕاست دروست کرابێت، بە پلەی یەکەم بۆ پێگە ستراتیژییەکەی، چونکە چاودێری ئەکرد بەسەر قاهیرەی فاتمیو فستات. هەروەها لەبەر ئەوەش کە ئەو بەربەستێکی سروشتی بوو، چونکە لەسەر چیا دروست کرابوو، ئەو بڵندابییەش لەنێوان هەردوو شارەکە هەڵکەوتبوو، بۆیە پێگەیەکی گرنگی لە بەرگریکردندا گرتبوو[٧٥].

قەڵای سەلاحەددین لە دوو بەش پێکهاتبوو، بەشی باکوورو بەشی باشوور. بەشی باکووری لەسەر شێوەی لاکێشە بوو، چەند قوللەیەکی بەرزیشی بۆ دروست کرابوون، دیوارێکی بەرین کە قوللەکانی لەسەر بوون، هەردوو بەشەکەی قەڵای لێك جیا دەکردەوە. لەنێو ئەو دیوارە بەرینەدا دەرگای قەڵا هەبوو، کە ،ە دەرگای خواروو (الجواني) دەناسرا. هەرچی بەشە باشوورییەکەی بوو، ئەوا پاشکۆکانی تری قەڵاو کۆشکی تایبەتی سوڵتانو تەویلەی وڵاغی

لەخۆ دەگرت، بەڵام بەشە باکورییەکەی خودی قەڵا جەنگییەکە بوو[٧٦]. ئەو قەڵایە لە سەردەمی سەلاحەددین تەواو نەکرا، بەڵکو دوای ئەو لە سەردەمی مەلیك کامل[٧٧] تەواو کرا.

ئەو قارەمانەی کورد هەر بە دروستکردنی ئەو قەڵایە نەوەستا، بەڵکو دوو قەڵای دیکەی لەناو خاکی میسردا دروست کردن، یەکیان لە سینا لەنزیك ( عین سدر). ئەوەی دووەمیان لە دوورگەی فیرعەون لە کەنداوی عەقەبە، کە ناسراوە بە (قەڵای سەلاحەددین یان قەڵای فیرعەون). ڕەنگە هۆکاری سەرەکی بۆ دروستکردنی هەموو ئەو قەڵایانە لەلایەن سەلاحەددینەوە هەوڵێك بوویێ بە پێشگیری و دانانی سنوورێك بۆ مەترسی خاچپەرستان لەسەر لێواری دەریای سوور. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو هەوڵەی (ارناط)ی خاوەنی کەرکە، کە بە مەبەستی گەیشتن بە خاکی حیجازی پیرۆز


.( قلعة الجبل)

هێرشێکی سەختی هێنا، بۆ دەرهێنانی گۆڕی پێغەمبەری ئیسلام محەمەد ( دروودی خوای لەسەر بێت). بۆیە سەلاحەددین دەستبەجێ ئەو قەڵاو بیناسازیو قایمکارییانەی دروست کردوون، تا سنوورێك بۆ مەترسی خاچپەرستان لە ناوچەکە دابنێت[٧٨].

سەلاحەددین قەڵای چوارەمیشی لە باشووری میسر دروست کردووە، پێدەچێ ئەو قەڵایەشی بۆ پاسەوانیو بەرگری لە نەوبەو سودانو پارێزگاری لێکردنیان لەهەر دوژمنکارییەکی دەرەکی بوویێ.

جگە لە قەڵا، سەلاحەددین لە ساڵی (٥٧٢ك/ ١١٧٦ز) کۆمەڵێك شوورەی قایمی بە دەوری قاهیرەو میسر (فسطاط، قطائع، عسکر)، (**ئەوکات بە قاهیرە دەگوترا قاهیرە، بە فستاتو قەتائعو عەسکەری دەگوترا میسر–و**) دروست کردوون، بەشێکی ئەو شوورانە لەم دواییە لەلایەن عەلی بەگ بەهجەت دۆزرانەوە[٧٩].



کاری بیناسازی ئەییوبییە کوردەکان هەر لە سەردەمی سەلاحەددین دا قەتیس نەبووە، بەڵکو هەندێکیش لەو ئەییوبییە کوردانەی کە دوای سەلاحەددین هاتوون، کۆمەڵێك شوێنەواری بیناسازییان دروست کردووە، کە تا ئێستاش گەواهییەکی بەرزن و گوزراشت لە گەورەیی ئەو سەدە و گەورەیی پیاوە کوردەکانی دەکات، وەك:

**مزگەوتی سوڵتان نەجمەددین ئەییوب:** ئەو سوڵتانە کوردە کاروباری میسری رێکخستووە و بارودۆخەکەی چاك کردووە. هێرشی سوپای خاچپەرستانیشی لە مەنسورە و لە رەشید تێکشکاندووە[80]. هەرچی مزگەوتەکەیەتی ئەوا بەو پارەیە دروستی کردووە کە وەك دەسکەوتی جەنگی لە شەڕی خاچپەرستان بەردەستی کەوتووە. ئەو مزگەوتە دەکەوێتە نزیك (باب النصر) لە قاهیرە. گۆڕی سوڵتان هەر لەو مزگەوتەدایە لەپشت رێگای بن یەکێك لە قوببە گەورەکانی لە دەستەچەپی مزگەوتەکە.

**مزگەوتی سوڵتان ئەشرەف:** ئەویش کوردێکی ئەییوبی بووە، مزگەوتەکەیشی لەسەر هەمان شێوازی مزگەوتی سوڵتان نەجمەددین ئەییوبییە، شوێنی ئێستاکەی کەوتۆتە بازاڕی سوڵتانییە نزیك لە باب ئەلنەسر.

**مزگەوتی شەیخونە:** شەیخونە ناوی (عومەر) بووەو کوردێکی رەسەن بووە، هەروەها وەزیری سوڵتان حەسەن بووە، مزگەوتەکەی ئەو ئێستا کەوتۆتە مەیدانی رمێلە، کە مەیدانی سەلاحەددین بووە لە گەڕەکی قەلا.

**قوتابخانەی سوڵتان کامل: (مەبەست مەدرەسەی دینییە –و)**، ئەوە یەکەم قوتابخانە بووە بۆ خوێندنی زانستی نوێی نەبەوی، لە قاهیرە دروست کراوە،

ئێستاش کەوتۆتە ناوچەی ئیمام شافعی[81].

**بیری یوسف:** کە لە قەڵای سەلاحەددین دەچیتە دەرێ، گۆڕەپانێکی گەورە دەبینی، لە کۆتاییەکەیدا بیرێك هەیە بە بیری یوسف ناسراوە، یەکێکە لە دەگمەنترین شوێنەوارەکانی میسرە. دەڵێن میسرییەکان باوەڕیان وابووە کە بۆ یوسفی پێغەمبەر دەگەڕێتەوە (سڵاوی خوای لێ بێت)[82]. بەڵام قلقەشەندی دەڵێت: " ئەوانەی کە بیرەکەیان هەڵکەندووە قەرەقۆش بوونە، کورد نەبوونە. هەر ئەویش ناوی یوسفی لەو بیرە ناوە، وەك ناوی سەلاحەددین یوسف کوڕی ئەییوب (**ناوی رەسەنی سەلاحەددین، یوسف کوڕی نەجمەددین ئەییوب بووە و سەلاحەددین ناسناوی بووە**– و ). ئەو بیرە بە ناوێکی دیکەش ناسراوە کە پێی دەگوترێت لوولپێچ و لە دوو نهۆم پێکهاتووە[83]، مەبەستیش لە هەڵکۆڵین و دروستکردنیشی بۆ گلدانەوەی ئاو بووە، تا لە هەر گەمارۆیەکدا قەڵانشینەکان بەکاری بێنن[84].

یەکێك لە نووسەرەکان وتارێکی لەسەر (قلعة الجبل) نووسیوەو دەڵێت کە ئەوێ زیاتر لە دە مەزارگای تێدا هەیە. مێژووی دروستکردنی ئەو قەڵایە بۆ سەردەمی سوڵتان سەلاحەددینی ئەییوبی دەگەڕێتەوە، کە لەلایەن بەهائەددین قەراقۆشی وەزیر لە سەدەی دوازدەی زایینی دروستکراوە. مەبەستیش لە دروست کردنی، مسۆگەرکردنی پارێزگاریکردن بووە لە قاهیرە دژی خاچپەرستان. کارەکانی بیناسازی ئەو قەڵایە دواتر لەسەردەمی نەوەکانی خێزانی ئەییوبی کوردی تەواو کراون، ئەو قەڵایە لە ساڵی (١٢٠٨ز تا ١٨٧٤ز) وەك بارەگای حوکمڕانی بەکار هاتووە[85]. ئەو مێژووە هاوکاتە لەگەڵ کۆتایی هاتنی دروستکردنی کۆشکی عابدین، لەسەر دەستی یەکێك لەئەندامانی ماڵباتی محەمەد عەلی، کە ناوی (خدێوی ئیسماعیل - ١٨٦٣–١٨٧٩ز) بووە. لە دوای تەواوبوونی، ئەوا بارەگای حەکمڕانی لە قەڵاوە بۆ ئەو کۆشکە گواسترایەوە.

## ئەو ناوچانەی کە کوردەکان لە کوردستان و دەرەوەیدا دەژیان، بەر لە گەیشتنی ماڵباتی ئەیووبییەکان بۆ دەسەڵات:

لە راستیدا سەختە بتوانین هەموو ئەو شار و گوندانە دیار بکەین کە سەربازو شەرکەرەکانی کوردی لێوە هاتوونە، بەر لەوەی بگەنە میسر. چونکە زۆربەیان رۆڵەی خێڵە کۆچەرییەکان بوون و هەندێك جار تێکەڵ بە رەگەزە غەیرە کوردەکانیش دەبوون[٨٦]. بەڵام دیارترین ئەو شوێنانەی کە ئەو خەڵکەی لێوە هاتووە بریتیی بوون لە : (باکووری موسڵ، هەولێر، شارەزوور) زەنگییەکان لەو ناوچانەوە سەربازی کوردیان هێنان بۆ دامەزراندنیان لەناو سوپای زەنگی. ئەگەرچی ئەو خەڵکە بە چڕی لەو ناوچانەوە نیشتەجێ ببوون، بەڵام هیچ رێگرییەك نەبوو کە وەك کۆچەر ناوچەکەیان بەجێ بێڵن و روو بکەنە سوریەو میسر، لەوێش پێگەی سەرکردایەتی و سەربازی و سیاسی ئەو وڵاتانە داگیر بکەن.

لە راستیدا، (حصن الاکراد)ی بەناوبانگ، کە ئێستا کەوتۆتە باکووری سوریە و بە (قلعة الحصن) ناودارە (**قلعه الکرد– قەڵای کوردانیشی پێ دەگوترێ – و**)، لە رۆژگاری فەرەنسییەکان بە (کراك الفرسان) ناسراو بووە، لە سەرەتای سەدەی یازدەم لەلایەن سەربازە کوردەکانەوە بەکار دەهێنرا، بۆ ئەوەی ئەو رێگایانەی دەچوونە حەمس و حەما کۆنترۆڵ بکەن. دەگوترێ کە لە سەدەی دوازدەهەم، کوردێك بە ناوی عەلی کورد لەژێر فەرمانڕەوایی (البورید) حوکمی حەمای کردووە[٨٧].

## ئەو کوردانەی لەگەڵ شێرکۆ دابوون لە هەڵمەتەکەی بۆ سەر میسر:

– **بدران الکافر**: شەمس ئەلملوکی حاکمی دیمەشق بە خزمەتکاری خۆی دایمەزراندبوو. ئەو کوردە لە حەمسی سوریەی ئێستاوە هاتبوو.

– **مجاهد الدین بوزان الکردي**: میری سەرخاد ( لە کتێبەکەدا سرخاد نووسراوەو پێدەچێ هەڵەی چاپ بێ و مەبەست سەرحەد بێت–و )، ئەو

سەرکردەی هێزە کوردییەکان بووە لە دیمەشق، لەژێر فەرمانڕەوایی بورید. ئەو لە کوردە جەلالییەکان[88] بووە، زۆر نزیکە ئەو لە کوردانی ناوچەی شارەزوور یان هی هەولێر بووبێ، ئەو لە دیمەشقدا دوو مزگەوت و قوتابخانەیەکی دروست کردوون، پێشدەچێ کە سەیفەددینی محەمەد یازدان کوڕی ئەو بووبێ.

– ابن ماين الكردي: ئەو کابرایە لە دەستو پێوەندەکانی نورەددین مەحمود زەنگی بووە، پێشتر لە وڵاتی شام بووە، دواتر لەگەڵ شێرکۆ چۆتە میسر، لەکاتی هێرشی سەر میسر لە گەمارۆدانی بلبیس دا مردووە.

**شەشەم: ناودارانی کورد لە میسر لە سەردەمی ئەییوبی:**

– **الامير مجيرالدين او مجدالدين ابو الهجاء بن عيسى الازكشي الكردي:** لە ساڵی (٥٦٧ك/ ١١٧١ز) لە میسر لەدایك بووە، لەگەڵ ئەمیر (علم الدين سنجر حلبي) بەشداری نوێنەرایەتی کردووە لە شام، ساڵی (٦٦١ك/ ١٢٦٧ز) کۆچی دوایی کردووە[89].

– **ضياءالدين ابو الفتح نصرالله:** لە جزیریێ بۆتان (نووسەران "جزيره ابن عمر"یان بەکارهێناوە، کە مەبەست جزیریێ بۆتانە، بۆیە لێرە بەدواوە ئێمە هەر جزیریێ بۆتان دەنووسین نەك ناوە تەعریب کراوەکەی– و ) لەدایك بووە، کە دەکەوێتە کوردستانی تورکیای ئێستا، لەوێش خوێندوویەتی، دواتر لەگەڵ باوکی خۆی ڕووی کردۆتە موسڵو لە بواری شیعر و ئەدەبدا کاری کردووە، زۆریش تێیاندا دەستڕۆیشتوو بووە، پاشان گەیشتۆتە میسر. لەوێ لە ساڵی ( ٥٨٧ك) چۆتە خزمەت سەلاحەددین ئەیووبی. تا کاتی کۆچی دوایی سوڵتان ئەو هەر لە میسر مایەوە، دواتر ڕووی کردە سوریە و لەلای مەلیك ئەفزەڵی کوڕی سەلاحەددین بوو بە وەزیر. دوای کەوتن و (ڕووخانی) مەلیك ئەفزەڵ، دووبارە بە نهێنی گەڕاوەتەوە میسر و تا ساڵی (٦٠٧ك) تێیدا ماوەتەوە، پاشان چۆتە حەلەب. لە دوای ئەوێش ڕووی کردۆتە هەولێر لە کوردستانی عێراق، ساڵی (٦١٨ك) گەڕاوەتەوە موسڵ و تێیدا نیشتەجێ بووە.

شوێنەوارێکی نەمری لە بواری هونەری داڕشتن هەبووە، ئەویش کتێبی "المثل السائر في ادب الكاتب و الشاعر"ە، هەروەها کتێبی "الوش المرقوم في حل المنظوم". لە ساڵی (٦٣٧ك) لە ڕێگای چوون بۆ بەغدا کۆچی دوایی کردووە [٩٠].

– ابو الحسن علي سيف الدين: خەڵکی ئامەد (دیاربەکر) بووە لە کوردستانی تورکیای ئێستا. ساڵی (٥٥١ك) لەوێدا لەدایک بووە، دواتر چۆتە میسر. تەمەنێکی درێژی لەوێ بەسەر بردووە، هەندێك کتێبی نووسراوی هەن، وەك کتێبی " ابكار الافكار فى علم الكلام". لە ساڵی (٦٣١ك) لە شام کۆچی دوایی کردووە [٩١].

– الامير احمد الايوبي: ئەو مەلیك موحسن عەین ئەلددینە و یەکێکە لە کوڕەکانی سەلاحەددین ئەییوبی، لەگەڵ باوکی خۆی لە میسردا ژیاوە. لە زانستی نوێدا زانا بووە، زۆر خواناس و لەخواترس بووە، مەیلی لە شوێنکەوتوویی ئیمام عەلی بوو (ڕەزای خوای لێ بێت)، لە ساڵی (٦٣٤ك) لە حەلەب کۆچی دوایی کردووە [٩٢].

– ایوب (الامیر ایوب): ناسناوەکەی نەجمەددین بووە و باوکی سوڵتان سەلاحەددین ئەییوبییە، لە خێڵی ڕوادی کوردی بووە. ئیبن خەلەکان لە بارەی ئەودا دەڵێت: " لە گوندێکی نزیك "دوین" لە باکووری خۆرهەڵاتی هەولێر لە کوردستانی عێراق لەدایك بووە، دوای کۆچی دوایی (شادی) باوکی، ماوەیەك وەك (دزدار– پارێزگار)، بە پارێزگاری تکریت دامەزراوە، دوای شکانی میر عیماددەدین زەنگی لە ساڵی (٥٢٦ك) لە جەنگێکدا لە باشووری تکریت بەرامبەر بە سوپای سەلجوقییەکان بە سەرکردایەتی قراجان، نەجمەددین ئەییوب میوانداری میر عیمادەددینی کردووە و زۆر ڕێزی لێ ناوە و چاکەی لەگەڵ کردووە، توانیویەتی بشیپەڕێنێتەوە بۆ بەری چەپی ڕووباری دیجلە. دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك، نەجمەددین خۆی و خێزانەکەی بەهۆی هەندێك

کێشه که لەگەڵ شێرکۆی برای لێیان روویداوە، تکریتیان بەجێ هێشتووە. نەجمەددین خۆی و خێزانەکەی له موسڵدا دابەزیون، هەڵبەته زۆر ئاسایی بووە که عیمادەددین زەنگی چاکەی ئەو بداتەوە، بۆیه میر عیمادەددین پێشوازی له نەجمەددین کردووە و چاکەی لەگەڵ کردەوە، هەر ئەوکات خۆی و شێرکۆی برای پەیوەندییان به سوپاکەی زەنگییەوە کرد. کاتێکیش که عیمادەددین بەعلەبەگی گرت، نەجمەددینی کرده حاکم و فەرمانڕەوا بەسەردا. بارودۆخەکه بەم شێوەیه مایەوە تا ئەوکاتەی که سوپای شام هێرشیان هێنایه سەر بەعلەبەگ، ئەویش به مەبەستی یەکرێزی بەرەی ئیسلامی دژ به خاچپەرستان. بۆیه هیچ رێگاچارەیەك له پێش نەجمەددین دا نەمایەوە ئەوە نەبێ که پەیوەندی بەو سوپایەوە بکات. (مجیرالدین ارتق)ی حاکمی شام، نەجمەددینی وەك سەرکردەی گشتی سوپای شام دەستنیشان کرد، ئەویش توانی سەرکەوتوو بێت بەسەر دووەم هێرش و پەلاماری خاچپەرستان بۆ سەر ولاتی شام. نەجمەددین ئەییوب زۆر دلێرانه بەرگری له شام و ولاتی موسڵمانان کرد. له راستیدا میری شام ئەوکات سەر به نورەددین مەحمود کوڕی عیمادەددین زەنگی بوو، بەلام نورەددین دەیەویست بەخۆی دەست بەسەر شامدا بگرێت، بۆیه سوپایەکی به سەرکردایەتی شێرکۆی برای نەجمەددین ئەییوب نارده سەر شام، بەلام نه نەجمەددین ئەییوب و نه شێرکۆی برای نەیانتوانی و نەیانویست لەگەڵ کوڕی میر عیمادەددین بکەونه جەنگ، بەڵکو لەگەڵیدا رێککەوتن، بۆیه نورەددین مەحمود دەستی بەسەر شامدا گرت و ئەویش نەجمەددین ئەییوبی کرده حاکم بەسەر ولاتی شام و کردیشی به راوێژکاری خۆی. نەجمەددین له شامدا مایەوە تا سەلاحەددینی کوڕی توانی تەختی فەرمانڕەوایی له میسر بەرز بکاتەوە، ئەوکات داوای له نورەددین مەحمود کرد که باوکی رەوانەی لای ئەو بکات، بۆ ئەوەی سوود له راوێژەکانی ببینێ، نورەددین مەحمودیش بەمه رازی بوو. نەجمەددین ئەییوبیش له ساڵی (٥٦٤ك) رووی کرده میسر، تا

پاڵپشتی سەلاحەددین ئەییوبی کوڕی بکات و بەهێزتری بکات[93].

- **حسام الدین الامیر**: کوڕی عەلی هەزەبانییە، یەکێك بووە لە ئەمیرەکانی مەلیکی چاکەکار نەجمەددین ئەییوب. سەرکردەیەکی سوپای ئەییوبی بووە، لە ساڵی (٦٤٥ك) لەگەڵ سوپا چۆتە سەر دیمەشق و گرتوویەتی، کاتێکیش کە مەلیکی چاکەکار بەعلەبەگی گرتووە، حیسامەددین بۆتە جێگری مەلیك نەجمەددین لە وڵاتی شام[94].

- **خسرو "الامیر"**: کوڕی بەلیلە و برازای ئەبی هیجای هەزەبانی حاکمی هەولێر بووە لە کوردستانی عێراق. یەکێك بووە لە گەورەترین لەو سەرکردانەی کە سوڵتان نورەددین مەحمود لەگەڵ ئەسەدەددین شێرکۆ ناردوونی بۆ میسر. یەکێکیش بووە لەو چوار کەسانەی کە بە وەزارەتی سوڵتان سەلاحەددینی ئەییوبی بۆ کوڕە خوشکەکەی رازی نەبووە. ماوەیەك لە میسر دا ماوەتەوەو دواتر گەڕاوەتەوە شام[95].

- **شیرکوە**: ناسناوەکەی (ابو الحرب) بووە، ناوداریش بووە بە (مەلیك مەنسور ئەسەدەددین شێرکۆ). کوڕی شادی مەروانەو مامی سوڵتان سەلاحەددینە. کاتێك کە باوکەکەی لەلایەن مجاهد بەهرۆزی فەرمانڕەوا بە جێگر لە تکریت داندراوە، شێرکۆش لەگەڵ باوکیدا بووە. کاتێکیش کە باوکی کۆچی دوایی کردووە، لەگەڵ براکەی خۆی نەجمەددین ئەییوبی باوکی سەلاحەددین، ماوەتەوە. کە جێگری فەرمانڕەوا بووە لە تکریت. لەو کاتەی کە لە تکریت بوونە، شێرکۆ ئەفسەرێکی سەلجوقییەکانی کوشتووە، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە ئەفسەرەکە لە رێگادا دەستدرێژی کردبووە سەر ژنێك. بەم هۆیەشەوە نەجمەددین، شێرکۆی برای دەخاتە بەندیخانەوە، بەڵام بەهرۆزی حاکم هەستا بە دەرکردنی نەجمەددین و شێرکۆ وماڵباتەکەیان لە تکریت. ئەوانیش تکریتیان بەجێ هێشتووەو چوونەتە موسڵ بۆ لای عیمادەددینی زەنگی، ئەویش پێشوازی گەرمی لێکردوونە و لەناو سوپاکەشیدا ئەرکی باشی

پێسپاردوون. بۆیە هەم نەجمەددین و هەم شێرکۆی برای، ئەو چاکەیەی عیمادەددینان لەبەرچاو گرت و پاراستیان و زۆر بە دڵسۆزیش خزمەتیان کرد، هەر لەژێر خزمەت و فەرمانداری ئەویشدا مانەوە تا کۆچی دوایی کرد، دوای ئەو چوونە خزمەت نوورەددین مەحمودی کوڕی. کاتێکیش کە نورەددین دەستی بەسەر حەمس و رەحبەدا گرت، نورەددین مەحمود شێرکۆی کردە سەرکردەی گشتی سوپاکەی. دوای دەستبەسەر داگرتنی شام لەلایەن نورەددین مەحمودەوە لە ساڵی (٥٥٨ك)، شاوری وەزیری فاتمی گەیشتە لای نورەددین مەحمود لە شام و داوای یارمەتی لێکرد دژ بە وەزیر (ضرغام)، کە خاچپەرستانی هێنابوونە ناو میسر و لە دەستی فاتمییەکانی دەرهێنابوو. نورەددین مەحمودیش شێرکۆی بە سەرکردایەتی سوپایەکی گەورە نارد، دوای ئەو خەلیفەی فاتمی شێرکۆی بە وەزیری خۆی دانا لە میسر. بەڵام مەرگ دەرفەتی زۆری پێنەدا و دوای سێ مانگ لە وەرگرتنی پۆستی وەزیری، لە رۆژی (٢٢ جمادی الاخر ٥٦٤هـ) کۆچی دوایی کرد و لە قاهیرەشدا نێژرا. دوای ئەوە روفاتەکەی گواسترایەوە بۆ شاری مەدینەی پیرۆز، ئەویش لەسەر وەسیەتی خۆی. لەدوای خۆیدا تاقانە کوڕێکی بەجێهێشت[٩٦].

—**ضیاءالدین بن عثمان بن درباس الکوردي**: ئەو ئەبو عومرو زیائەددین کوڕی عیسا کوڕی دەرباسی هەزەبانی کوردییە، ناسراو بووە بە مارانی. زانا و شارەزا بووە لە مەزهەبی ئیمام شافعی. هەروەها برای قازی سەدرەددین ئەبی قاسم عەبدلمەلیك بووە، کە حاکمی دادگای میسر بووە. بۆیە چۆتە جێی براکەی لە میسر، کاتێك کە ئەو منداڵێکی بچووك بووەو لە هەولێر لە کوردستانی عێراق کاری کردووە. میر جەمالەددین جسرانی هەکاری رێگای پێداوە قوتابخانەیەك لە ناو کۆشکی میسر دروست بکات، بۆ ئەوەی وانەی تێدا بڵێتەوە، ئەویش لەوێدا خەریکی وانە گوتنەوە بوو تا لە (١٢ ذی القعدة ٦٠٢هـ) لە تەمەنی نزیك نەوەد ساڵی کۆچی دوایی کردو لە قاهیرەدا نێژرا[٩٧].

– جويرية: کچی هەکاری بوو، لە ساڵی (٦٢٢ك) لە میسر لەدایك بووە، قسەزانەکە بەناوبانگ بووە، ئەو زمان پاراوی و قسەزانییە لەسەر دەستی عەلی کوڕی نەسروڵلای کوڕی عومەری قەرشی میسری فێربوو، لە ساڵی (٧١٢ك) لە تەمەنی نەوەد ساڵی[٩٨] کۆچی دوایی کردووە.

## کۆتایی دەوڵەتی ئەیوبی کوردی:

کاتێك کە توران شا کوڕی سوڵتان نەجمەددین ئەیوب لە ساڵی (٦٤٧ك/ شوباتی١٢٥٠ز) گەیشتە شاری مەنسورییە، دوای مردنی باوکی، بڕیاریدا خۆی ببێت بە سوڵتان بەسەر میسر و شام، ئەوە لەکاتێکدا کە ئەو لە ڕێگادا بوو بەرەو قاهیرە، بۆیە ورەی ئەو جەنگاوەرانە بەرز بووەوە کە بەرامبەر بە لویسی حەوتەم و لە حەوتەم پەلاماری خاچپەرستان بۆ سەر میسر ڕاوەستابوون. بۆیە خەڵکەکە بەدەرکەوتنی ئەو دڵنیا و ئاسوودە بوون[٩٩].

توران شا توانی لە جەنگی (فارسکور) بەسەر لویسی حەوتەم مەلیکی فەڕەنسا دا سەرکەوێت و خاچپەرستانیش بە دیلی گیران. مەلیکی فەڕەنسی لویسی حەوتەم لەناو دیلەکاندا بوو، لە ماڵی (قاضي ابن لقمان) لە مەنسورییە بەند کرا[١٠٠]. لە بەرامبەر ئازادکردنی لویسی حەوتەمدا مەرجیان بەسەردا سەپاند کە دەبێ پارەیەکی زۆر لەجیاتی خۆی و لە جیاتی سوپا فەڕەنسییەکەی بدات.

دوای کشانەوەی فەڕەنسییەکان لە میسر، دەستەیەك لە مەمالیکەکانی بەحری دەستیان کرد بە ئەنجامدانی تاوانی قێزەون و توران شاشیان کوشت.

**هۆی کوشتنەکەی:** چەند کردارێك لە توران شاوە ڕوویاندا کە بووە مایەی ڕاچڵەکاندنی دڵەکان، بۆیە بۆ کوشتنی کۆبوونەوە. لەوانە: ئەو خۆی لە خەڵك دوورەپەرێز کردبوو، لەگەڵیان دانەدەنیشت و بە گێلی دەزانین و گاڵتەی پێ دەکردن. وە زۆر مەی دەخواردەوە و کاتێکیش کە سەرخۆش دەبوو، کۆمەڵێك مۆمی دەهێنان و شیرەکەی دەدەست دەگرت و سەری مۆمەکانی دەپەڕاند و دەیگوت ئاواش بە مەمالیکەکانی بەحری دەکەم و دەیانکوژم. هەروەها لە

**هۆكارەكانی كوشتنەكەی:**
پەیمانی بە (اقطای) جەنگاوەری مەمالیكی دا بیكاتە فەرماندەی سوپا، بەلام پەیمانی خۆی لەگەڵدا بەجێ نەهێنا. هەروەها یەكێك لە هۆكارەكان ئەوە


( شجرة الدر )

بوو كە، كاتێك توران شا گەیشتە قاهیرە، (شجرة الدر)[101] ی زڕدایكی لە قودس دا مایەوە، ئەویش هەواڵی بۆ نارد و هەڕەشەی لێكرد كە سامان و خشڵ و گەوامیراتی بۆ بنێرێ! ! ئەمیش لێی ترسا و مەمالیكەكانی بەحری لە دژدا دنە دان. بۆیە هەموویان لەسەر كوشتنی رێككەوتن. كە وەختیشی هات، سفرەیەكیان بۆ راخست تا لەسەری دابنیشێ، جا هەندێك لە مەمالیكەكان دایانە بەر شیر و ئەویش دەستی دایە بەر شیرەكانیان و پەنجەكانی دەستی پەڕین و بەغار رایكردە لای قوللە دارینەكە، كە لە فارسكور بۆی دروست كرابوو (فارسكور شارێكە سەر بە پارێزگای دمیاتی ئێستا). لەسەر قوالەكە بە دەنگێكی بڵند هاواری كرد كێ بوو منی كوشت؟ گوتیان (الحشیشیة)[102] بوون. (**حەشیشیەكان گرووپێكی ئیسماعیلی نزاری بوون و لە پەیڕەوانی نزاری كوڕی موستەنسر بیللا بوون، كە لە سەدەی هەشتەمی زایینی لە فاتمیەكان جیا ببوونەوەو حەسەن كوڕی سەباح دامەزرێنەری بوو. دەگوترێ كە یەكەم كەس ناوی حەشیشیەكانی بەسەردا بڕیبێ، ماركۆ پۆلۆ بووە، لەكاتی گەشتەكەی بۆ قەڵاكەیان قەڵای ئەلەمووت. ئەو گرووپە دوای وەرگرتنی حەشیشەی بێهۆشكەر، كردەوەی خۆكوژیو تیرۆریان دژی سەلجوقیەكانو ئەییوبیەكان ئەنجام دەدا– لە سایتی ویكپیدیاوە–و**). گوتی نا بەخوا كەس منی نەكوشت مەمالیكەكانی بەحری نەبێ، بەخوا كەسیان لێ ناهێڵمو

هەڕەشەی ئێ دەکردن. مەمالیکەکان بە یەکتریان گوت با لەناوی بەرین دەنا تەفر و تونامان نەکات. بۆیە لە قوللە دارینەکە لێی چوونە ژووری، ئەویش رایکردە سەرووی قوللەکە، ئەوانیش لە خوارەوە ئاگریان بەردایە تەختە دارەکانی قوللەکە و لە خوارێشەوە تیریان تێ دەگرت، بۆیە خۆی فڕێدایە ناو دەریای فارسکور[١٠٣] و بانگیشی دەکردنێ کە هیچ موڵك و ماڵم ناوێ، لێمگەڕێن دەچمەوە حەسن کێف. بەڵام کەس داواکەی قبووڵ نەکرد و پارچە پارچەیان کرد. سێ رۆژانیش تەرمەکەی لەسەر لێواری دەریاکەدا مایەوە، کەسیش نەیدەتوانی بینێژێ، تا مەمالیکەکان لەسەر راسپاردەی نێردراوێکی خەلیفەی عەبباسی کە شەفاعەتیان بۆ کرد، ئیدی لەوێ هەڵیانگرت و بردیان لەوبەری دیکەی دەریادا ناشتیان[١٠٤].

دوای کوشتنی توران شا، (شجرة الدر)ی خێزانی مەلیك نەجمەددینی باوکی (واتە زڕدایکی توران شا) لەجێی ئەو لەسەر تەختی میسر داندرا. رۆژی هەینیش لەسەر مینبەرەکان وتار بە ناوی ئەوەوە و بۆ ئەو خوێندرانەوە. هەروەها سککەی پارەش بە ناوی ئەوەوە لێدرا. بەڵام شەجەرەتول دوڕ هەڵسا بە دانانی (عزالدین ایبك)ی سەرۆکی مەمالیکەکانی بەحری بە سەرکردەی گشتی سوپا[١٠٥].

شەجەرەتول دوڕ نەیتوانی زۆر لەسەر تەختی حوکمڕانی بمێنێتەوە، ئەویش بەهۆی ئەو ناڕەزاییە زۆرەی لەلایەن ئەمیر و سەرکردەکانەوە، تەنانەت تێکڕای رەشە خەڵکەکەش بەرەو رووی دەبووەوە و داوایان دەکرد کە یەکێ لە نەوەکانی ماڵباتی ئەییوبی ببێتە فەرمانڕەوا، کە توانییان جیهانی ئیسلامی یەکبخەن، وە سەرکردایەتی رۆژهەڵاتی ئیسلامییان بە هەموو سەروەت و داهاتەکانییەوە گرتە دەست بۆ راوەستان لە بەرامبەر یەك دوژمندا، کە خاچپەرستانێك بوون دەیانەویست وڵاتی ئیسلام داگیر بکەن. لە کۆتاییدا بڕیاردرا کە مەلیك ئەشرەف موسا کچەزای مەلیك کامل و برازای ئەمیر ئەییوبی

لەیەمەن لەجێی شەجەرەتول دوڕ بکرێتە فەرمانڕەوا. ئەوەش لەساڵی (٦٤٨ك/ ٥ ئابی ١٢٥٠ز) بوو، بەڵام حوکمڕانی و هەڵسوڕاندنی کاروبارەکان هەمووی لە دەستی سەرکردەی گشتی سوپا عزەددین ئەیبکی تورکمانی دا بوو.

لە ساڵی (٦٥٣ك/١٢٥٤ز) عزەددین ئەیبك سەربەخۆیی تەواوی حوکمی میسری ڕاگەیاند و مەلیك ئەشرەفی موسای وەلاناو ناردیەوە بۆ یەمەن بۆ لای خزمانی. بەمجۆرە دەسەڵاتی حوکمڕانی ئەییوبییەکان بۆ غوڵامە مەمالیکەکان گواسترایەوە[١٠٦].

بۆیە دوای کوشتنی توران شا لە ساڵی (٦٤٨ك/١٢٥٠ز)، دوا بزمار لە تابووتی دەوڵەنی کوڕانی ئەییوبی کوردی لە میسر درا، دوای حوکمڕانییەك کە هەشتاو یەك ساڵ بەردەوامی کرد[١٠٧].

ڕووخانی دەوڵەتی ئەییوبی لە میسر مانای لەناوچوونی ئەو کوردانە ناگەیەنێ، کە بە لێکدابڕان و بە ڕاگواستن هاتبوونە ناوی، ئەم ڕاستییەش چەند شتێك ڕوون ئەکەنەوە، وەك:

**یەکەم:** تەمەنی دەوڵەتی ئەییوبی لە هەشتا ساڵ تێپەڕی، پشتقایمی سەربازی دەوڵەتی ئەییوبی بە سەرباز و سەرکردە کوردەکانەوە بوو. ئەو ماوەیە سێ نەوەی لە دوای یەکتری گرتەوە، نەوەی نوێی کوردی جێی نەوەی پێشتری کوردی ئەگرتەوە. کەچی لەو سەردەمەی ئەییوبییەکاندا نەمانبیستووە بزووتنەوەیەکی هەڵگەڕاوەی کوردی ڕوویدات. واتە نەمانبیستووە دیاردەیەکی ئاشکرا ڕوویدابێ لەو کوردانە کە دوای بەجێهێنانی خزمەتەکانیان لەناو سوپا، بە دەستەجەمعی گەڕابنەوە بۆ وڵاتی خۆیان. بەڵکو بە پێچەوانەوە، لە سەلاحەددین و فەرمانڕەوا ئەییوبییەکانی دوای ئەویش دەگێڕنەوە کە وەك بەخشش و چاکەدانەوە لە هەمبەر کۆتایی هێنان بە خزمەتی ئەو سەرباز و سەرکردە کوردانەی کەوتبوونە ناو ساڵەوە یان نەخۆش کەوتبوون، لە شوێنە جیاجیاکانی میسر کێڵگە و پارچە زەوی پانو بەرینی پێ بەخشیون، بۆ

ئەوەی کشتوکاڵی تێدا بکەن و بەرەکەی بچنن. ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر بنەچەی رەسەنی کوردی زۆر لەو خێزانە کوردانەی کە لە پارێزگاکانی میسریدا بڵاوبوونەتەوە. هەروەها ئەوەش دەسەلمێنێ کە ئەو ناوە کوردیانەی لە گەڕەك و گوند و شارەکان نراوە بۆ بوونی ژمارەی زۆری کوردان لەو ناوچانە دەگەڕێتەوە. ئەم بابەتەش لە دوا بەشی کتێبەکەدا روون دەکەینەوە.

دووەم: بوونی کورد لە میسر تەنها لەسەر سەبازە کوردەکان کورت نابێتەوە. دوای رەخسانی دەرفەتی گرتنەدەستی کۆڵەگەکەکانی دەوڵەتی ئەیوبی لەلایەن سوڵتان سەلاحەددین ئەییوبی، دەرگای بە رووی بازرگانە کوردەکانو خاوەن بەرژەوەندییەکان کردەوەو هاتنە ناو میسر. هەندێکیان بە ژیانی ئەوێ سەرسام بوون، بۆیە چوون کەسوکار وماڵباتەکانیشیان هێناو لەوێ نیشتەجێ بوونو بەهۆی ژنو ژنخوازیو وەچە نانەوەش، بوون بە هاوڵاتی کۆمەڵگای میسری.

سێیەم: بەو پێیەی کە قاهیرە بنکەو قیبلەگای دامەزراوە زانستییەکان (ئەزهەری شەریف) بووە، بۆیە ژمارەیەکی زۆری ئەو قوتابیو زانایانەی کورد کە خوازیاری زانستو فێربوون بوون، روویان دەوێ دەکرد. بە تایبەتی لە سەردەمی مەمالیکەکان. زۆرێکیش لە مێژوونووسان ئەو سەردەم بە سەردەمی زێڕینی ئەزهەر دادەنێن لە میسر، ئەویش بەهۆی ئەو گرنگی پێدانە زۆرەی مەمالیکەکان و تەرخانکردنی وەقفی زۆر بۆیان.

بۆیە، رووخانی دەوڵەتی ئەییوبی لەناوچوونی کورد نییە لە میسر، بەڵکو دوای ئەوەش کۆچی کوردان بۆ میسر بەردەوامی هەبووەو رانەوەستاوە. راستە کە بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی ئەییوبییەکان لە کەمی داوە، بەلام نەپچڕاوە. زۆر هۆکاریش هەبوونە بۆ ئەوەی هانیان بدەن تا کۆچی بۆ بکەن، لەوانە: ئەو دۆخە سیاسی و ئابوورییەی ناوچە کوردییەکان لەناو شەڕ و ململانێ تێیدا دەژیان، وای لەوانە دەکرد کە حەزیان لە ژیانی ئاسوودەییە روو لە میسر و

ولآتانی دیکە بکەن، بە تایبەتی کە زانبیان ژیانیان لەوێ سەقامگیرە و لە دڵنیایی دان. هەروەك چۆن کەسی میسریش دڵ و سنگ فراوان بووەو هەموو ئەوانەی روویان تێدەکردن دەیانگرتنەخۆ و لێیان هەڵنەئەهاتن، بەڵکو لەناو بۆتەی خۆیاندا تێکەڵیان دەکردن. هەروەها پێگەی ناوچەکەش وەك کە بیرمەندی گەورە (دکتۆر جەمال حەمدان) لە ئینسکلۆپیدیاکەی باسی لێوە کردووە، رۆڵی هەبووە. چونکە شوێن و پێگەی میسری کە لە ناوەڕاستی جوگرافیای کیشوەرەکانی جیهانی کۆن بووە، وایکردووە میسر ببێتە جێی تێڕامانی دونیا. بۆیە هەموو ئەو هۆکارانە وایان کردووە کە کەسایەتی کوردی تێدا بدرەوشێتەوەو نامۆ نەبێ بە خاك و خەڵکەکەی.

## حەوتەم: شوێنەواری کوردە ئەیوبییەکان لە میسر:

**بیری سەلاحەددین یوسف**: کە ناسراوە بە بیری یوسف، سوڵتان سەلاحەددین یوسف ئەیوبی لە ساڵی (٥٧٢-٥٨٩ك/ ١١٧٦-١١٩٣ز) دروستی کردووە. دەکەوێتە ناوچەی قەڵا، ئەودیو مزگەوتی ناسر محەمەد کوڕی قەلاوون لە ( قلعة الجبل)[١٠٨].

**قوتابخانەی کاملییە**: لەلایەن سوڵتان کامل محەمەد کوڕی عادل ئەیوبی لە ساڵی (٦٢٢ك/ ١٢٢٥ز) دروست کراوە، دەکەوێتە شەقامی (المعز لدين الله) لە گەڕەکی جەمالییە لە قاهیرە. هەموو ئەو بەشانەی کە سوڵتان کامل محەمەد کوڕی عادل لە سەردەمی ئەیوبی دروستی کردبوون لەناوچوون، میر حەسەن کەتخودای شەعراوی لە سەردەمی عوسمانی، گۆشەیەکی بۆ نوێژکردن لەسەر رووبەرێکی بەرامبەر هەیوانی رۆژهەڵات کردەوە، چونکە ئەو قوتابخانەیە لە بنەڕەتدا لە دوو هەیوان پێکهاتبووە، یەکێکیان لە بەری باکووری





خۆرئاوا و ئەوەی تریان لە باشووری رۆژهەلات، لە ناوەڕاستیشیاندا حەوشەیەکی کراوە هەیە، بەلام ئێستاکە دیوارەکانی رماوەو جگە لە پاشماوەکانی هەیوانی رۆژئاوا هیچی لێ نەماوەتەوە[١٠٩].

دەرگای قەرافە: (بە قەرافەی فستاتیش ناودەبردرا، ئەویٚ گۆرستانی کۆنی ئیسلامەکان بووە لە باشووری قاهیرە لەبن چیای مەقتەم، کە بریتییە لە کۆمێك خۆلّ و گۆڕ و قوببەی شوێنەواریی کۆن، کە بە توحفەی هونەری دەگمەن دادەنرێن، نەك تەنها بە گۆڕستان. لە بنەچەشدا قەرافە ناوی هۆزێکی یەمەنی بووە لە نزیك گۆڕستاندا ژیاون و دواتر بە هەموو گۆڕستانێکیان گوتووە قەرافە - لە سایتی ویکیپیدیاوە - و ) لەلایەن سولّتان سەلاحەددین یوسف کوڕی ئەییوب لە سالّی ( ٥٦٦-٥٧٢ك/ ١١٧٠-١١٧٦ز) دروست کراوە، دەکەوێتە شەقامی سەلاح سالم لە دەستەڕاستی دەرگای قایتبای (قایتبای مەحمودی ئەشرەفی سولّتانێك بووە لە مەمالیکەکانی بورجی، لە مەمالیکە چەرکەسییەکان- لە ویکیپیدیاوە- و) لە گەڕەکی خاتوو عائیشە[١١٠].

**قوببەی ئیمام شافعی:** لە سالّی (٦٠٨ك/ ١٢١١ز) لەلایەن سولّتان کامل محەمەد کوڕی عادل دروست کراوە. دەکەوێتە شەقامی ئیمام شافعی لە مەیدانی ئیمام شافعی/ قەرافەی گچکە لە ناوچەی میسری کۆن‌و فستات[١١١].


( قوببەی ئیمام شافعی)

**قوتابخانەی نەجمەددین ئەییوب:** لەلایەن سولّتان نەجمەددین ئەییوب لە سالّی (٦٤١-٦٤٧ك/ ١٢٤٣-١٢٤٩ز) دروست کراوەو دەکەوێتە شەقامی (المعز لدین الله) لە

جەمالییەی باکووری قاهیرە. ئەمە یەکەم بینا بووە لە میسر بۆ خوێندنی هەر چوار مەزهەبەکە. خاتوو شەجەرەتول دوڕیش قوببەیەکی بۆ سوڵتانی چاکەکار نەجمەددینی هاوسەری دروست کردووە. لە رووە سەرەکییەکە بترازێ کە کەوتۆتە ناوەڕاستی مینبەری بانگدان و هەندێك پارچەی هەیوانی رۆژئاوا هیچی تر لە پاشماوەی ئەو قوتابخانەیە نەماوە[١١٢].

**قوتابخانەی سەلاحییە:** لە ساڵی (٥٨٧ك/ ١١٩١ز) لەلایەن سوڵتان سەلاحەددینەوە دروست کراوەو دەکەوێتە تەك گۆڕی ئیمام شافعی لە قەڕافە.

**قوتابخانەی قەمحییە:** هەر لەلایەن سەلاحەددینەوە لە ساڵی (٥٦٦ك/ ١١٧٠ز) دروست کراوەو دەکەوێتە تەنیشت مزگەوتی کۆن (مزگەوتی عومرو بنی عاس). ئەو قوتابخانەیە تایبەت بووە بە پەیڕەوانی مەزهەبی مالکی.

**قوببەی خەلیفەکانی عەبباسی:** لەلایەن خاتوو شەجەرەتولدوڕ لە ساڵی ( ٦٤٠ك/ ١٢٤٢ز) دروست کراوە. دەکەوێتە باشووری قاهیرە، پشت مەزاری خاتوو نەفیسە[١١٣].

**قوتابخانەی ناسرییە:** لە ساڵی (٥٦٦ك/١١٧٠ز) لەلایەن سوڵتان سەلاحەددین دروست کراوە، دەکەوێتە شوێنی بەندیخانەی (المعونة) لە تەنیشت مزگەوتی عومروی کوڕی عاسە، ئەو قوتابخانەیە تایبەت بووە بە شوێنکەوتووانی مەزهەبی شافعی.

**(قلعة الجبل):** بە قەڵای سەلاحەددین بەناوبانگە. لە ساڵی (٥٧٢– ٦٠٤ك/ ١١٧٦–١٢٠٧ز) لەلایەن سوڵتان سەلاحەددینەوە دروست کراوە، دەکەوێتە گەڕەکی قەڵا لە قاهیرە.

**خانەقای سەعید ئەلسوعەدا:** ئەو خانەقایە دەکەوێتە شەقامی جەمالییە لە تەنیشت قوتابخانەی جەمالییەی سەرەتایی، ئەو خانەقایە لە بنەڕەتدا خانووێك بووە چەندین کەس لە سەردەمی فاتمیەکان تێیدا نیشتەجێ بوونە. دواتر سەلاحەددین فەرمانی کردووە کە بکرێتە ماڵی سۆفییان، بۆیە کراوەتە

وەقفی سۆفییە هەژارەکانی تێکڕای وڵاتانی جیهانی ئیسلامی. دواتر لە ساڵی (٥٩٢ك/ ١١٩٦ز) لەلایەن عەزیز عوسمان کوڕی سەلاحەددین نۆژەن کراوەتەوەو چەند وەقفێکی لەسەر داناوە، لەوانە وەکالەتێکی شاری دەسسوق بەهەمان دەقە بنەڕەتیەکەیەوە لەسەر ماڵی سەعید ئەلسوعەدا لە مەحروسەی قاهیرە، وەقف کراوە. بەڵام لە سەردەمی ئەشرەفی قایتبای، شکڵ و شێوەی ئەو ماڵە گۆڕاون. ئەویٚ پێکهاتووە لە حەوشە و گۆڕەپانێك کە چوار هەیوانی بەسەردا دەڕوانن، واتە نەخشەسازییەکی ستوونییە، هەیوانی باشووری خۆرئاواشی هەرە گرنگەکەیانە، ئەویش کراوەتە سیٚ داڵان، لەسەر دار خورمایەکی گەورەی قاپۆڵ پێنج گرێش بەسەر حەوشەکەدا شۆڕ بۆتەوە، کە چوار پای بەردینی بەنرخی بەبندا هەڵکراون، مینبەری بانگدان کەوتۆتە ئەو هەیوانەوە.

---

٣٢- د.سعيد عبدالفتاح عاشور: الايوبيون والمماليك في مصر والشام، دار النهضة العر ١٩٩٦م،ص٩.

٣٣- ابن الاثير: الكامل في التاريخ، تحقيق عبدالله القاضي، دار الكتب العلمية، بيروت، الطبعة الثانية، ج ٩ ص٤٤٩.

٣٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣٥- ئەسەدەددین شێرکۆ: ناسناوەکەی "ابو الحرب"بووەو بە مەلیك مەنسور ناسراوە، ئەو کوڕی شادی، کوڕی مەروانە و مامی سەلاحەددین ئەییوبییە. بڕوانە: وەرگێڕانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "مشاهير الكرد والكردستان"ی محەمەدەمین زەکی بەگ. دار الزمان، دیمشق، (٢٠٠٦م، ج١، ص ٢٥٧).

٣٦- د. سعيد عبدالفتاح عاشور: الحركة الصليبية، دار المصرية للتاليف والترجمة، ١٩٦٤م، ج ١، ص٥٣٢. هەروەها: وەرگێڕانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "خلاصة تاريخ الكرد والكردستان"ی محەمەدەمین زەکی بەگ، چاپەمەنییەکانی کۆمەڵەی لوبنانی، چاپی ٢، ٢٠٠٣ز، ب ٢، ل ١٥٦.

٣٧- سعيد عبدالفتاح عاشور: الايوبيون والمماليك في مصر والشام، ص ١٣.

٣٨- ئیتفیح دەکەوێتە پارێزگای جیزە، لەسەر لێواری رۆژهەڵاتی نیل، مەزاری حەزرەتی موسای کوڕی عمران (سڵاوی خوای لیٚ بێت)ی کەتۆتە پێش، چەندین زانای گەورەشی تێدا هەڵکەوتوون. ياقوت الحموي: معجم البلدان، الخانجي، ط١، ١٣٢٣هـ/ ١٩٠٦م، ج ١،ص ٢٢٣.

٣٩- وەرگێڕانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "خلاصة تارخ الكرد والكردستان، ج٢، ص١٥٧.

٤٠- ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت ١٤١٣هـ/ ١٩٩٢م، ج٥، ص٢٥٠.

٤١- وەرگێرانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "خلاصة تارخ الكرد والكردستان، ب٢، ل ١٥٨. بڕوانە سعيد عبدالفتاح عاشور: الايوبيون والمماليك في مصر والشام، ص ١٧.

٤٢- ابن الاثير: الكامل في التاريخ، ج١٠، ص١٣، هەروەها بڕوانە: التاريخ الباهر في الدولة الاتابكية، تحقيق عبدالقادر احمد طلمبات،ط١، دار الكتب الحديثة ١٩٦٣م، ص ١٣٨.

٤٣- سعيد عبدالفتاح عاشور: الايوبيون والمماليك في مصر والشام، ص ١٩.

٤٤- وەرگێرانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "خلاصة تارخ الكرد والكردستان"، ب ٢، ل ١٦٠.

٤٥- سعيد عبدالفتاح عاشور: الايوبيون والمماليك في مصر والشام، ص ١٩، ٢٠.

٤٦- وەرگێرانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "خلاصة تارخ الكرد والكردستان"، ب٢، ل ١٥٣. ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ج٥، ص ٢٥٥. ابن الاثير: الكامل في التاريخ، ج٩، ص١٠٢. ابن خلكان: وفيات الاعيان، تحقيق يوسف علي الطويل، ومريم قاسم، دار الكتب العلمية، بيروت ١٩٩٨م، ج٧، ص١٣٩. الحنبلي: شذرات الذهب، تحقيق عبدالقادر الارناؤوط، دار ابن كثير،ط١، ١٤٠٦هـ/١٩٨٦م، ج٤، ص٢٩٨. الزركلي: قاموس الاعلام، دار العلم، بيروت ١٩٨٠م، ج٨، ص٢٢٠.

٤٧- وەرگێرانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "مشاهير الكرد والكردستان" ، ب١، ل٧.

٤٨- وەرگێرانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "خلاصة تاريخ الكرد والكردستان" ، ب٢، ل١٥٤.

٤٩- ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ج ٦، ص٨. ابن خلكان: وفيات الاعيان، ج٧، ص٥٥١. محمد علي عوني: ترجمة لمشاهير الكرد و كردستان، ج١، ص١٢.

٥٠- رابطة ادباء كردستان .http://kurdsyria.wordpress.com

٥١- وەرگێرانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "مشاهير الكرد والكردستان" ، ب١، ل١٤.

٥٢- ابن واصل: مفرج الكروب في اخبار بني ايوب، تحقيق جمال الدين الشيال والاخرون، دار الفكر العربي ٢٠٠٠م، ج١، ص١٧٤. سعيد عبدالفتاح عاشور: الايوبيون والمماليك في مصر والشام، ص ٢٠.

٥٣- ابن :لاثير، الكامل في التاريخ، ج١٠، ص٢٢.

٥٤- سعيد عبدالفتاح عاشور: الحركة الصلي، ج٢، ص ٥٦١. سعيد عبدالفتاح عاشور: الايوبيون والمماليك في مصر والشام، ص ٢٣.

٥٥- Boris james: Saladin et les Kurdes. L"HarMattan. Mars 2006. p.111.

٥٦- تواشی: سەربازگەڵی بوونە لە پلەی یەکەم.

٥٧- قراغلام: سەربازگەڵی بوونە لە پلەی دووەم.

٥٨- رۆژنامەی (الحياة)، ل ١٩، ژمارە ١١٠٠٨، نیسانی ١٩٩٣ز. لوليا جلبي: سياحتنامه، وەرگێرانی: محەمەد عەلی عەونی، ساخکردنەوەی/ عبدالوهاب عزام، د.احمد السعيد سلمان. پێشەکی و پێداچوونەوە احمد فواد متولي/ چاپخانەی دار الكتب والوثائق القومية المصرية، ١٤٣٠هـ:٢٠٠٩ز، ل٢١٠.

٥٩- بهاءالدين بن شداد: النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية، ساخکردنەوەی جمال الدين الشيال، ط٢، مكتبة الخانجي ،القاهرة ١٤١٥هـ/ ١٩٩٤م، ص٣٤١.

٦٠- سەرچاوەی پێشوو.

٦١- كرك: دەکەوێتە سوریا. ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج٧، ص٢٣٩.

٦٢- Boris james: Op. Cit. p.109

٦٣- Ibid

٦٤- Ibid

٦٥- وەرگێرانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "مشاهير الكرد وكردستان" ب١، ل ١٢.

٦٦- الحنبلي: شذرات الذهب، ج٤، ص٢٩٨.

٦٧- ابن الشداد: النوادر السلطانية، ص٤١٠، سعيد عبدالفتاح عاشور: الايوبيون والمماليك في مصر والشام، ص١٧.

٦٨- وەرگێڕانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "خلاصة تاريخ الكرد وكردستان" ج٢،ص٢٠٦.

٦٩- ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ج٦، ص٥٧.

٧٠- وەرگێڕانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "خلاصة تاريخ الكرد وكردستان" ج٢،ص٢٠٤.

٧١- البدليسي: شرفنامة، ترجمة محمد علي عوني، راجعه و قدم له يحيى الخشاب، دار الزمان دمشق ط٢، ٢٠٠٦م، ص١٠٦.

٧٢- الخوانق : کۆی خانەقايە و وشەيەکی فارسيە . خانەقاکان لە ئيسلامدا لە سەدەی چواری کۆچی دروست کراون، سۆفيەکان کرديويانە شوێنی خواپەرستی، بەڵام لە مسردا لە سەدەی شەشەمی کۆچی دەرکەوتن.

٧٣- المقريزي: المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والاثار، حواشي خليل منصور، دار الكتب العلمية بيروت ١٩٩٨م. ج٢، ص٤١٥.

٧٤- سعيد عبدالفتاح عاشور: الايوبيون والمماليك في مصر والشام، ص ١٦٧.

٧٥- د. كمال الدين سامح: في العمارة الاسلامية مطبوعات معهد الدراسات الاسلامية.

٧٦- سعيد عبدالفتاح عاشور: الايوبيون والمماليك في مصر والشام، ص ١٦٨.

٧٧- د. نظير حسان سعداوي: التاريخ الحربي المصري، مكتبة النهضة، بغداد ١٩٥٧م ص١٠١.

٧٨- د. سعيد عبدالفتاح عاشور: الايوبيون والمماليك في مصر والشام، ص ١٦٩.

٧٩- سەرچاوەی پێشوو. ل ١٦٧

٨٠- اوليا جلبي، سياحتنامه، ترجمة محمد علي عوني، ص٢٨٨.

٨١- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨٨-٢٨٩، ل٢١٣،٢٦٩.

٨٢- ڕۆژنامەی (الحياة)، ژ١٢١٥٥، ٦ی حوزەيرانی ١٩٩٦ز، ل١٣.

٨٣- القلقشندي: صبح الاعشى، ج٣، ص٢٧٦.

٨٤- سەرچاوەی پێشوو.

٨٥- المقريزي، الخطط، ج٣، ص٤١.

٨٦- Boris james: Op. Cit. 14

٨٧- Ibid: PP. 24-25.

٨٨- Ibid: P. 55.

٨٩- محمد علي عوني: ترجمته لمشاهير الكرد وكردستان، لمحمد امين زكي بك، ج٢، ص٨٨.

٩٠- محمد علي عوني: ترجمته لمشاهير الكرد وكردستان، لمحمد امين زكي بك، ج١، ص٧٤.

٩١- سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٩-٨٠.

٩٢- سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل ١٠٦.

٩٣- محمد علي عوني: ترجمته لمشاهير الكرد وكردستان، لمحمد امين زكي بك، ج١، ص ص١٢٨- ١٢٩.

٩٤- ابو الفداء: المختصر في تاريخ البشر، تحقيق محمود ايوب، دار الكتب العلمية، بيروت ١٩٩٧م، ج٣، ص١٧٤.

٩٥- ابن خلكان: وفيات الاعيان، ص١١٧٠- محمد علي عوني: ترجمته لمشاهير الكرد وكردستان، ج١، ص ص١٩٦- ١٩٧.

٩٦- محمد علي عوني: ترجمته لمشاهير الكرد وكردستان، ج١، ص ٢٥٧، ٢٥٨، ٢٥٩.

٩٧- ابن خلكان: وفيات الاعيان، ص٣٤٤- محمد علي عوني: ترجمته لمشاهير الكرد وكردستان، ج١، ص ٣٢٢.

٩٨- السيوطي: نظم العقيان، ص١٠١.- وانظر ابن حجر العسقلاني: الدرر الكامنة، حققه الشيخ عبدالوارث محمد علي، دار الكتب العلمية بيروت ١٩٩٧م، ج١، ص٥٤٤، وانظر المشاهير، ج٢، ص٤٧١.

٩٩- المقريزي: السلوك، ج١، ص٣٥٢:٣٥١.

١٠٠- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٦.

١٠١- بە رەسەن تورکە، گوتراویشە کە ئەرمەنە، سوڵتان نەجمەددین ئەییوب بۆ خۆی کڕیویەتی، پایەیەکی بەرزی هەبووە لای سوڵتان، رۆڵێکی بەرچاویشی بینیوە لە جەنگی مەنسورە. بە یەکەمین ژنە مەلیکە دادەنرێت لە مسر کە لە مانگی سەفەری ٦٤٨ك بۆ ماوەی ٨٠ رۆژ حوکمی کردووە. دواتر بەدەستێکی چەپەڵ کوژراوەو لە گۆرستانی نزیك مزگەوتی (احمد بن تالون) لە قاهیرە نێژراوە، گۆرەکەی بە پارچەیەك توحفەی بیناسازی و هونەری جوان دادەنرێت، بۆ زانیاری زیاتر بروانە: (المقريزي: السلوك لمعرفة دول الملوك، ج١ ص٤٥٩). هەروەها بروانە (ابن تغردي بردي: النجوم الزاهرة، ج٦، ص٣٣٢ وما بعدها). هەروەها بروانە (ابن اياس: بدائع الزهور في وقائع الدهور، تحقيق محمد مصطفى، ج٧، ص٢٩٥).

١٠٢- گروپێکی باتنی ئیسماعیلی بوون.

١٠٣- تێبینی: مسریەکان بە نیل دەڵێن دەریا.

١٠٤- ابن تغردي بردي: النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، ج٦، ص٣٢٨، ٣٢٩، ٣٧١..

١٠٥- محمد علي عوني: ترجمته لخلاصة تاريخ الكرد وكردستان، ج٢، ص٢٢٦.

١٠٦- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٦-٢٢٧.

١٠٧- المقريزي: السلوك، ج١، ص٣٦١.

١٠٨- وێبسایتی شوێنەوارە قاهیرەی ئیسلامی www.cim.gov.eg

١٠٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو

١١٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١١١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١١٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١١٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# بەشی چوارەم:

## کورد لە میسر لە سەردەمی مەمالیکەکان:

یەکەم: کورتەیەك لە مێژووی مەمالیك لە میسر
دووەم: بارودۆخی کوردان لە سەردەمی مەمالیکەکان
سێیەم: ئەو ئەرکانەی کە ئەمیر و سەرکردە کوردەکان لە سەردەمی مەملوکیەکان پێیانسپێردراوە
چوارەم: هەیوانی پیاوانی کورد لە ئەزهەری شەریف

## یەکەم: کورتەیەك لە مێژووی مەمالیك لە میسر:

لە دەستپێکدا، دەمانەوێ بزانین مەمالیکەکان کێن؟

مەمالیك: لە تیرەو نەوەی ئەو سەربازانەن کە حوکمڕانی میسرو شامو عێراقو هەندێ بەشی دوورگەی عەرەبییان کردووە. زیاتر لە دوو سەدەو نیو حوکمڕانییان بەسەر میسر بەردەوام بووە. ڕێك لە ساڵی (١٢٥٠ز تا ١٥١٧ز)، قاهیرەشیان کردبووە پایتەختی خۆیان و بە دوو ماوە حوکمی میسریان کردووە، ئەوانیش:

- مەمالیکی بەحری، تورکی لە (١٢٥٠ز تا ١٣٧٢ز).
- مەمالیکی بورجی، چەرکەسی لە (١٣٧٢ز تا ١٥١٧ز).

بەناوبانگترین مەلیکەکانی دەوڵەتی مەمالیکی بەحری- تورك، بریتی بوون لە: (عزالدین ایبك، قطز، ظاهر بیبرس، المنصور قلاوون، الناصر بن قلاوون).

بەناوبانگترین مەلیکەکانی دەوڵەتی مەمالیکی بورجی- چەرکەسی، بریتی بوون لە : (سلطان برقوق، فرج برقوق، اینال، الاشرف سیف الدین برسبای، قنصوة الغوري، طومان باي)[١١٤].

میسر - ئێستاشی لەگەڵ دابێ- وەك دایك ئامێزی بۆ هەمووان کردۆتەوە، ئەوەی کە بۆی چووە گرتوویەتیە خۆی و تێیدا جێگیر بووە و تێکەڵی کۆمەڵگای ڕەسەنی میسری بووە. لەسەر بنچینەی ڕەگەز، ڕەگ و ریشە و ڕەسەنایەتی، جیاوازی لەنێوان ئەم و ئەودا نەکردووە. میسر مەمالیکەکانی لە ئامێزدا گرتن و تیایدا ژیان و حوکمیشیان تیادا کرد، لەگەڵ نەوەی ڕەوەندی دیکەدا ژیان، وەك عەرەب، عەجەم، تورك، کورد، چەرکەس و تورکمان...هەموویان یەك ئاڵا سێبەری بەسەردا دەکردن، کە ئاڵای میسری دایك بووە.

**بنەچەی مەمالیکەکان:**

سەرەتا ناوی مەمالیك لەو دیلە رەنگ سپییانە دەنرا، کە لە شەڕدا دەگیران، یان ئەوانەی لە بازاڕەکاندا دەکڕدران. دواتر ئەو ناسناوە بەسەر مەلیکە کۆیلەکانی میسر دا بڕا (**ئەو مەمالیکانە پێشتر سەربازی بە کۆیلەگیراو بوونە لە میسر، دواتر خۆیان کۆکردۆتەوەو دەسەڵاتیان وەرگرتووەو خۆیان کردۆتە مەمالیك بەسەر میسر، کە دوو جۆر بوونە، مەمالیکی بەحری‌و مەمالیکی بورجی– و**). ئەگەر بمانەوێ بنەچەی مەمالیکەکان بزانین، دوو رامان لەپێشن:

**یەکەم:** دەڵێ مەمالیکەکان لەسەردەمی حوکمی خەلیفەی فاتمی (عزیز باللە) لە میسردا بەدەر کەوتن.

**دووەم:** دەڵێ مەمالیکەکان ئەوانەن کە لەلایەن سوڵتانی چاکەخواز نەجمەددین ئەییوبی کوردی[115] لە قەفقاس و ئاسیای بچووك هێنراونەتە میسر. بەپێی ئەو رایە، بنەچەی مەمالیکەکان لە تورك، رۆم، ئەوروپی و چەرکەسییەکانە. ئەییوبییەکان بۆیە هێناویانن تا سوود لە تواناکانیان ببینن[116].

هەرچی سەبارەت بە سوڵتانەکانی دەوڵەتی مەمالیکی بەحرییە، ئەوا لە ساڵی (١٢٥٠ز) بە شەجەرەتولدوڕی تورکی یان ئەرمەنی دەست پێدەکەن‌و لە ساڵی (١٣٨٢ز) بە زەینەددین حاجی کۆتاییان دێت. سوڵتانەکانی دەوڵەتی مەمالیکی بورجیش لە ساڵی (١٣٨٢ز) بە زاهر برقوق دەست پێدەکەن‌و لە ساڵی (١٥١٧ز) بە عادل تۆمان بای کۆتاییان دێت[117].

**دووەم: بارودۆخی کوردان لە سەردەمی مەمالیکەکان:**

وەك لای هەمووان ئاشکرایە کە ئەییوبییەکان کوردن. لە بەشی رابردووشدا روونمان کردەوە کە چۆن بارودۆخ رێگای بە زۆر لە کوردەکان دا تا بۆ میسر کۆچ بکەن‌و تێیدا نیشتەجێ ببن و لە زۆر بواری سیاسی، کارگێڕی، سەربازی، بیناسازی، رۆشنبیریدا سەرقاڵ بوونە. لەناوبردنی دەوڵەتی ئەییوبیش مانای لەناوچوونی رەگەزی کوردی ناگەیەنێ لە میسردا. بەڵکو بە پێچەوانەوە،

مەمالیکەکان ئەوانیان بە مامۆستای خۆیان دەزانی کە کڕیبوونیان و فێریان کردبوون و مەشقیان دابوون. بۆیە سوور بوون لەسەر ئەوەی کە رەگەزی کوردی لەناو پێکهاتەی کۆمەڵگای میسری نەرمو نیاندا بمێنێتەوە.

کەوابوو دەمانویست باس لە بوونی کورد بکەین لە سەردەمی مەمالیکەکان، دەبینین هەندێکیان زانا و هەندێکیان سەرکردەن، مەمالیکەکان لە سوپا و لە بەڕێوەبردندا سوودیان لێ بینیون. لە ناویاندا: عومەر کوڕی خەلیلی کوردی[118].

لەم بارەیەوە بوونی کورد لە میسر زۆر بەرچاو بووە و ژیانی میسری دەوڵەمەند کردووە و کاروانی شارستانییەتی تەوا کردووە. لەناو ئەوانو خەڵکی میسریش هاوسەرگیری و ژن و ژنخوازی هەبووە، نەوەکانیشیان کە تا ئێستا لەدوایان بەجێ ماون، تا ئێستا باپیرانی خۆیان و ئەو بەخششانەی پێشکەش بە میسریان کردووە، هەر وەبیریانە.

## بەناوبانگترین ئەو کوردانەی میسر لە سەردەمی مەمالیکەکان:

**ابراهیم امدي:** ناوی فەخرەددین ئیبراهیم ئیسحاق کوڕی یەحیا کوڕی ئیسحاقی ئامەدی، هەروەها دیمەشقییە، لە ساڵی (٦٩٥ك) لە دایك بووەو لە ئەسکەندەرییە خوێندوویەتی، زانایاکی قسەزان و رەوانبێژ بووە. ساڵی (٧٧٧ك) لە میسر کۆچی دوایی کردووە[119].

- **ابراهیم الشیخ ابراهیم:** کوڕی محەمەد عەمادییە، ناسراو بووە بە (بورهانەددین کوڕی کبائی دیمەشقی) لە (١٥ ربیع الاخر ٩٥٤هـ) لە دیمەشق لەدایك بووە. دواتر هاتۆتە میسر، بە زاناکان ئاشنا بووە، ساڵی (١٠٠٨ك) کۆچی دوایی کردووە[120].

- **ابو الفداء:** ئەو مەلیك ئیسماعیل کوڕی عەلی ئیمام عالمولسوڵتان عیمادەددین ئەبولفیدا کوڕی ئەفزەڵ کوڕی مزەففەر کوڕی مەنسور- خاوەنی حەماە-یە، **(حەما چوارەم پارێزگای گەورەی سوریەیە لە دوای دیمەشقو حەلەبو حەمس، بە شاری ئەبولفیداش ناسراوە، یەکێکە لە کۆنترین شارەکانی**

دونیا و مێژووەکەی بۆ بەر لە زایین دەگەڕێتەوە، وە بە یەکێك لەشارە کەنعانییەکان دێتە ژمار– لە ویکیپیدیاوە– و)، کەوابوو ئەو لە ماڵباتی ئەییوبییە کوردیەکانە. خاوەنی کتێبی "التاریخ والمورخون في الاسلام" دەربارەیدا نووسیوەو دەڵێت" ئەو لە رادەبەدەر زیرەك بووە، خودان زانستێکی زۆر بووە، لەجەنگیشدا ئازاو قارەمان بووە. ئەو لە نەوەکانی شەهنشای برای سوڵتان سەلاحەددین بووە، لەساڵی( ٦٧٢ك) لە شام لەدایك بووەو تێیدا خوێندووە، دواتر لە سوریە هونەرەکانی جەنگی خوێندووە، کە ئەوکات تەمەنی لە دوازدە ساڵ تێپەڕ نەکردووە، بەو پێیە، ئەوا ئەبول فیدا هەر لەتەمەنی منداڵییەوە قارەمان بووە، وەك هەمیشە کە ئەوە حاڵی کوردەکان بووە. حاکمی میسرو سوریە مەلیك ناسرِ ئەوی وەك ئەمیر دانایە سەر حەما، دوای وەرگرتنی ئەرکەکەی لە حەما، زوو خۆی گەیاندە قاهیرە، تا سوپاسگوزاری خۆی رابگەیەنێ، لەلایەن حاکمی دەسەڵاتداری میسریشەوە باشترین پێشوازی لێکراو ناسناوی مەلیکی پێ بەخشی. بۆ جاری دووەمیش لەساڵی (٧١٩ك) گەڕایەوە میسر، تا لە (٢٧ المحرم ٧٣٢هـ / ١٢٣١ن) کۆچی دوایی کردووە[١٢١]. یەکێك لە گرنگترینو رازاوەترین شەقامەکانی گەڕەکی زەمالیکی لە قاهیرە بەناو کراو چەندین شەقامی دیکەش ناوی ماڵباتی ئەییوبییان لێ نراوە. وەك: شەقامی سەلاحەددین ئەییوبی، شەقامی نەجمەددین ئەییوب، شەقامی کامل محەمەد.

– احمد الحريري: کوڕی ئیسماعیل کوڕی عەبدوڵڵای شهابی تەبیبە، لەپزیشکیدا کاری کردووە، حەزیشی لەئەدەب بووە، زۆریش نزیك بووە لەزاهیر بەرقوقی فەرمانڕەوای میسر لەسەردەمی مەمالیکەکان. لە زۆر بوارو پۆستدا کاری کردووە، لە(١٥ ذى القعدة ٨٠٩هـ) لە میسر کۆچی دوایی کردووە[١٢٢].

– احمد الكردي: کوڕی ئەحمەدەو نەوەی دەرباس فەخرەددین ئەبو ئیسحاقی مازانی کوردی قاهیرەیە. زۆر کتێبی نووسراوی هەن، لەوانە "تعليق التعليق"و

"قراءة الكمال"، له دوای باپیرەی بۆتە دادوەری میسر، ساڵی (٨١٧ك) له میسر کۆچی دوایی کردووە[١٢٣].

- **حسین الخلاطي**: کوڕی زانای بەناوبانگ یوسف کوڕی عەلییە، لەساڵی (٨٩٥ك) لەدایك بووە، زۆری لەبارەی زانستەوە خوێندووە، دواتر خەریکی وانەگوتنەوەو دادوەری بووە لەجزیرێ بۆتان لەکوردستانی تورکیا. پاشان رۆیشتۆتە قاهیرە. ماوەیەك لەوێ ژیاوە، پاشان بە مەبەستی حەجی ماڵی خوا رووی کردۆتە مەککە، بەڵام لەساڵی (٩٥٨ك) لەکاتی گەڕانەوە لەرێگای حەج کۆچی دوایی کردووە. یەکێکیش بووە لە هەرە گەورە زانایانی سەردەمی خۆی[١٢٤].

- **الامیر حسین الکردي**: لە سەردەمی مەمالیکەکان سەرکردەی سوپای میسر بووە، ساڵی (٩٢١ك) رۆیشتووە بۆ یەمەن، دواتر شاری جەددەی کردۆتە بنکەو بارەگای لەشکرەکەی و زۆر قایمی کردووە. پاشان گەڕاوەتەوە میسر. کاتێکیش کە دەوڵەتی مەمالیکەکانیان لەناو برد، سوڵتان سەلیمی یەکەم شەریفی مەککە، فرمانی دا بە کوشتنی ئەمیر حوسێنی کوردی، بۆیە شەریفی مەککە لەپڕدا میر حوسێنی قۆڵبەست کرد و بردی نوقمی دەریای بەرامبەر جەددەی کرد[١٢٥].

- **الشیخ خضر الکردي**: کوڕی ئەبی بەکری کوڕی موسایە، کەراماتدار بووە، هەتا مەلیك زاهیر بیبرسیش باوەڕی بە کەراماتەکانی هەبووە، بۆیە خۆشیویستووەو لەخۆی نزیك کردۆتەوە. بەڵام لەدوا رۆژگارەکانی ژیانی دڵی لێ گۆڕاوە و بەندی کردووە، لە ساڵی (٦٧٦ك) لە بەندیخانەدا مردووە. زۆر شوێنەواری گرنگی لەپاش بەجێ ماون، ئەو زۆر دلێر و دڵنەوا بووە[١٢٦].

- **شریف الکردي**: ناوی عەلی کوڕی مەحمودە و لە ساڵی (٨١١ك) لە حەلەب لەدایك بووە. دوای تەواوکردنی خوێندنی زانستە سەرەتاییەکان، لەساڵی (٨٣٤ك) چۆتە میسر. وەك مامۆستا لە بواری سۆفیگەری لەزانکۆی ئەزهەری

شەریف کاری کردووە، یەکێك بووە لەکەسە هەرە نزیکەکانی سولتان ئەشرەفی قایتەبای، بۆیە لە حەلەب کردوویەتی بە جێگر و لەوێ ماوەتەوە، دواتر گەڕاوەتەوە قاهیرە و لەوێ کۆچی دوایی کردووە[127].

− **عبدالرحيم بن صدقة بن ايوب:** ناوی زەین کوڕی فەتح کوڕی شەڕەف، بە رەسەن کوردەو زێدەکەی قاهیرەیەو لە ساڵی (٨٤٤ك) لەمیسر لەدایك بووە. لەوێوە فێری زانست بووە، یەکێك بووە لەوانەی لەمیسر وانەی فەرموودەی گوتۆتەوە[128].

− **الشيخ عبدالقادر الكردي:** کوڕی شێخ یوسفی کوردی حەلەبی شافیعیە. فقهی لەلای شێخ عوسمانی کوردی خوێندووە، هاتۆتە قاهیرەو تیایدا ماوەتەوە. زانایەکی زۆر پایە بڵند بووە. لە ساڵی (٨٩٦ك) لە میسر کۆچی دوایی کردووە[129].

− **عمر بن خليل الكردي:** یان قاهیری شافیعی، هەروەها ناسناوی (ابن المشطوب) یشی پێیدەگوترا، چونکە روومەتی باوکی رووشابوو. ساڵی (٨٠٠ك) لەقاهیرە لەدایك بووەو تێیدا خوێندوویەتی، خەریکی وانە گوتنەوە بووە لە میسر، هەر لە میسریشدا لە ساڵی (٨٨٨ك) کۆچی دوایی کردووە[130].

− **يوسف الهذباني الكردي:** ناسراو بە میر جەمالەددین، یەکێك بووە لەمیرەکانی کورد لە میسر. لەساڵی (٧٠٤ك) لەمیسر لەدایك بووە. لەسەردەمی سوڵتان ناسر محەمەد کوڕی قەلاوونی مەملوکی، میر بووە. هەروەها لە قەلادا جێگری ئەو بووە[131].

− **اسماء:** کچی ئەحمەد کوڕی ئەحمەدی کوڕی حوسێنی هەکارییە. لەساڵی (٧١٥ك) لەمیسر لەدایك بووە، هەر لەوێ فێری وتاربێژیو رەوانبێژی بووەو بۆتە وتاربێژێکی بەناوبانگ. لەقاهیرەدا زۆری ئاخافتووەو زۆر کەسیش شتیان لێی بیستووە. لەوانە: (ابو حامد بن ظهيرة) لە ساڵی (٧٧٠ك)[132].

## سێیەم: ئەو ئەرکانەی ئەمیر و سەرکردە کوردەکان لە سەردەمی مەملوکیەکان پێیان سپێردراوە:

### جێگری سوڵتان:

بریتی بووە لەو پلە و فرمانەی کە رێ بە خاوەنەکەی دەدات هەمان ئەرك و فرمانی سوڵتان ببینێ، هەڵبستێ بە راگەیاندنی رێورەسمەکان و واژوو کردن و بڵاوکردنەوەکان لە سەردەمی مەملوکی[١٣٣]. ژمارەیەك کورد ئەو پۆستەیان وەرگرتووە لە میسر، لەوانە:

– **امیر ناصرالدین حسین بن عزیز قمري کردي**: لە فتوحاتی لێوار دەریا لە ساڵی (٦٦١ك/ ١٢٦٢ن)[١٣٤] پۆستی جێگری سوڵتانی وەرگرتووە، بەڵام ساڵی دواتر لەو پۆستەی لادراوە و میر شهابەددین قەمەری جێگای ئەوی گرتۆتەوە. دوای کۆچی دوایی میر شهاب لە (٦٦٢ك/ ١٢٦٣ن)[١٣٥] میر ناسرەددین بۆ جاری دووەم پۆستەکەی وەرگرتۆتەوە بۆ جێگرایەتی لە غەززە، هەر لەو پۆستەیدا ماوەتەوە تا رۆژی کۆچی دواییەکەی لە ساڵی (٦٦٥ك/ ١٢٦٦ن). پاراستنی ناوچەکە لە هێرشی خاچپەرستان لە کارە گرنگەکانی ئەو بووە لەو ماوەیەدا[١٣٦].

– **الامیر شرف الدین موسی بن الازکشي الکردي**: لە ساڵی (٧٦٢ك/ ١٣٦٠ن) پۆستی جێگری (غیبة)ی لە میسر وەرگرتووە و لە هەمان ساڵیشدا کۆچی دوایی کردووە[١٣٧]، ئەویش دوای دەرچوونی جێگری سوڵتانی میسر بەرەو سعێد. لە ئەرکو پۆستەکانی ئەو میرە کە وەریگرتووە، (نوێنەر)ی ئەسکەندەرییە بووە لە ساڵی (٧٤٤ك/ ١٣٧٢ن). لە ساڵی (٧٦٢ك/ ١٣٦٠ن) کۆچی دوایی کردووە.

### والی قاهیرە:

ئەرك و فەرماندارییەکە، کە رێگا بە خاوەنەکەی دەدات کاروباری شاری قاهیرەو دەوروبەری بەرێوە ببات، کە هەمان ئەرکی پارێزگاری ئەمرۆیە.

یەکێکیش بووە لە پۆستە باڵاکان لە دەوڵەتی مەملوکییە. خاوەن پۆست و پلەی بەرزتر بووە لە والی شارەکانی تر، چونکە پۆستەکەی هەردەم وەك هی میرەکانی (طبلخاناه) (میری تەپڵخانە لە میرەکانی چینی دووەم بووەو سەرپەرشتی لێدانی تەپڵ و زوڕنای کردووە لە کاتی دەرچوونی سوڵتان و کاریەدەستان، یان لە بۆنە و کاتی پێویست. سی سواریشی لە بەردەست دابووە، هەروەها سەرپەرشتی کۆگای تەپڵ و زوڕنا و ئامێرەکانی تری کردووە - لە ویکیپیدیاوە- و ) بووە[138]. لەو کوردانەی کە ئەو پۆستەیان وەرگرتووە:

- الامیر علاء الدین بن حسن مروانی الکوردي: ولایەتی قاهیرەی هەڵسوڕاندووە لە ساڵی (٧٣٥ك/ ١٣٣٤ز)، لەو کارانەی کە میر عەلائەددینی کوردی پێی هەڵساوە، رووخاندنی حەوت پردەکە[139] و لە نوێ نۆژەن کردنەوەیان بووە [140]. لە ساڵی (٧٤٠ك/ ١٣٣٩ز) کۆچی دوایی کردووە.

- الامیر سیف الدین ابوبکر بابیري الکوردي: ساڵی (٧٣٧ك/ ١٣٣٦ز) هاتۆتە میسر. هەمان ئەو ساڵەی کە گەیشتۆتە جێ، بۆتە والی بەسەر قاهیرەوە[141].

- الامیر نجم الدین ایوبي الکوردي: ساڵی (٧٤٠ك/ ١٣٣٩ز) بەسەر میسردا بۆتە والی، کاتێکیش کە لە ژێر فشاری خەڵکەکە لە والییەتی قاهیرە دوور خرایەوە، کە بەهۆی کردەوە باشەکانی زۆر پێی وابەستە ببوون و خۆشیان دەویست، دووبارە هێنایانەوە، لەساڵی (٧٤٦ك/ ١٣٤٥ز) کۆچی دوایی کردووە[142].

- الامیر علاءالدین علي بن ممدود الکوراني الکوردي: مەقەریزی دەربارەی ئەم میرە دەڵێت" لە باشترین والیەکانی قاهیرە بووە"، ساڵی (٧٤٩ك/ ١٣٤٨ز) پۆستی والی قاهیرەی پێسپێردراوە، لێی دەگێڕنەوە کە لەو کارانەی پێی هەستاوە، جێبەجێ کردنی حوکمی شەرعی بووە بەسەر چل بەندکراو لە قاهیرە[143].

- الامیر حسام الدین بن حسین بن علاءالدین علي بن ممدود الکوراني الکوردي: پۆستی والی قاهیرەی لە ساڵی (٧٦٧ك/ ١٣٦٥ز) وەرگرتووە، لەو

کارانەی کە لەو ماوەی ئەو والی قاهیرە بووەو کردوونی، راگرتنی مەترسی ئەو تۆفانە بووە کە لە ساڵی (٧٧٨ك/ ١٣٧٦ز) لە میسر هەستا، هەروەها ئەو توانی ئاساییش بۆ میسر فەراهەم بکات، دوای ئەوەی کە لە ساڵی (٧٧٩ك/ ١٣٧٧ز) توانی ئەو تاوانبارانە لەناو ببات، کە سەرچاوەی ئاژاوەو تیرۆرکردنی خەڵك بوون[١٤٤].

## بوون بە والی بەسەر گشت هەرێمەکانی میسر:

ژمارەیەك کورد پۆستی والییان بەسەر هەرێمەکانی میسر وەرگرتووە، وەك هەرێمی قلیوب، بوحەیرە و ئەوانی تر، ئەوانیش ئەمانە بوون:

- **الامیر شهاب الدین قرطای الجاکي الکردي**: بۆتە والی قلیوب[١٤٥].
- **الامیر عمادالدین احمد بن باخل الکردي**: بۆتە والی بوحەیرە[١٤٦].
- **الامیر سلیمان الکردي**: دوای ئەوەی قەرافە لە ساڵی (٧٨٦ك/ ١٣٨٤ز) بووە ویلایەتێکی سەربەخۆ لە ویلایەتی میسر، میر سولێمان یەکەم کەس بووە کە لە سەردەمی مەملوکی بۆتە والی قەرافە. یەکێك بووە لە دە میرەکان[١٤٧].
- **الامیر محمد بن الهذباني الکردي**: لە ساڵی (٧٩٠ك/ ١٣٨٨ز) بۆتە والی بەهنسا[١٤٨].

## (استادار) سەرپەرشتیاری کاروباری ماڵی سوڵتان:

**استادار**: زاراوەیەکە لە دوو وشەی لێکدراو پێکهاتووە، (استاذ–دار)، گەورەی ماڵ، سەرپەرشتیاری کاروباری ماڵ، واتە ئەو کەسەی کە سەرپەرشتی ماڵ دەکات. ئەو پلەیە لە سەردەمی مەملوکی دەدرایە ئەو کەسانەی کە کاروباری ماڵی سوڵتانیان هەڵدەسوڕاند، لە چێشتخانە و دیوەخان و بەردەست و غوڵامەکان. ئەو بە فرمانی سوڵتان دەچووە گەشت و سەفەر. لەسەردەمی سوڵتان زاهیر برقوقی دامەزرێنەری دەوڵەتی مەمالیکی بورجی، هەندێك دەسەڵاتی پێدران[١٤٩]. ژمارەیەك لە کوردەکان لە میسر ئەو ئەرکەیان پێ سپێردرا، لەوانە:

**-جمال الدين محمود بن علاء الدين السودوني الاستدار:** لەلای میر سودون خزمەتی ئستاداری کردووە، دوای ئەو لە ساڵی (٦٩٠ك/ ١٣٨٨ز) لای سوڵتان بوقوق[١٥٠] دەستبەکار بووە. پاشان بۆتە (مشیر الدولة) (کە ئێستا دەکاتە جێگری سەرۆك کۆمار- و) و لە سێ دیوانی سوڵتاندا ئاخفتییە، دیوانی تاك، دیوانی وەزارەت، دیوانی تایبەت (خەلیفەی فاتمیو مەلیك زاهر بەرقوق دیوانی تاکیان هەبووە، هەرچی دیوانی تایبەتە ئەوا ئەو وەزیفەیە ناسر محەمەد کوڕی قەلاوون دایهێناوە، کە تایبەت بووە بە سەرپەرشتکردنی سامانی سوڵتان- لە ویکیپیدیاوە-و). پایەی جەمالەددین زۆر هەڵکشاوەو قسەی ئەو لە هەموو کاروبارێکی قەڵەمڕەودا ڕۆیشتووە. لەساڵی (٧٩٩ك/ ١٣٩٦ز) لە سەردەمی سوڵتان فەرەج کوڕی برقوق لە بەندیخانەدا کۆچی دوایی کردووە[١٥١].

جەمالەددین مزگەوتێكو مەدرەسەیەکی دروست کردووە، کە بە مەدرەسەی کوردی ناسراون، مەدرەسەکەی لە ساڵی (١٣٩٠-١٤٠٥ز) لە سەردەمی سوڵتان فەرەجی کوڕی برقوق لە گەڕەکی خاتوو زەینەب دروست کردووەو مزگەوتەکەش ئێستا کەوتۆتە شەقامی خەیامییە، کە لەکۆڵانی شەقامی ئەحمەد ماهر دەبێتەوە لە بەشی ڕێی سوور، کە ناوچەی شوێنەواری باشووری قاهیرەی بەدوا دادێ[١٥٢]. ئەمیر وانەکانی لەوێ ڕێکدەخستنو بە "مدرسة المحمودية" ناسراو بووە. کتێبخانەیەکی پڕ لە کتێبی بەنرخی تێدابووە، تایبەت بووە بۆ خوێندنی مەزهەبی حەنەفیو زانستە ئایینییەکان، وانەی فیقهی حەنەفی لەلایەن (فەقیە) ئەحمەد کوڕی عەتار سەرپەرشتی دەکرا. هەروەها وانەی فەرموودەی پێغەمبەر لەلایەن فەقیە ئیبن حەجەری عەسقەلانی گوتراوەتەوە، لەناو مزگەوتەکەشدا گڵکۆی خاوەنەکەی تێدایە[١٥٣].

**-الامير جمال الدين يوسف بن خضر بن صاروجا الكردي:** لەسەردەمی سوڵتان ناسر فەرەجی کوڕی برقوق لەساڵی (٨٠٩ك/ ١٤٠٦ز) کاری سەپەرشتیاری دەرباری کردووە، دوای ئەویش، لە سەردەمی سوڵتان مەملوکی شێخ

مەحمودی هەمان ئەرکی بەجێهێناوە[١٥٤].

-الامير نجم الدين ايوب الكوردي: ئەویش ئەو ئەرکەی بۆ ئەمیر ئەکۆزی ناسری بەجێهێناوەو لە (٧٣٩ک/ ١٣٣٥ز) کۆچی دوایی کردووە.

## ج- (شد الدواوين) یاریدەدەری وەزیر :

(شد الدواوين) وەزیفەیەکی سەربازییە، (یەکێ لەخاوەن شمشێرەکان وەریدەگرێ) یاوەری و یاریدەدەری وەزیر دەکات، ئەرکەکەشی هەڵگرتنی سامانەکانی سوڵتانە[١٥٥]. (وەك خەزێنەداری تایبەتی وەزیر- و) هەندێك کورد لە سەردەمی مەملوکی ئەم ئەرکەیان بەجێ هێناوە، لەوانە:

- الامير سيف الدين ابو اسحاق ابراهيم بن علي بن عدلان الكوردي الهمذاني: (رەنگە مەبەست هەمەدانی بێت- و) لە (٦٥٣ک/١٢٥٥ز) کۆچی دوایی کردووە. زۆر ئەرکی پێ سپێردراون، لەناویشیاندا شد الدواوين[١٥٦].

## (السفارة) باڵوێزخانە :

ژمارەیەك کەسایەتی کوردیی لە سەردەمی مەملوکی وەك باڵوێز لە هەندێك وڵاتی ئیسلامیدا کاریان کردووە، هەڵبژاردنی ئەو باڵوێزانە لەسەر بنەمای زانیاریو زیرەکیو سەرکەوتنان بووە لەو کارانەی پێیان سپێردراوە. کاری باڵوێزی لای ئەو مەلیكو میرانە پایەو ناوبانگێکی بەرزی هەبووە لە رووی خۆراگری و شکۆمەندی لەناو ئەو باڵوێزانەدا:

-الامير شرف الدين الجاكي الكردي : تا ساڵی (٦٦٠ک/ ١٢٦١ز) باڵوێزی سوڵتان بیبرس بووە لەلای سەلجوقییەکانی رۆم[١٥٧].

-الامير مبارزالدين الطوري الكردي: سەفیری سوڵتان بیبرس بووە لەلای مەلیکی مەغۆل، خان مەغۆلی ئەبغا کوڕی هۆلاکۆ (٦٦٣ک/ ١٢٦٤ز- ٦٨٠ک/ ١٢٨١ز) ، مەبەستیش لەو باڵوێزییەی نێوانیان، بەستنی پەیمانی ئاشتی بووە لەگەڵ مەغۆل[١٥٨].

رۆڵی کورد تەنها لە باڵوێزی دەوڵەتی مەملوکیدا کورت نەبووەوە، بەڵکو

بالوێزی چەند وڵاتێکی هاوسێی دەوڵەتی مەملوکیشیان کردووەو بە باشترین شێوە ئەرکی بالوێزییان جێبەجێ کردووە، لەوانە:

**الامیر علاءالدین ایدغدي الشهرزوري الكردي:** بۆتە بالوێزی سوڵتانی مەغریب (ابو يعقوب يوسف المريني)، لەلایەن سوڵتانی مەغریب ناردراوەتە لای سوڵتانی مەملوکی ناسر کوڕی قلاوون لە ساڵی (٧٠٤ك/ ١٣٠٤ز)[١٥٩].

## چوارەم: رواقی کوردان لە ئەزهەری شەریف:

**( رواق بەو هەیوانو داڵانەی نێو مزگەوت دەگوترا فێرخوازان تێیدا دەمانەوەو ژووری حەوانەوەو دەرسکردنیشی تێدایە، لای ئێمە حوجرەی فەقێیانی پێگوتراوە[١٦٠] و )**

### سەرەتا:

### چیرۆکی دەسپێکی خوێندن لە ئەزهەر:

زانکۆی ئەزهەر لە کۆنەوە تا ئێستا، قیبلەی زانستە عەقلیو نەقلییەکانە، هەروەها شرێنی بەیەکگەیشتنی کەڵەتوێژەر و پیاوچاکانە. زانا و قوتابیانی فێرخزاز لە رۆژهەڵات و رۆژئاوای وڵاتانی ئیسلامی رووی تێ دەکەن، بۆ بینینی یەکتر و ئاشنا بوون بە هونەری نوێی ئەوی بەرامبەر. قوتابیان لەو مەڵبەندەوە لە زاناکانیان فێر دەبن، بنکەیەکی بەرفراوانیش لە دەرچووان و رێپێدراوان لەو مزگەوتە بوونەتە سەردەستە و رابەر و رێنوێن لە ناوچەکانیان.



لەوکاتەی کە زانکۆی ئەزهەر دروست کراوە، هەمیشە کۆڕ و بازنەی زانستی تێدا گرێ دەدرێن. وەك ئاشکرایە دەوڵەتی فاتمی شوێنکەوتەی مەزهەبی شیعی بووە، بۆیە

بەهەمرو شێوازێك هەوڵی داوە لەسەر بنەمای مەزهەبی شیعی پەروەردەو زانستەکانی خۆی بەسەر خەڵکدا بچەسپێنیّ، کۆڕ و بازنەی زانستی لە مزگەوتی ئەزهەر (پێشان ئەزهەری شەریف مزگەوت بووەو پێی گوتراوە (جامع الازهر) ، بە تێپەڕ بوونی کاتو خواستی زۆری فێرخوازانی زانستو لەگەڵ پێشکەوتنی سیستمی ژیان و پەروەردە بۆتە زانکۆی ئەزهەر (جامعة الازهر)، کە وێڕای زانستە ئایینییەکان، هەموو زانستەکانی دیکەی تێدا دەخوێندرێن — و) بۆ پێگەیاندنی قوتابیانیان دروست کرد، بۆ ئەوەی لە هزر و ئەندێشەی نەوەکانی داهاتوودا بمێنێتەوە. دواتر فاتمیەکان زانییان ئەو کۆڕ و بازنانە ناتوانن بەردەوام بن ئەگەر زاناو قوتابیەکان کۆمەك نەکرێن، بۆیە وەزیر "یەعقوبی کوڕی کلس" داوای لە خەلیفەی فاتمی عەزیز بیللاه کوڕی موعز ( ٣٦٥-٣٨٦ك/ ٩٧٥-٩٩٦ز) کرد کە خۆراك بۆ ئەو زانا و فەقێیانە دابین بکات، ئەویش مووچەی پێویستی بۆ بڕینەوە، خانووێکیشی لە تەنیشت ئەزهەر بۆ دروست کردن بۆ ئەوەی تێیدا بمێننەوە. وەزیر خۆی پێداویستی و مووچەی ئەو زانانایانەی دابین دەکرد، کە ژمارەیان سی و پێنج کەس دەبوو. ڕۆژانی هەینی دەهاتنە مزگەوتی ئەزهەر و دوای نوێژی هەینی تا نوێژی عەسر کۆڕی زانستیان ئەبەست. هەرچەندە بەپیروەهاتنێکی میللی بۆ ئەو کۆڕ و بازنە زانستبیانە نەبوو، بەڵام ئەم وێنە بچووککراوەیە سەرەتای دەرکەوتن و دروستبوونی کۆنترین زانکۆ بووە لە سەرتاسەری دونیا، کە هەر لە ڕۆژی دروست بوونیەوە تا ئێستا چاودێری و دەستگیرۆیی هەموو ئەوانە دەکات کە تێیدا دەخوێنن.

بەڵام لە سەردەمی ئەیوبی، لەسەر دەستی سەلاحەددینی ئەیوبی گۆڕانێکی زانستی پێشکەوتووی تێدا ڕوویدا، یەکەم هەنگاو کە لە بزاوتی پەروەردەیی ئەزهەر هەڵیهێنا بریتی بوو لە هەڵوەشاندنەوەی مەزهەبی شیعی لە سەرتاسەری میسر، هەروەها هەڵوەشاندنەوەشی لە خوێندنی ئەزهەر و دانانی

مەزهەبی سوننی لەجێی ئەو کرد، کە مەزهەب و ئایینی فەرمی خەڵکی میسر بوو، لەگەڵ دانانی بنەما زانستییە نوێیەکانی ئەو مەزهەبە لە ئەزهەری شەریف و لە هەموو ئەو مەدرەسە زانستییانەی ئەوکاتی میسر.

سەلاحەددین زۆر زیاتر لە پێشان گرنگی بە رەوتی زانست دا لە ئەزهەری شەریف، بۆیە ئەزهەر لە سەردەمی ئەودا پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆوە دیت، لە سایەشیدا زانستە عەقلی و نەقلییەکان گەشەیان کرد، ئەویش بە کردنەوەی ئامێزی خۆی بۆ قوتابیان و فێرخوازانی زانست لە سەراپای جیهانی ئیسلامی. بۆیە هاوشان لەگەڵ قوتابییە میسرییەکان، ژمارەیەکی زۆر قوتابی نەتەوە جیاجیاکانی ئیسلامی گرتەخۆو زانستیان وەردەگرت. گومانی تێدا نییە کە سیاسەتی نارەخۆ و دەرەکی سەلاحەددین لە دەوڵەتی ئەییوبی (کە بنەمای یەکێتی لەنێوان نەوە جیاجیاکانی ئیسلام دامەزراند، دواتر سەرکەوتنی گەورەی حەتتینی بەسەر خاچپەرستان بەدوا داهات). هەموو ئەمانە وایانکرد کە میسر لە پێشەوەی جیهانی ئیسلامی دابنێت لە رووی سەربازی و سیاسی و زانستییەوە. ئەمەش وایکرد کە خوازیارانی زانست لە وڵاتی نێوان دوو رووبار و کوردستان و شام و یەمەن و حیجاز و سودان و حەبەشەو هندو ئەفغانو چین..تد، روو لە میسر بکەن و ئەزهەریش بە جیاوازی نەتەوەیی و رەگەزی پێشوازی لێ دەکردن و ئامێزی خۆی بۆ هەموو ئەو قوتابی و فێرخوازە ئیسلامییانە دەکردەوە کە روویان تێ دەکرد، لە ناویشیاندا قوتابیانی کورد لە سەرتاسەری کوردستانەوە روویان تێ دەکرد. لێرەشەوە بیرۆکەی دروست کردنی حوجرە بۆ قوتابیانی هاتوو سەری هەڵدا.

کورتیەکەی ئەمەیە، کە دەستپێکی دروستبوونی رووالەتەکانی کۆنترین زانکۆ لە جیهان، لە سەردەمی فاتمییەکان بووە لە میسر، بەلام بنەماکانی ئێستای لە سەردەمی سەلاحەددینی ئەییوبی دانراون، ئەویش بەهۆی ئەو سیاسەتە ناوخۆیی و دەرەکییەی کە پەیرەوی دەکرد، لەوانە هەڵوەشاندنەوەی مەزهەبی

شیعی و دانانی مەزهەبی سوننی وەك مەزهەبی فەرمی وڵات، كە لە سەردەمی فاتمییەكان تەنها میللی بوو نەك فەرمی. كردنی میسر بە رووگەی زانست و زانایان، هەروەها بە روخساری وڵاتانی ئیسلامی، ئەویش بە پاراستنی و وەدەرنانی خاچپەرستان تیایدا و رزگاركردنی قودسی پیرۆز، هەروەها بە دابینكردنی پێداویستییەكانی رەوتی پەروەردەیی لە زانكۆی ئەزهەری شەریف.

لە سەردەمەكانی دواتریشدا مەمالیكەكان و عوسمانیەكان و دەوڵەمەندەكانی میسری، گرنگییەكی زۆریان بە ئەزهەر و زانا و قوتابیەكانی داوە، لە بواری خەرجی و پاداشت و شوێنی نیشتەجێ بوون و خۆراك، وێڕای پێداویستی و ئامرازەكانی دیكەی خوێندن. ئەم كردارە چۆن بەڕێوە بردراوە؟ خۆراك و پارەمەتییەكانیان چۆن بەسەردا دابەش دەكران؟ چۆن شوێنی مانەوە بۆ زانا و فەقێ فێرخوازەكان دابین دەكرا و لەسەر چ بنەمایەك بووە؟ هەموو ئەمانە لە چوارچێوەیەكدا روونده‌كرێنەوە كە لەوكاتەوە پێیانگوتراوە:

## جوجرەی كوردان و رەوتی پەروەردەیی و بەڕێوەبردن:

(رواق) بەشێكە لە مزگەوت و تایبەتە بە خوێندن، پێكهاتووە لە هەیوانێكی سەرداپۆشراو، كە لەسەر پایە دروست كراوە، هەر شێخێك بارنەیەك یان كۆڕێكی وانە گوتنەوەی تێدا دەگێڕێ و قوتابیانیش بە دەوریەوە كۆدەبنەوە. هەروەها پێكهاتووە لە ژوور بۆ حەوانەوە و مانەوەی قوتابین، ژووری كۆگاشی هەیە كە دۆڵابی تێدایە بۆ



تێدا هەڵگرتنی کتێب و کەلوپەلەکانیان. کتێبخانەیەکیشی هەیە بۆ ئەو کتێبانەی وەك سەرچاوە بەکاری دێنن و وەقفیشە بۆ سەر قوتابیان (ئێمە حوجرەمان بۆ بەکارهێناوە– و).

بۆ هەر تۆرەمەو رەگەزێك حوجرەیەکی تایبەتی دروست کراوە و بەدرێژایی ساڵانی خوێندنیان لەوێ بێ بەرامبەر تێیدا دەمانەوە. وێڕای پێدانی ژەمەنان (راتبە)، کە چەند کولێرەنانێکی کەم بوون، رۆژانەش بەپێی سیستەمێکی رێکخراو برێ مووچەیان بەسەردا دابەش دەکرا، هەروەها سەرەتای هەموو مانگێکی کۆچیش مووچەیان پێ دەدرا، لە بۆنە فەرمییەکانیشدا خواردنی تایبەتو شیرنەمەنییان دەدرایێ. وەك دەستبەکاربوونی بەرپرس و بەڕێوەبەرێك، یان لە بۆنە ئایینییەکاندا وەك لەدایك بوونی پێغەمبەر (د.خ) و هاتنی مانگی رەمەزان و هەردوو جەژن.

بیرۆکەی گشتی لە دانانی سیستەمی حوجرە لە ئەزهەر، بۆ نەهێشتنی کۆسپو تەگەرەکانی دارایی بووە بەرامبەر بە قوتابیانو فێرخوازان لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە بۆ ئەوە بووە تا فێرخوازان هەست بە کەشێکی نامۆ نەکەن لەو ساڵانەی کە دوور لە نیشتمان و داب و نەریتەکانی خۆیان لە ئەزهەردا ژیان بەسەر دەبەن، کە لە سەرەتای ژیانی لاویدا پێی راهاتوون.

حوجرەی کوردەکانیش لە حوجرە هەرە گرنگەکانی ئەزهەر بووە، ئەویش بەهۆی ژمارەی زۆری قوتابییە چالاكو رەنجدەرەکانی.

حوجرەی کوردان دەکەوتە دەستەڕاستی دەرگای ئەلموزەیینین (دەرگای سەرتاشان، یان دەللاکان– و)، دەرگایەکی نزیکیشی هەیە لە حوجرەی مەغریبییەکان، دەرگایەکی دیکەی ئەڕوانێتە سەر حەوشەی مزگەوتی ئەزهەر. قوتابیانی کورد وانەکانی خۆیان لەسەر مەزهەبی شافیعی تێدا دەخوێند.





شایانی باسه، حوجرەکان سەربەخۆییەکی تەواویان هەبووە لەو داهات و خەرجییانەی کە لە رێی وەقفی خێرخوازان لە زانایان و خاوەن شکۆ و سوڵتانەکان دەیانبەخشییە حوجرەکان. جا میسری بوونایە یان کورد یان هەرکەسێکی تر. وەقفەکانیش بریتی بوونە لە بەخشینی زەوی کشتوکاڵیو شوێنی بازرگانی. لەو کەسایەتییە کوردانەی کە زەوی کشتوکاڵیو شوێنی بازرگانی کردۆتە وەقفی حوجرەی کوردان، خاتوو "زەینەب خاتوون"ە، کە لە ماڵباتی ئەییوبییەکانەو سامانی خۆی کردۆتە وەقفی زاناو ئاینو دروستکردنی مەدرەسەکان، یەکێکی تر لە وەقفەکانی ئەو خاتوونە کوردە، دروستکردنی حوجرەی کوردەکانە لە مزگەوتی ئەزهەر بەر لە سەدان ساڵەوە.

حوجرەی کوردان، وەك هەر حوجرەیەکی تر شێخێکی بە هەڵبژاردنی راستەوخۆ لەلایەن قوتابیانەوە بۆ دادەنرا. کە وەك بەرپرسی کارگێری وابوو بەرامبەر بە شێخی ئەزهەری شەریف، بەرپرسیش بووە لە چۆنیەتی بەرێوەچوونی رەوتی پەروەردەو کارگێری حوجرەکەیان، گرنگی پێ دەداو پارێزگاریشی لەو کتێبخانە گەورە دەکرد کە بۆی دانراوە. مووچە و کۆمەکی بەسەر قوتابیانی (فەقێ) کانی حوجرەدا دابەش دەکرد. هەروەها سەرپەرشتی هەموو داواکارییەکی فەقێکانی حوجرەکەی دەکردو داکۆکیشی لە مافەکانیان دەکرد. هەروەها هەڵدەستا بە سەرپەرشتی کردنی ئەو زەویو زارو دوکانو ماڵانەی وەقفی حوجرەکەیان کرابوون.

لەناو حوجرەی کورداندا، کۆمەڵێك لە خاوەن وەزیفە هەبوون یارمەتی شێخی حوجرەیان دەدا لە کارەکانی. وەك "وكيل الرواق" کە بە کارو ئەرکەکانی شێخی حوجرە هەڵدەستا، کاتێك کە خۆی لەوێ نەبووایە. "نقيب الرواق" ئەویش هەڵدەستا بە رێکخستنو هەڵگرتنی ئەو تۆمارەی کە ناوی قوتابیانی

تێدا تۆمار کراوە، لەگەڵ تۆمارەکانی تری حوجرە، هەروەها وەرگرتنی زەمەنانەکان لە بەڵێندەرەکانو دابەشکردنی بەسەر ئەوانەی کە موستەحەق بوون لە حوجرەکاندا، "مبلغ الرواق" لەکاتی نوێژەکاندا بانگی دەدا. "امام المسجد" کاری ئەو پێشنوێژی بووە بۆ فەقێکانی حوجرەکەی. "مباشر الرواق" ئەمەش کاری پاسەوانی حوجرەی لە ئەستۆ بووە (لە کوردەواریدا مزگەوت پاسەوانی نییە، بەڵکو مجێور هەیە، کە ئەرکی وێڕاگەیشتنە بە خزمەتکردنی مزگەوتو رەنگە نووسەران هەمان مەبەستیان هەبێت -و). "جابي الرواق" کاری ئەو کۆکرنەوەی پیتاکو داهاتو وەقفەکانی حوجرە بووە. "ملا الرواق" کاری ئەو هێنانی ئاو بووە. ئەمانە لە بەرامبەر ئەرکەکانیاندا وێڕای ئەو مووچە تایبەتەی وەریاندەگرت، بەشە نانێکی زۆریشیان دەدرایێ.

بەم شێوەیە رەوتی پەروەدە و کارگێڕی لە حوجرەدا بەڕێوە دەچوو، فێرخوازان لە وڵاتەکانی خۆیان وەك فەقێ روویان تێ دەکرد و وەك زانا دەگەڕانەوەو مەشخەڵێکی رۆشنیان هەڵدەگرت و بە گژ بیری توندوتیژی و دواکەوتوویی و نەزانین و پڕوپووچیدا دەچوونەوەو لە بەرامبەر رەوتی شیعەگەرایی لە سەدەی نوێدا پارێزگارییان لە مەزهەبی سوننی شافیعی خۆیان دەکرد.

ئەوانەی کە پلەی شێخی حوجرەی کوردیان وەرگرتووە، (شیخ عبدالرحمن بن احمد بن محمد الذوقي الكوردی الازهري[١٦٠] (ناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ قەڵای، زوق لە لایەك لە لایەکانی ولایەتی بەدلیس لە کوردستانی تورکیا)، ساڵی (١٢٧٧ك/١٨٦٠ز) تێیدا لەدایك بووە، لە (١٣١٣ك) لە حوجرەی کوردان دامەزراوە، دواتر بۆتە پێشنوێژی مزگەوتی حوجرەی عەبباسی[١٦١] لەناو ئەزهەر. کاری وەکیل حوجرەو پاشان شێخی حوجرەی پێسپێردراوەو بەسەر وەقفەکانەوە راگەیشتووە. شێخ عەبدولڕەحمان دوای تەمەنێك لەخواپەرستیو خزمەتی زانست، لە ساڵی (١٩٤٠ز) کۆچی دوایی کردووەو کۆمەڵێك منداڵیشی لەدوا

بەجێماون، کە بە دڵسۆزی خزمەتی میسریان کردووە. دوا کەسیش کە وەقفی کردوو، لەسەر حوجرەی کوردی و تورکی، لە پیاوانی دەوڵەتی عوسمانی بووە بە ناوی سوپا سالار- ئیبراهیم ئەدهەم، پاشای ئۆرفەلی میسری بووە لە خێڵی مەلییەی کوردی بووە لە رۆژهەڵات و باشووری رەها، واتە ئۆرفە لە کوردستانی تورکیا.

دواهەمین ئەو کەسانەش کە پلەی شێخی حوجرەیان وەرگرتووە: (شیخ عمر وجدی بن عبدلقادر الکوردی الماردینی، المصری) (١٩٠١ز-١٩٩١ز کۆچی دوایی کردووە)[١٦٢]، شارەزای فیقە، زمانزان و رەوانبێژ و خواناس بووە، لە ماردین لەدایك بووەو رووی کردۆتە میسر، لەوێ پەیوەندی بە حوجرەی کوردانەوە کردووە لە ئەزهەری شەریف. لەلایەن شێخ محەمەد حەبیبوڵلای شەنقیتی و شێخ محەمەد زاهد کەوسەری و چەندانی تر زانست و زانیاری وەرگرتووە و ئیجازەیان داوەتێ. کاری وەرگێرانی لە زمانی تورکی کردووە لە ئێزگەی میسری، هەروەها شێخی حوجرەی کوردەکان و بەغدادییەکان بووە لە زانکۆی ئەزهەر.

رەوتی پەروەردەو خوێندن لە حوجرەی کوردان تا ساڵی (١٩٦٢ز) بەردەوام بووە. لەو ساڵەدا یاسای پێشخستنی ئەزهەر دەرچوو، لە سەردەمی سەرۆك جەمال عەبدولناسر، تا لەسەر رێبازی زانستی نوێ بەردەوام بێ، هەروەها بۆ کۆنترۆڵ کردنی ئەو ژمارە زۆرەی قوتابییان، کە لە هەموو لاوە روویان تێدەکرد. لەسەر ئەو بنەمایەدا بوو چەندین کۆلێژ لە زانکۆی ئەزهەر کرانەوە، کە هەموو تایبەتمەندییە زانستە نوێیەکان بگرێتەوە، وێڕای کۆلێژە مرۆیی و زمانی و شەرعییەکان. هەروەها هەڵسان بە دروستکردنی شارۆکەی زانکۆیی نوێ، بۆ نیشتەجێ بوونی قوتابیانی ئەو زانکۆیە. یەکێکیان بۆ قوتابیانی میسری، ئەوی تریشیان بۆ ئەو قوتابیانەی لە دەرەوە روویان تێکردبوو، وە ناویان نا شاری نێردە ئیسلامیەکان، پاشان هەڵسان بە گواستنەوە قوتابیانی

ناو حوجرەکان بۆ ئەو شارۆکە نوێیانە بۆ نیشتەجێ بوونو دابەشکردنیان بەسەر کۆلێژەکان، هەریەکەو بەپێی بواری خۆی، بۆ بەردەوام بوون لەسەر رێبازی نوێی زانستی. بۆیە هەموو حوجرەکانی مزگەوتی ئەزهەریان داخستن، لەناویشیاندا حوجرەکەی کوردان. هەندێك لەو شوێنانەیان بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی مزگەوت بەکار دەهێنا و هەندێکیشیان کردە شوێنی نوێژی ئافرەتان.

ئێستاش قوتابیانی کورد، کە پەیوەندی بە ئەزهەری شەریفەوە دەکەن، لە شاری نێردراوە ئیسلامییەکان نیشتەجێ دەکرێنو هەموو پێداویستیو خزمەتگوزارییەکیشیان بۆ دابین دەکرێت، لە خۆراك و خواردنەوە و کتێبخانەو کۆڕو سمینەر، بۆ ئەوەی تەنها سەرقاڵی خوێندن و زانست بن.

پوختەی بابەتەکە ئەوەیە، کە حوجرەی کوردان لە ئەزهەر، یەکێك بووە لە کاراترینو بەرچاوترین حوجرە، رەوتی کاروباریشی بەپێی یاساو رێوشوێنی کارگێڕی دیاریکراو بەڕێوە چووە. واتە هیچ بێسەروبەری و گێرەشێوێنییەکی تێدا نەبووە. تەواو سەربەخۆ بووە لە داهاتەکانی، ئەویش بەهۆی ئەو وەقفانەی کە خێرخوازان پێیانی بەخشیبوو، بەڵام ئەوەی کە زۆر جێی تێڕامانە ئەوەیە، کە هەر لەوساوە دانپێنان و لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندی کورد جیا لە رەگەز و نەتەوەکانی تری وەك عەرەبو تورکو ئەفغان و ئەلبان لەبەرچاو گیراوەو جیاوازییان پێ کراوە، هەروەها حوجرەی تایبەتو سەربەخۆیان هەبووە، ئەرشیفخانەی دیکۆمێنتاری نەتەوەی میسریش ئەرشیفی کردوون و ئەمەی سەرەوەش پشتڕاست دەکاتەوە.

---

١١٤- بنوارە- د.قاسم عبده قاسم: عصر سلاطين المماليك، ط١، دار الشروق، القاهرة ١٩٩٤م.

١١٥- قادر اسحاق ئاتخو: التاريخ الشركسي، ترجمة محمد ازوقة، ط١، دار ورد الاردنية للنشر والتوزيع ٢٠٠٩، ص١٦٥.

١١٦- اصل المماليك، اطلس التاريخ الحديث، ج٣، ص٦.

١١٧- المقريزي: الخطط، ج١، ص٤٥٩. قاسم عبده قاسم: عصر سلاطين المماليك، ط١، دار الشروق- القاهرة ١٤١٥هـ/ ١٩٩٤م، ص٢٢.

١١٨- محمد علي عوني: ترجمته لمشاهير الكرد وكردستان، ج٢، ص ٣٤٩.

١١٩- سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل ٦٢.

١٢٠- سەرچاوەی پێشوو ، ل ٦٧.

١٢١- سەرچاوەی پێشوو ، ل ٨٥.

١٢٢- سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل٩٧.

١٢٣- سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل١٠٤.

١٢٤- سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل١٧٩.

١٢٥- سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل١٨٢.

١٢٦- الصفدي: الوافي بالوفيات، تحقيق احمد الارناؤوط، تركي مصطفى، ص٢٠٥.

١٢٧- محمد علي عوني: ترجمته لمشاهير الكرد وكردستان، ج١، ص ٢٤٧.

١٢٨- سەرچاوەی پێشوو، ب٢، ل ٢٩٣.

١٢٩- محمد علي عوني: ترجمته لمشاهير الكرد وكردستان، ج٢، ص ٢٩٣.

١٣٠- محمد علي عوني: ترجمته لمشاهير الكرد وكردستان، ج٢، ص ٣٤٩.

١٣١- سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٦٦.

١٣٢- ابن حجر العسقلاني: الدرر الكامنة، ج١، ص٣١٥. محمد علي عوني: ترجمته لمشاهير الكرد وكردستان، ج٢، ص ٤٧١.

١٣٣- صبح الاعشى، ج٤، ص٢٩٥.

١٣٤- مەبەست لە فتوحاتی ساحلی لێرە جێگری غەززەیە کە سەر بە بەری رۆژئاوا بوو، القلقشندي: صبح الاعشى، ج٤، ص٤ ٢.

١٣٥- المقريزي: السلوك، ج١، ص٥٥٥.

١٣٦- سەرچاوەی پێشوو، ب٢، ل ٣٣،٢٣.

١٣٧- جێگری غەیبە پلەکەی بچووکترە لە پلەی جێگری (کفیل) راسپێردراو، بۆی هەبوو جێی سولتان یان جێی کەفیل بگرێتەوە لەکاتی ئامادەنەبوون و غائیب بوونی ئەوان، ئەرکەکەشی دامرکاندنەوەی شۆرش و راپەرینەکان بووە. بنوارە: القلقشندي: صبح الاعشى ، ج٤، ص١٨.

١٣٨- القلقشندي: صبح الاعشى ، ج٤، ص ٢٣.

١٣٩- سولتانی مەمالیك زاهیر بیبرس لەسەر کەنداوی نێوان قاهیرە و مسر دروستی کردووە، سولتان قلاوونی مەمالیکیش نوێی کردۆتەوە، بنوارە: المقريزي: الخطط المقريزية، ج٣، ص٢٦٠.

١٤٠- المقريزي: السلوك، ج٣، ص٢٦٠.

١٤١- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٢.

١٤٢- سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥٦.

١٤٣- سەرچاوەی پێشوو، ب٤، ل ٦٩.

١٤٤- المقريزي: السلوك، ج٥، ص٢٩.

١٤٥- قليوب شارێکە دەکەوێتە پارێزگای قلیوبی ئێستا، ئەوکات بارەگا و بنکەی ولایەتی قلیو بوو. نزیکەی ٩کلم لە قاهیرە دوورە. بروانە: القلقشندي: صبح الاعشى،ج٣، ص٤٥٧.

١٤٦– المقريزي: السلوك، ج٢، ص١٨٣.

١٤٧– امراو العشرات– چینی سێیەمیان گرتبوو لە دەوڵەتی مەمالیکەکان، بە (ارباب السیوف)یش ناسرابوون. بڕوانە: القلقشندي: صبح الاعشى، ج٤٣، ص١٥.

١٤٨– ئێستا سەر بە پارێزگای (بەنی سویف)ە.

١٤٩– د. سعاد ماهر محمد: مساجد مصر واولیاؤها الصالحون، ج٢، ص ١٩٨–١٩٩، ج٤، ص١٧٩–١٨٠.

١٥٠– (ئەگەرچی لێرەدا نووسراوە (بولقوق) رەنگە مەبەستی (برقوق)بێ و بە هەڵە چاپکرابێ" چونکە لەهیچ شوێنێك ناوی سوڵتان (بولقوق) نەهاتووە – و)

١٥١– المقريزي: الخطط، ج٢، ص٣٩٥–٣٩٧. علي مبارك لە (الخطط الجديدة ٣ص٣٤٢ ) دەڵێت: مزگەوتی کوردی بە کۆسپە و پەیژە دێی سەردەکەوتی. بنوارە: فاروق عسکر: دلیل مدینە قاهرە، ج٢، پرۆژەیەکە لە مانگی ئەیلولی ٢٠٠٢ دراوەتە ئەم وێبسایتەی ابوزەبی www.alasalik.com

١٥٢– ئەم شوێنەوارە بە ژمارە ١١٧ تۆمار کراوە.

١٥٣– عبدالرحمن زكي: موسوعة مدينة القاهرة في الف عام، مكتبة الانجلو المصرية– القاهرة، عام ١٩٨٧م،ص ٣٢٩.

١٥٤– المقريزي: السلوك، ج٧، ص١٠.

١٥٥– القلقشندي: صبح الاعشى ، ج٤، ص ٢٣.

١٥٦– المقريزي: المقفى، تحقيق محمد البعلاوي، ط٢، دار الغرب الاسلامي، بيروت ٢٠٠٦م، ج١، ص١٢٥.

١٥٧– المقريزي: السلوك، ج١، ص٥٤٢.

١٥٨– سەرچاوەی پێشوو. ب٢، ل٧٨

١٥٩– المقريزي: المقفى، ج٢، ص١٩٥.

١٦٠– کێشەی دامەزراندنی شێخ عەبدولڕەحمان ئەلزوقی بۆ حوجرەی کوردان بەشێوەیەك چووە پێش کە مایەی سەرسامی بوو. تا گەیشتە بەرزترین ئاستی نێوان شێخەکان و حکومەتی ئێرانی، کە هەوڵی دەدا حوجرەی کوردان تەنها بۆ ئەوانە بێ کە سەر بە ئەون، بەڵام بۆ تێکڕای عەجەمەکان کراوەبێ. بە بیانووی ئەوەی کە حوجرە بە ناوی حوجرەی عەجەمەکان بووە نەك حوجرەی کوردان. بەڵام لە بەرامبەردا شێخ عەبدولڕەحمان هەڵوێستێکی جوامێرانەی نواندووە، وە خانەقا و شێخەکانی ئەزهەریش هەڵوێستێکی جوامێرانەتریان نواندووە بۆ یەکلایی کردنەوەی ئەو کێشەیە، کە پڕوپاگەندەی ئێرانیەکانیان رەت کردەوە. پوختەی ئەم کێشەیە ئێستا وا خەریکین لە کتێبێکی تایبەت بە حوجرەی کوردان ئامادەی دەکەین، لە دوتوێی بەڵگەنەما و تۆماری خانەی بەڵگەنامەیەکانی گەلی مسری، کە تا ئێستا ئاشکرا نەکراون.

١٦١– ئەو حوجرانە خدێوی عەباس حلمی بنیاتی نان لە ئەزهەری شەریف لە ساڵی (١٨٩٤ن)، پاشان ژمارەیەك فەقێی لە حوجرەکانی دیکە هێنان و تێیدا نیشتەجێی کردن، لە ناویشیاندا فەقێ کوردەکان.

١٦٢– بەم دواییانە زانیمان کە دوو کوڕی هەن: یەکیان لە ئیستەنبوڵ دەژێ و ئەوەی دیکەیان لە کەنەدا. هەوڵ ئەدەین پێیانبگەین، بەو ئومێدەی کە لە ئەرشیفی یەکێکیان تروسکاییەك بەدی بکرێت سەبارەت بە حوجرەی کوردان لە سەردەمی شێخایەتی باوکیان.

# پێنجەم

# کورد لە میسر لە سەردەمی عوسمانی تا سەردەمی محەمەد عەلی و ماڵباتەکەی

یەکەم: کورد لە میسر لە ژێر حوکمی عوسمانی
دووەم: هەڵوێستی کورد لە هێرشی فەڕەنسا بۆ سەر میسر
سێیەم: محەمەد عەلی پاشا و بنەچە کوردیەکەی
چوارەم: سەرکردە سەربازی و کارگێڕیە کوردەکان لە سەردەمی محەمەد عەلی پاشا و ماڵباتەکەی

## یەکەم: کورد لە میسر لە ژێر حوکمی عوسمانی:

کورد بە چوونە ناو حوکمی عوسمانی لە ساڵی (١٥١٧ز) کەوتە سەردەمێکی نوێی حوکمڕانی، ئەویش دوای بەزین و ڕووخانی مەمالیکەکان لەسەر دەستی سەرکردەی سوپای عوسمانی سوڵتان سەلیمی یەکەم، کە بۆ ماوەی ٢٦٨ ساڵ لە (٦٤٨-٩٢٣ك/ ١٢٥٠-١٥١٧ز) حوکمیان کردبوو. بۆیە حوکمی میسر درایە دەست والی. کە نوێنەرایەتی سوڵتانی عوسمانی دەکرد. لەو توێژینەوەیەی کە لەبەر دەستماندایە بۆمان ڕوون نەبۆتەوە کە ئەو سوپا عوسمانییەی هاتۆتە ناو میسر، یان ئەو هێزانەی کە دواتر هاتوون، داخۆ تێکڕای لە کوردە شەڕکەرەکان پێکهاتووە یان نا، یاخود داوای کۆمەك لە سەرکردە و کەسایەتییە کارگێڕییە کوردەکان کراوە یان نا، لەسەردەمی حوکمی عوسمانی لە میسر، یان بەر لە هاتنی سەردەمی محەمەد عەلی لە ساڵی (١٨٠٥ز).

بەڵام ئەوەی لە مێژووی ئەوکات زانراوە ئەوەیە کە هەندێك ڕێککەوتنی سەربازی و کارگێڕی و ئابووری لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و میرنشینە سەربەخۆیە کوردەکان لەوکاتدا لە کوردستان گرێدراوە. هەر بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە زۆر بە کورتی تیشکی دەخەینە سەر.

بەر لە هاتنی عوسمانییەکان بۆ میسر، کوردستان سێ ساڵ زووتر، واتا لە ساڵی (١٥١٤ز) بە ئاشتی چۆتە ژێر دەسەڵاتی حوکمڕانی عوسمانی، ئەویش لە دەرەنجامی سەرکەوتنی عوسمانییەکان بەسەر سەفەوییەکان لە شەڕی چاڵدێران[٦٣] بە کۆمەك و یارمەتی ماددیو مەعنەوی کوردەکانەوە- بەو پێیەی کە کوردیش لە میرنشینەکانی ئەوکاتیدا لەسەر مەزهەبی سوننی بوو .

شەڕی چاڵدێران لە ساڵی (١٥١٤ز) بووە هۆی یەکەم دابەشبوونی کوردستان، کە تیایدا دەوڵەتی عوسمانی بە ئاشتی دەستی گرت بەسەر سێ لەسەر چواری هەرێمەکە، کە ئێستا کەوتۆتە نێوان سنووری تورکیا و عێراق و سوریە، چارەگی دواییش کەوتە بندەستی دەوڵەتی سەفەوی فارسی، کە ئێستا

کەوتۆتە نێو سنووری سیاسی ئێران. بەڵام ئەو دەستبەسەر داگرتنە تەنها بەناو بوو نەك بە کردەیی[١٦٤]. بە تایبەتی ئەوەی کە بە کوردستانی عوسمانی زاندرابوو[١٦٥].

لە بەرامبەر ئەمەشدا، دەسەڵاتی عوسمانی دەیەویست بە سوود وەرگرتن لە میرنشینە کوردەکانەوە ئارامی لە ناوچەکەدا بەرپا بکات. بۆیە دانی نا بە سەربەخۆییەکی زاتی بۆ دە میرنشینی کوردی، لەبەرامبەر بەرقەراکردنی ئاسایشی ناوچەکەی و بەخشینی باج و بەشداریکردن لە جەنگەکانی دەوڵەتی عوسمانی. وەك بەشێکی خودموختارو سەربەخۆش لە دەوڵەتی عوسمانی مامەڵەی لەگەڵ دەکردن[١٦٦]. بەو پێیەش کە دەسەڵاتی عوسمانی راستەوخۆ کۆنترۆڵی بەسەر ئەو میرنشینانەوە نەبوو، بۆیە سنوورێکی بەرێوەبردنی بۆ دیاریکردبوون، کە بگونجێ لەگەڵ داوا و داخوازی هاوڵاتییە کوردەکان، ئەویش لە رێی (شێخ حەکیمەددین ئیدرس بەدلیسی[١٦٧]) کە نێوانگیری دەسەڵاتی عوسمانی و میرنشینە کوردەکان بوو[١٦٨]. پاشان ئەو پەیوەندییە بەهێزتر بوو، ئەویش بەهۆی گرێدانی رێککەوتننامەیەکی دۆستانە لەگەڵ بیست و سێ میری کورد لە ساڵی (١٦٨٣ن). ئەوەش خۆی لە بەشداری کوردەکاندا دەبینییەوە لەگەڵ عوسمانییەکان لە بەرەکانی شەڕ دژ بە دوژمنانی عوسمانی، بە بیانووی" جیهادی پیرۆز"، وەك ئەوەی لە جەنگی نێوان روسیا - عوسمانی روویدا لە (١٨٧٧- ١٨٧٨ن)[١٦٩]. نیکتین ئاماژە بەوە دەکات کە هەزاران کورد لەو شەڕانەدا کوژران، کە لەگەڵ عوسمانییەکاندا بەشداری شەڕیان کردووە[١٧٠].

ئەو میرنشینە کوردییانە لە سەدەی هەژدەوە تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا دەسەڵات و هێزیان زۆر فراوان بوو[١٧١]. بەناوبانگترین ئەو میرنشینانەش بریتی بوون لە :

- میرنشینی سۆران لە رواندز لە کوردستانی عێراق.
- میرنشینی بابان لە سلێمانی لە کوردستانی عێراق.

- میرنشینی بادینان له ئامێدی له کوردستانی عێراق.

- میرنشینی بۆتان له جزیرێ بۆتان له کوردستانی تورکیا[١٧٢].

هەندێك لەو میرنشینانە لە سەدەی نۆزدەی زایینی دەستیان داوەتە شۆڕشی سەربەخۆیی سەرکەوتوو دژ بە دەسەڵاتی عوسمانی. هۆیەکەش ئەوە بوو کە دەوڵەتی عوسمانی کاتێ پشتی دایە فراوان بوونی قەڵەمڕەوییەکەی لە ئەورووپا و ناوچەی خۆرئاوا، رووی وەرگێڕایە لای خۆرهەڵاتو باشوور و راستەوخۆ دەستی کرد بە بەرفراوانکردنی دەسەڵاتی ناوەندی خۆی بەسەر ئەو ناوچانەی کە هەر بەناو حوکمی بەسەردا دەکردن، لە ناویشیاندا ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە هەندێك میرنشینی کوردی تووڕە بکات و بە گژ دەسەڵاتی عوسمانیدا بچنەوە، چونکە ئەوە بە پێشێلکاری رێککەوتننامەکەی پێشووتریان لێکدرایەوە[١٧٣]. ئەوەی زۆرتر هانی دان بۆ ئەو شۆڕش و بەگژ داچوونەوە، ئەو بارودۆخە بوو کە دەوڵەتی عوسمانی تێی کەوتبوو[١٧٤]. کە لە بەرامبەر بە محەمەد عەلی پاشا لە وڵاتی شامو ئاسیای بچووك خۆی لە شکستی یەك لە دوا یەکدا دیتەوە[١٧٥].



بۆرترێتی پاشای گەورە- بەقەڵەمی دیدی

بە ناوبانگترین ئەو شۆڕشو راپەڕینانەی کوردیش بریتی بوون لە :

- راپەڕینی عەبدولڕەحمان پاشای بابان لە سلێمانییە لە ساڵی (١٨٠٦ز).
- راپەڕینی ئەحمەد پاشای بابان لە سلێمانییە لە ساڵی (١٨١٢ز).
- راپەڕینی کوردە زازاییەکان لە سیواس لە ساڵی (١٨٢٠ز).
- راپەڕینەکانی نێوان (١٨٢٩- ١٨٣٩ز) لە ناوچەکانی هەکاریو رواندزو تورعابیدین لە باکووری کوردستان.

- راپەڕینی چیای سنجار (شەنگال) ساڵی (١٨٣٠ن).
- راپەڕینی میری بەدلیس لە ساڵی (١٨٣٤ن).
- راپەڕینی میر بەدرخان لە نێوان ساڵانی (١٨٤٢– ١٨٤٧ن).
- راپەڕینی یەزدان شێر لە هەکاری و بۆتان لە نێوان ساڵانی (١٨٥٣– ١٨٥٦ن).
- راپەڕینی دەرسیم لە ساڵانی (١٨٧٧– ١٨٧٩ن).

هەرچەندە ئەو راپەڕینانە توانییان هەندێك سەرکەوتن لەسەر رێی سەربەخۆیی بەدەست بێنن، بەڵام لە کۆتاییدا لە بەرامبەر دڕندەیی هێزەکانی عوسمانی شکستیان هێنا، کە توانی راستەوخۆ حوکم و دەسەڵاتی خۆی بەسەر کوردستانی بن دەستی عوسمانی بسەپێنێ، تا نزیك سەروبەندی هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم. لە دەرەنجامی ئەو جەنگەشەوە جارێکی دی کوردستان سەرلەنوێ دابەش کرایەوە.

**دووەم: هەڵوێستی کورد لە هێرشی فەڕەنسی بۆ سەر میسر:**

کاتێك فەڕەنسا لە هەڵمەت و هێرشدا لە (١٧٩٨– ١٨٠١ن) میسری داگیرکرد، عوسمانلی لەهەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتەکەی فرمانێکی راگەیاند، بەهۆیەوە داوای کۆکردنەوەی ئەو گەلانە دەکرد کە دژی داگیرکاری فەڕەنسی بوەستن. ناوچەی کوردستانیش یەکێك لەو ناوچانە بوو فرمانەکەی تێدا راگەیاندرا. محەمەد تەیمور[١٧٦] کە ئەوکات لە زێدی خۆی لە قەرەجۆلان دەژیا کە لە کوردستانی عێراقە (مەبەست لە قەڵاچوڵانە– و) دەگێرێتەوە کە" نێردراوێك لەلایەن بابلعالییەوە (بابلعالی وشەیەکی تورکییە بە مانای بارەگای سەرۆك وەزیران دێت، سوڵتان محەمەدی چوارەم دایهێناوە، دواتر ئەو ناوە بەو کەسە گوتراوە کە تێیدا فەرمانڕەوا بووە، واتە بە سەرۆك وەزیران گوتراوە بابلعالی– لە ویکیپیدیاوە– و) لە (١٥ی کانوونی یەکەمی ١٧٩٨ن) هاتۆتە لایان و لە دۆخێکی ترسناکدا فرمانەکەی بۆ خوێندوونەتەوە[١٧٧]. کە تێیدا هاتبوو

"ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ترس و خەتەر دایە، پۆناپێرتی گاور بەرەو خاکی ڕۆژهەڵاتی پیرۆز هێرشی هێناوەو میسری لانکەی شارستانیەت و قەڵای تورکانی داگیر کردووە، بۆیە جەنگمان دژ بە فەرەنسا ڕاگەیاندووە". ئەو هەواڵە ناخۆشە لە شکۆ و ناوبانگی هاوڵاتییانی کوردی دا[178].

دەسەڵاتی عوسمانی سوپایەکیان پێکهێنا بۆ وەدەرنانی فەرەنسییەکان لە میسر و گەڕاندنەوەی بۆ ژێر کۆنترۆڵی خۆیان، ئەویش بە کۆمەك و هاوکاری بەریتانیا، کە دوژمنی فەرەنسای ناحەزی بوو. لەنێو ئەو سوپا عوسمانییەدا هەڵمەتێك لە ۳۰۰ جەنگاوەرانی قۆلە ڕێکخرا[179]، لە سەروویانەوە عەلیاغای کوڕی سەرکردەی برواستا و بە جێگرایەتی محەمەد عەلی بە پلەی موقەددەم. لەکاتی تێپەڕبوونی هێزەکانی تورکیا، لەناویشیاندا هەڵمەتەکەی قۆلە بە پانایی دەریای ناوەڕاست رووە و میسر، زریانێکی بەهێز لە نزیك کەنارەکانی دوورگەی ڕۆدس هەڵیکرد، بووە هۆی هەڵگەڕانەوەی شەپۆلەکانی دەریا بە شێوەیەکی ترسناك، خەریك بوو هەندێ لە پاپۆڕەکانی تورك نوقم بکات، بۆیە ناچار بوون لە ڕۆدس لەنگەر بگرن. لە هەمان کاتدا کەشتییەکی بەریتانی بە سەرۆکایەتی (سیدنی سمیس) لەسەر لێوارەکانی دورگە لەنگەری گرت، کە دوای شکانی فەرەنسییەکان لە عەککاوە بەرەو میسر دەهات، بۆ دیتنی کەشتییەکانی تورکی لەسەر لێوارەکانی ئەسکەندەرییە[180].

بەڵام ئەو کەشتییەی کە محەمەد عەلی پاشا و یەکە سەربازییەکەی هەڵگرتبوو، تووشی شەپۆلێکی زۆر دژوار هاتن، بەجۆرێك کە بەدەوری خۆیدا دەسوڕایەوە، پاشان بە بەردێکی گەورەیدا کێشاو شکاندی و کردی بە دوو پارچە و نقوم بوو. ئەوانەی کە لەسەر پشتیشی بوون خۆیان فڕێ دایە ناو ئاوەکە، بەو ئومێدەی کە بە مەلەوانی رزگاریان بێت. فەرمانده سیدنی سمیس هێشتا هەر لەسەر پشتی کەشتییەکەی (تایگەر) بوو، بۆیە بە خێرایی لێیخوڕی و دە فریای ئەوانە چوو کە خۆیان فڕێدابووە ناو ئاوەکە و هەڵیکێشانە سەر پشتی

کەشتیەکەی و دواتر گەیاندنیە کەنارەکە، محەمەد تەیموور[181] کە وەك وەرگێڕ لەگەڵ سوپای تورکان دابوو، خێرا هات بۆ یارمەتی دانی دەربازبووان. محەمەد تەیمور دەڵێت "لەناویدا کەسێکی جوامێرم بەرچاوکەوت کە زۆر تەڕ بوو، سەربازێکی تورکی لەخۆچووی لەبن هەنگڵی خۆی نابوو، بردی لە شوێنێکی پارێزراوی دانا و هەوڵی ئەدا بەهۆشی بێنێتەوە، لێی نزیك بوومەوە تا رزگاری بکەم، دوای ئەوەی کە مەترسییەکەیان لەسەر نەما، کابرای جوامێر بە تورکییەکی نارەوان پێی گوتم : زۆر سوپاست دەکەم بۆ یارمەتیدان، ناوم محەمەد عەلییە، من یەکێکم لە یەکەیەکی سێسەد سەربازی تورکی کە لە قۆلە بەسەرباز کراون بۆ رزگارکردنی میسر، ئەوەی لەولاوە راکشاوە فەرماندەی یەکەکەمانە و منیش پلەم موقەددەمە"[182].

کاتێك محەمەد عەلی دەزانێ محەمەد تەیمور دەتوانێ بە فەرەنسی بئاخڤێ، ئەوا ئەویش کە زمانی فەرەنسی باشتر دەزانی لە تورکی، داوای لێکرد بە فەرەنسی بدوێ، کە لەسەر دەستی فەرەنسییەك فێر ببوو، لەوانەی لە بازرگانی تووتن لە قۆلە مامەڵەی لەگەڵدا کردبوو[183].

لەوکاتەوە پەیوەندی لەنێوان محەمەد عەلی پاشا و محەمەد تەیمور دروست بوو، کە بووە مایەی هاوڕێیەتییەکی پتەو لە نێوانیان و بەدرێژایی رێی سەفەر بەرەو میسر و بە درێژایی هێرش و چالاکییە سەربازییەکان تا وەدەرنانی فەرەنسییەکان لە میسر لەیەکتر دانەئەبڕان. هەریەکەو باسی لە ژیانی خۆی و ناوچەکەی و کارەکانی بۆ ئەوی تر کرد. دوای وەدەرنانی فەرەنسییەکان لە میسر و خۆئامادەکردنی هێزەکانی تورك بۆ گەڕانەوە، محەمەد عەلی لە محەمەد تەیمور نزیك بووەوەو گوتی "جارێکی تر یەکدی دەبینینەوە، بێگومان لە میسر، وا هەست دەکەم کە ئێمە بتوانین شوێنپێیەکی زۆر گەورەمان هەبێت لەو وڵاتە، من باوەڕم بە بەخت و بۆچوونەکانم هەیە"[184].

لەلایەکی دیکەوە دەسەڵاتداری عوسمانی سەرکردەیەکی دیکەی کوردیان

راسپاردبوو بەناوی (حاجۆ) لە ویلایەتی وان بۆ کۆکردنەوەی سەربازانی کوردی زۆر ئازا و گیانفیدا لە پێناو خودا و یەکەیەکیان پێکهێنا و چوونە ناو ئەو سوپا عوسمانییەی فرمانی پێکرابوو بەرەو میسر بکەوێتە ڕێ، بۆ وەدەرنانی فەڕەنسییەکان.

بەمجۆرە یەکەیەکی سەربازی کوردان دروست بوو کە نزیکەی هەزار گیانفیدای هەرە ئازای گرتبووە خۆ. حاجۆشیان وەك "دەلیل پاشا واتە بێکباشی" لەسەر یەکەکە دانا، ئەو یەکە سەربازییەی کوردان لە هەموو کردەو چالاکییەکی سەربازیدا بەشداری کرد، کە لەنێوان سوپای عوسمانی‌و سوپای فەڕەنسی لە میسر ڕوویاندا.

کاتێکیش کە سوپای عوسمانی لە ساڵی (١٨٠٠ز) لەبەرامبەر سوپای فەڕەنسی بە سەرکردایەتی (کلیبەر) بەرەو خانکە کشایەوە، حاجۆ پارێزگاری لە دواوەی سوپای کشاوەی عوسمانی دەکرد[١٨٥]. پێدەچێ ئەو یەکە سەربازییەی حاجۆ لەگەڵ محەمەد عەلی پاشا لە میسر مابێتەوەو لەگەڵ سوپای عوسمانی نەگەڕابێتەوە، بەو پێیەی کە دواتر حاجۆ بوو بە یەکێك لە گرنگترین سەرکردەکانی سوپای محەمەد عەلی، وەك لە داهاتوودا باسی لێوە دەکەین.

بەمشێوەیە کورد لەناو سوپای عوسمانی ڕۆڵی هەبووە لە بەگژداچوونەوە هێرشی فەڕەنسی بۆ سەر میسر، ئەویش بە پاڵنەری جیهاد و پاککردنەوەی وڵاتی موسڵمانان لە داگیرکارە غەیرە موسڵمانەکان.

**ڕۆڵی (سلیمان الحلبی الکوردی):**

ژمارەیەك لەو قوتابییانەی لە ئەزهەری شەریف دەیانخوێند، لە ڕووبەڕووبوونەوەی داگیرکاری فەڕەنسی بۆ سەر میسر بەدەرکەوتن، یەکێك لەوانەی کە مێژوو بە نەمری هێشتوویەتیەوە، قارەمانی کورد (سلێمان حەلەبی) بوو، کە گیانی خۆی کردە قوربانی بیروباوەڕەکەی و خاکی میسر.

لەبەر گرنگی پێگەی ئەو کەسایەتییە، وا تیشك دەخەینە سەر ڕۆڵی ئەو لە

بەرگری و ڕووبەڕووبوونەوەی هێرشی فەڕەنسی.


(سلێمان محەمەدەمین ئەوسی

ناوی سلێمان محەمەدەمین ئەوسی قوبار بووە و لە ماڵباتی عوسمان قوبار، ناسناوەکەشی سلێمان حەلەبی بووە، لە ساڵی (١٧٧٧ز) لە گوندی کوکەنی سەروو لە ناوچەی عفرین لە باکووری ڕۆژئاوای شاری حەلەب، لە کوردستانی سوریە بووە، لە حەلەبدا ژیاوە، دواتر لە ساڵی (١٧٩٧ز) باوکی ناردوویەتی بۆ میسر بۆ ئەوەی لە ئەزهەری شەریف بخوێنێ، لەوێ پەیوەندییەکی پتەوی بە مامۆستاکەی خۆی (شێخ ئەحمەدی شەرقاوی) یەوە هەبووە، ناوبراو خۆبەدەستەوەدانی بۆ داگیرکاری فەڕەنسی ڕەت کردۆتەوە و ڕۆڵی هەبووە لە هەلگیرساندنی بلێسەی ڕاپەڕینی یەکەمی قاهیرە لە (٢١ی تشرینی یەکەمی ١٧٩٨ز). سلێمان حەلەبی لە تەك مامۆستاکەیدا بوو لەوکاتەی کە سوپای ناپلیۆن پێی نایە خاکی جیزە، پاشان خاکی قاهیرە. وە بەهۆی ئەو کردەوە سەرکوتکارییانەی کە فەڕەنسییە داگیرکارەکان دژ بە گەلی میسری ئەنجامیان دەدا، ڕاپەڕینی یەکەمی قاهیرە لە زانکۆی ئەزهەر ڕوویدا. داگیرکارانی فەڕەنسیش بە گوللەی تۆپەکانیان وەلامیان دانەوە و قودسییەتی ئەزهەریشیان پێشێل کرد و بە سمی ئەسپەکانیان پیس کرا. حوکمی لەسێدارەدانی شەش کەس لە شێخەکانی ئەزهەریان دەرکرد، یەکێکیان شێخ ئەحمەدی شەرقاوی مامۆستای سلێمان حەلەبی بوو. دوای ئەوەی کە داگیرکاران توانییان بلێسەی ڕاپەڕینی یەکەمی قاهیرە دابمرکێننەوە، جەور و ستەمکارییان چەندبارە زیادی کردو تۆڵەشیان لە هەموو ئەوانە کردەوە کە گومانی جیهاد و بەرگری نیشتمانییان لێ دەکردن. ئەوانەی کە خۆیان حەشاردا لەبەر چاوان ون بوون، ئەوانەش کە ڕایانکرد لەمیسر دەرچوونە دەرێ. یەکێك لەوانەی کە لەمیسر چووە دەرێو ڕووی کردە وڵاتی شام، سلێمان حەلەبی

بوو. دوای سێ ساڵان رووی کردەوە زادگای خۆی لەگوندی کۆکەن لە عەفرین. لەوێ پەیوەندی کرد بە یەکێك لە فەرماندەکانی عوسمانی لەحەلەب بە ناوی ئەحمەد ئاغا (ناوبراو لە ئینکشاریەی ئیبراهیم بەگ بوو). (ئینکشاریە ناوی پلەو دەستەیەکی سەربازی پیادەی تورکی عوسمانی بووە، رێکخستنێکی تایبەت بەخۆیان داناوەو نیشانەو رەمزو ئیمتیازاتی تایبەتیان هەبووە، گەورەترین‌و خاوەن نفوزترین یەکەی سوپای عوسمانی بوونە. مێژوونووسان سەرەتای دروستبوونیان دەگێڕنەوە بۆ سەردەمی "ئۆرخانی دووەم- ساڵی ١٣٢٤ز" کە نەیدەهێشت ژن بێنن، بەڵام لەسەردەمی"سوڵتان مرادی یەکەم لە ساڵی ١٣٦٠ز ئەو شکڵ‌و شێوازە بەردەوامەیان وەرگرت‌و رێگاش بە بەتەمەنەکان درا ژن بێنن. سەربازەکانیان هەر لە منداڵییەوە دەخرانە ریزی سوپا. ئەو سەربازانە بە ئازایی، ئارامگرتن، پابەندبوون بە سوڵتان ناسرا بوون. ئەو یەکە سەربازییە لەکاتی شۆڕشی "سوڵتان مەحمودی دووەم- ساڵی ١٨٢٦ز" لە ئاستانە لەناو بردران، کە بە رووداوی قەسابخانەکەی ئینکشاریە ناسراوە- لە ویکیپیدیاوە- و). ئەویش رایسپارد کە بچێتەوە میسر بۆ جیهادو فرمانی پێکرد ژەنەراڵ کلیبەری جێگری ناپلیۆن بکوژێ. بۆیە سلێمان لە ئازاری ساڵی (١٨٠٠ز) رووی خۆی کردەوە لای میسر و لەسەر رێگای خۆی نوێژی لە مزگەوتی ئەقسا کرد. دواتر رۆیشتە خەلیل بۆ لای ئیبراهیم بەگ و پیاوەکانی، کە لە چیای نابلس بوون. پاش بیست رۆژ لە مانەوەی لە خەلیل، لە نیسانی (١٨٠٠ز) چووە غەززەو بوو بە میوانی یاسین ئاغا لە مزگەوتی گەورە، کە یەکێك بوو لە هاوەڵانی ئیبراهیم بەگ. سلێمان نامەیەکی ئەحمەد ئاغای، کە لە حەلەب دادەنیشت دایە دەست یاسین ئاغا، نامەکە پەیوەست بوو بە پلانی راسپاردنەکەی بۆ کوشتنی کلیبەر. یاسین ئاغاش کاروانێکی وشتری لەگەڵدا بەڕێ کرد، کە باری سابوون و توتنی دەبردە میسر، ٤٠ قرۆشیشی دایێ بۆ خەرجییەکان و کڕینی خەنجەرێك لە غەززە ( هەمان ئەو



خەنجەرەی کە سلێمان ژەنەراڵ کلیبەری پێ کوشت). ئەو کاروانە لە غەززە بۆ قاهیرە شەش رۆژی خایاند. کاتێك کە سلێمان حەلەبی گەیشتە قاهیرە پەیوەندی کرد بە کۆمەڵێك قوتابی ئەزهەر، لەوانەی لە حوجرەی شامییەکان لە ئەزهەری شەریف نیشتەجێ ببوون و نیازی خۆی بۆ کوشتنی ژەنەراڵ کلیبەر پێ راگەیاندن، کە گیانی خۆی نەزری جیهاد کردووە لە پێناو رزگارکردنی میسر لە داگیرکاران. رەنگە ئەوان قسەکەیان بە هەند وەرنەگرتبێ. بەیانی رۆژی (١٥ی حوزەیران ١٨٠٠ز) سلێمان حەلەبی رووی کردە سەرکانی ئۆزبەکی، ئەو شوێنەی کە ژەنەراڵ کلیبەر تێیدا نیشتەجێ ببوو، دوای ئەوەی کلیبەر لەگەڵ ئەندازیاری گەورەی فەرەنسی (قوستنتین بروتاین) لە کۆشکەکەی تەنیشت شوێنی نیشتەجێ بوون لە نان خواردن بوونەوە، چوونە ناو باخچەی کۆشك، ئا لەوکاتە سلێمان توانی چوار خەنجەری کوشندە لە ژەنەراڵ کلیبەرو شەش خەنجەری کوشندەش لە شوێنی جیاجیای لەشی ئەندازیارەکە بدات. چارەنووس وا رێکەوت کە دەستگیری بکەن و دادگاییەکی سەربازی فەرەنسی بۆ ئەنجامدرا و دوای ئەوەی کە دەستی راستەی داغ کرا، بە حوکمی لە سێدارەدان لە چوارمێخەك دراو بەجێیان هێشت بۆ ئەوەی ببێتە خۆراکی خەرتەڵو داڵاش. ئەو حوکمە لە رۆژی (١٨ی حوزەیرانی ١٨٠٠ز) لە تەلانێکی سەخت بەسەریدا جێبەجێ کرا. لاشەکەی سلێمان چەند رۆژان بە چوارمێخەکدا مایەوەو باڵندەی گۆشتخۆر و گیانەوەرە دڕەندەکان لێیان دەخوارد. لە تەنیشت ئەویشدا سەری سێ لە شێخەکانی ئەزهەریان هەڵواسی، بە تۆمەتی ئەوەی کە ئاگاداری پلانەکەی سلێمان بوونە، بەڵام نەیاندرکاندووە. بۆیە لاشەکەیان سووتاندن تا بوون بە خەڵوز. ئەمەش



دوای ناشتنی ژەنەراڵ کلیبەر بە ئاهەنگو ڕێوڕەسمێکی گەورەو فەرمی لە شوێنێکی نزیك لە کۆشکی ئەلعەینی بوو لە قاهیرە. پاشان لاشەکەیان لەناو تابووتێکی قورقوشمیدا پێچا و ئاڵای فەرەنسایان تێوەرگرت. خەنجەرەکەی سلێمان حەلەبیشیان لەسەر ئاڵاکە دانا. دواتر ئێسکەکانی ژەنەراڵ لە سندوقێکدا و ئێسکانەکانی سلێمان حەلەبی لە سندوقێکی تر پێچران و ناردرانەوە بۆ فەرەنسا. دوای دروستکردنی مۆزەخانەی (ئینفالید– شەهیدان) لە پاریس، دوو ڕەفە لە هۆڵێك تەرخان کران بۆ کاسە سەرەکان، ڕەفەی سەرەوە بۆ کاسە سەری ژەنەراڵ کلیبەر و ڕەفەی خوارەوە بۆ کاسەسەری سلێمان حەلەبی، لە تەنیشتیشیاندا تابلۆیەکی بچووك داندراوە و تیایدا نووسراوە: "کاسەسەری تاوانبار سلێمان حەلەبی"، تا ئێستاش ئەو دوو کاسەسەرە لەو مۆزەخانەیە داندراون، هێشتاش ئەو خەنجەرەی کە ژەنەراڵ کلیبەری پێ کوژراوە لەشاری کارکاسۆن لە فەرەنسا پارێزراوە[١٨٦].

بەم شێوەیە سلێمان حەلەبی کوردی گیانی خۆی بەخشی بۆ بەرگری لە میسرو خەڵکەکەی. وە لەڕێی بەرجەستەکردنی مانای برایەتی کە گرێنەدراوە بە سنوورو بە بەرژەوەندی، بۆیە سلێمان بە قارەمانێکی ڕاستەقینە دادەنرێت، یەکێکیشە لەو لاوە شەهیدانەی ئیسلامو ئازادیو نیشتمان. ئەرکی سەرشانی ئێمەشە هەوڵ بدەین بۆهێنانەوەی ڕوفاتو خەنجەرەکەی بۆ باوەشی گەلو وڵاتەکەی.



## سێیەم: محەمەد عەلی پاشا و ڕەچەڵەکە کوردیەکەی:

لە زۆرێك لەو سەرچاوە و ژێدەرانەی باسی ژیانی محەمەد عەلی پاشای گەورەیان کردووە، هاتووە کە بنەچەکەکەی تورکی یان ئەلبانییە و لە شاری قۆلە را هاتووە[١٨٧] بۆ میسر. بەڵام هەندێك سەرچاوەی دروست لەبەردەستن کە بە جۆرێکی ترن، تیایاندا روون کراوەتەوە ئەگەر محەمەد عەلی هەر بە راستی لە قۆلەوە کە سەر بە ئەلبانیایە هاتبێتە میسر، مانای وا نییە بنەچەکەکەشی ئەلبانی بێ. سەرچاوە دروست و جێ باوەڕەکان دەیانخستووە بنەچەکەی محەمەد عەلی پاشا کوردییەو دەگەڕێتەوە بۆ کوردانی دیاریەکر لە باکووری کوردستان، کە ئێستا دەکەوێتە نێو سنووری سیاسی تورکیا.

ئەمەش لەلایەن میر محەمەد عەلی نەوەی محەمەد عەلی پاشا بووە، کە جێنشینی مەلیك فارووقی مەلیکی میسریش بووەو لە چاوپێکەوتنێکی دوورو درێژدا لەگەڵ نووسەری گەورە مەحمود عەباس ئەلعەققاد ئەمەی پشتڕاست کردۆتەوەو لە رۆژنامەی "المصور"ی میسری لە (٢٥ی تشرینی دووەمی ١٩٤٩ن) دا لەژێر ناونیشانی "شازادەی جێنشین لە بارەی بەخێوکارەوە بۆی باس کردم" بڵاوکراوەتەوە، کە بە بۆنەی تێپەڕبوونی سەد ساڵ بەسەر کۆچی دوایی دامەزرێنەری میسری نوێ "محەمەد عەلی پاشا" ئەنجام دراوە.
لەناوەڕۆکی دیدارەکەدا لەژێر ناوی "دیاریەکر نەك قۆلە"دا هاتووە، ئەمە پوختەی وتەی عەققادە و دەڵێ: "سەبارەت بە ناوی محەمەد عەلی، لە خاوەن شکۆ واتە لە میر محەمەد عەلیمان پرسی، گوتی ناوێکی لێکدراوەو لە دوو ناو پێکهاتووە، گوزارشت لە خۆشەویستی ماڵباتی پێغەمبەر دەکەن، یەکەمیان ناوی پێغەمبەرە (سڵاوی خوای لێ بێ) و ئەوی تریان ناوی ئیمام عەلییە (خوا لێی رازی بێ). نازانین داخۆ ئەو دووبارەبوونەوەی ناوە پێشینەیەکی هەبێ لە مێژووی کۆن. ئایا دەبێ سەبارەت بەو تێکەڵکێشییە هەواڵێکی هەبێ؟ خاوەن شکۆ دەڵێت: "نازانم، مافی گومانکردنیش لە شتێك بە خۆم نادەم، کە

نایزانم" ، بەڵام دەمەوێ شتێکتان پێ بڵێم کە زۆرتان تووشی سەرسامی دێن سەبارەت بە دروست بوونیماڵباتی عەلەوی، (واتە ماڵباتی محەمەد عەلی پاشا). وا بڵاو بوو کە ئەوان لە نزیك قۆلە لە وڵاتی ئەلبانیا ژیاون، بەڵام ئەوەی من لە کتێبێکدا لێی تێگەیشتم کە لە نووسینی قازی میسر[188] بوورە لە سەردەمی محەمەد عەلی پاشا ئەوەیە، کە بنەچەکە و رەچەڵەکی ئەو ماڵباتە هی دیاربەکرە لە وڵاتی کوردان، دواتر باوکی محەمەد عەلی و براکەی روویان کردۆتە قۆلە و یەکێك لە مامەکانیشی چۆتە ئاستانە و مامەکەی تریشی بەدوای کاری بازرگانیدا رۆیشتووە. باوکی محەمەد عەلیش لە قۆلەدا ماوەتەوە". عەقاد درێژەی دەداتێ و دەڵێت: "ئەوەی ئەو سەربوردەیە زیاتر پشتڕاست دەکاتەوە ئەوانەیە کە لە زمانی میر حەلیم گێڕدراونەتەوە (ناوبراو یەکێك بووە لە نەوەکانی محەمەد عەلی) و ئەو بنەچەکەی ماڵباتەکەیان دەگێڕێتەوە بۆ دیاربەکر لە وڵاتی کوردان". عەقاد بەمشێوەیە تێبینی خۆی لەسەر ئەوەی رابردوو دەردەبڕێ و دەڵێت :" شەرەفێکی گەورەیە کە وڵاتی کوردان دوو قارەمانی نەمری پێشکەش بە جیهانی ئیسلامی کردوون، کە سەلاحەددینی ئەییوبی و محەمەد عەلی پاشای گەورەن. کە لە پێگەیشتنی یەکەمین یەکدەگرنەوە کە کوردبوونە، هەروەها لە بوژانەوەدا لە میسر یەکدەگرنەوە و لە خاوەندارێتی قەڵای یوسفییەش، واتە قەڵای سەلاحەددین لە قاهیرە، کە دروستکردنەکەی بۆ سەلاحەددین و نۆژەنکردنەوەشی بۆ محەمەد عەلی گەورە دەگەڕێتەوە"[189].

گفتوگۆیەکیشمان لەگەڵ میر عەباس حەلیم سەبارەت بە رەچەڵەکی ماڵباتەکەی ئەنجامدا (ناوبراو لە نەوەکانی ماڵباتی محەمەد عەلی پاشایە)، ئەو بۆی دووپات کردینەوە، کە ئەو هەمیشە لە کەس و کار و خزمە نزیکەکانی خۆی بیستووە، ماڵباتەکەیان لە کوردە رەسەنەکانن. ئەوەش روون دەکاتەوە کە ماڵباتەکەیان لە دیاربەکرەوە روویان کردۆتە قۆلە لە وڵاتی ئەلبانیا، لەوێوە



(وێنەی ماڵباتی محمد علی پاشا)

محەمەد عەلی هاتۆتە میسر و ئەوەی تر زانراوە چۆن بەشداری لە لەناوبردنی هێرشی فەرەنسییەکان کردووە لە (١٧٩٨-١٨٠١ز). کاتێکیش سەبارەت بە بەڵگەی بەردەست لێمان پرسی، گوتی : وەلی عەهد میر محەمەد عەلی چەندین نووسراوی لە کۆشکەکەیدا هەنە، واتە لە کۆشکی میر محەمەد عەلی لە (منیل)، لە هەندێك لەو نووسراوانە باسی بنەچەی کوردیان کردووە بۆ ماڵباتی محەمەد عەلی[١٩٠]. زیاتر لە جارێکیش هەوڵماندا بچینە کۆشکەکە، بەڵام نەیگەیشتینێ، ئەویش بەهۆی نۆژەنکردنەوەی تا کاتی بە چاپ گەیشتنی کتێبەکە.

لەلایەکی ترەوە دکتۆرە (عفاف لوطفی السید) لە دیدارێکی لەگەڵ میر عەباس حەلیم پشتڕاستی دەکاتەوە، ئەوەی بەردەوام لە خێزانی محەمەد عەلیدا دووپات کراوەتەوە ئەوەیە کە ماڵباتەکەیان بە رەسەن کوردن و خەڵکی یەکێك لە گوندەکانی خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵن، کە پێی دەگوترێت "ئیلیچ" و کاری بازرگانی ئەسپیان کردووە. لە سەردەمێکی تردا ئەو ماڵباتە روویان کردۆتە شارۆکەی (عومەر بوکێر)، پاشان عوسمان ئاغا و ئیبراهیمی باوکی سەرەتا روویان کردۆتە قۆنیە، دواتر بەهۆی بەشدارییان لە شۆڕشێك، لە ترسی تۆڵە لێکردنەوە چوونەتە قۆلە[١٩١].

هەر لەعبارەیەوە لە مەلیك ئەحمەد فوادمان پرسی، وەڵامی داینەوە: "زۆرجار لەناو ماڵی خۆمان لە کەس و کار و نزیکەکانم بیستووە، کە بنەچەی ئێمە کوردی رەسەنە، بەڵام من دەرفەتی ئەوەم بۆ هەڵنەکەوتووە لێی دڵنیا بم".

بۆ زیاتر دڵنیابوون لەو بابەتە، رووی پرسیارمان لە بەڕێز "ماجد فرج" کرد، کە

مێژوونووسی ماڵباتی مەلیك بووە، دەربارەی بنەچەکەی محەمەد عەلی پاشامان لێ پرسی، گوتی:" ئەوەی لای من روون و ئاشکرایە ئەوەیە، کە ئەوان ئەلبانی رەسەن نین، بەڵام سەبارەت بە کورد بوونیان، لەبەر ناشارەزاییم پێیان، وا رێکنەکەوتووە کە رووبەڕوویان ببمەوە". داواشی لێمان کرد کە ئەگەر ئێمە بەڵگەنامەیەکمان هەبێ بنەچەکە کوردیەکەیان پشتڕاست بکاتەوە بیدەینە دەست، تا بیخاتە سەر کتێبە تایبەتییەکانی خۆی لە چاپە نوێیەکەدا[١٩٢].

## کورتەی ژیانی محەمەد عەلی پاشای دامەزرێنەری میسری نوێ:

محەمەد عەلی پاشا لە ساڵی (١١٨٣ك) لە شارۆکەی قۆلە، کە بەندەرێکی بچووکی سنووری نێوان تراقیا و مەقدۆنیایە، لەدایك بووە. دوای ئەوەی ئیبراهیم ئاغای باوکی کۆچی دوایی کردووە، تۆسۆنی مامی بەخێوی کردووەو فێری ئەسپسواری و شیربازی بووە. پەیوەندی کردووە بە سوپای عوسمانییەوە و خزمەتی فەرمانداری قۆلەی کردووەو بە زیرەکی و توانای خۆیەوە بۆتە مایەی رەزامەندی ئەو. لەدەوروبەری ئەویشەوە، بە تایبەتی لەوانەی کە چەندین زمانیان دەزانی زۆر ئەزموون و دەسکەوتی وەچنگ هێناوە، نەخاسمە لە زمانی فەرەنسیدا. محەمەد عەلی لە تەمەنی سی ساڵیدا بوو کاتێ بابی عالی سوپای کۆ کردەوە بۆ هێرش بردنە سەر سوپای فەرەنسی بە سەرکردایەتی ناپلیۆن بۆناپارتی داگیرکاری میسر لە (١٧٩٨- ١٨٠١ن)[١٩٣].

## بوون بە والی بەسەر میسرەوە:

دوای ئەوە محەمەد عەلی وەك جێگری سەرۆکی کەتیبەی قۆلە لە سوپای کابتن حوسێن پاشا بۆ وەدەرنانی فەرەنسییەکان هاتۆتە میسر، پاش دەرکردنی فەرەنسییەکانیش هەر لە میسردا مایەوە. کە سوپای عوسمانیش لە ساڵی (١٧٩٩ن) لە ناوچەی ئەبی قیر شکان، سەرکردەی ئەو تیپە گەڕایەوە وڵاتی




خۆی و محەمەد عەلی جێگای ئەوی گرتەوە و پلەی بێکباشیشی پێدرا.
پاش دەرچوونی فەرەنسییەکانیش لە میسر لە ساڵی (١٨٠١ز)، میسر بە سەردەمێکی راگوزەری ناجێگیردا تێپەڕی و میسرییەکان بەهۆی حوکمڕانی والی تورکی خورشید پاشا ژیانیان لێ وەتەنگ هات، ئەمە وای لە زانایانی ئەزهەر کرد لە (١٨٠٥ز) بچنە لای محەمەد عەلی و داوای لێ بکەن ببێتە والی بەسەر میسرەوە و پێیانگوت :" ئێمە دەمانەوێ تۆ ببیتە والی بەسەرمانەوە، بەو مەرجانەی لەتۆدا بەدی دەکەین لە دادپەروەری و چاکەکاری"[١٩٤] . سوڵتانی عوسمانیش فرمانێکی دەرکرد و بڕیاری دا محەمەد عەلی ببێتە والی بەسەر میسرەوە.

محەمەد عەلی دەستی کرد بەکارکردن بۆ بەرپاکردنی ئارامی بارودۆخی ناوخۆیی و دەرەکی میسر. توانی لە جەنگی رەشید لە ساڵی (١٨٠٧ز) بەسەر ئینگلیزدا سەرکەوێ، هەروەها توانی لە کوشتاری قەڵای شەهیرە لە (١٨١١ز) بەسەر مەمالیکەکاندا سەرکەوێ. پاشان میسری لە دۆخێکی ناجێگیردا گەیاندە دۆخێکی سیاسی جێگیر و دەستی کرد بە ئاوەدانکردنەوەو بەهێزکردنی پێگەی میسر لەنێو وڵاتە گەورەکاندا. رووی کردە چاکسازی ناوەخۆ، سەرەتا بە دامەزراندنی سوپایەکی رێکخراوی بەهێز، لە مەشق و راهێنانیشدا ئەو فەرەنسییانە یارمەتییان دا، کە محەمەد عەلی پاشا داوای کۆمەکی لێ کردبوون.
پاشان محەمەد عەلی هەڵسا بە هێرش بردنە سەر دەوروبەری، لەوانە : لە ( ١٨١١-١٨١٨ز) هێرشی بردە سەر وەهابییەکانی حیجاز و نەجد و خستنیە ژێر فەرمانڕەوایی خۆی. ئینجا رووی کردە سودان و لە ساڵی (١٨٢٠ز)ەدا گرتی.

هەروەها دەستی گرت بەسەر شام، لە ساڵانی (١٨٣٣- ١٨٣٩ن) دوو جاری یەك لەدوای یەك سەركەوت بەسەر عوسمانییەكان. سەرەنجام دەرگاكانی ئاستانە (كە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی بوو) بەروویدا كرانەوە، بەڵام دەوڵەتە گەورەكانی ئەوكات (روسیا و بەریتانیا و فەرەنسا) بەمە رازی نەبوون و هەڵسان بە یارمەتی دانی سیاسی و سەربازی بۆ سوڵتانی عوسمانی. دوای ئەو هاوپەیمانێتییە و شكانی سەربازی محەمەد عەلی و تێكشاندنی كەشتیگەلیەكەی لە نفارین، ناچاریان كرد بكشێتەوە و لە رووی سیاسیی سنووورداری بكەن، ئەویش بەپێی بەندەكانی رێككەوتننامەی لەندن و پاشكۆكانی رێككەوتننامەكە لە (١٨٤٠- ١٨٤١ن)، كە بەسەریاندا سەپاند پێكهاتەی سوپای میسری سنووردار بكات و تەنها حوكمی میسر بكات بە حوكمێكی زاتی و دوای ئەویش كوڕە گەورەكەی جێگای بگرێتەوە.

**دەسكەوتەكانی:**

سەردەمی محەمەد عەلی چەندین دەسكەوت و چاكسازی جۆراوجۆری بەخۆوە دیت، وەك (پەروەردە، كشتوكاڵ، پیشەسازی، بازرگانی، سوپا،....تد)، چەندین قوتابخانەی دروست كردن، چەندین نێردەی ناردنە وڵاتانی ئەوروپا بۆ وەرگرتنی زانست، رۆژنامەی (وقائع) رووداوەكانی میسری دەركرد، كارگەو كارخانەی دروستكردن بۆ ئەوەی پێویستی بە وڵاتانی بیانی نەبێ لە دابینكردنی پێداویستییەكانی سوپا و كەشتیگەلیەكەیەكان. هەروەها زەوییەكانیشی بەسەر جوتیارەكاندا دابەش كرد، بەجۆرێك كە هەر زەوییەك بۆ داچاندنی جۆرێك دانەوێڵەی دیاریكراو بێت و داهاتەكەشی نزیكەی تێچووی سامانی میر دەبوو. هەروەها چاكسازیشی لە بواری كشتوكاڵدا ئەنجاسدا و چەندین ئامێری نوێشی بۆ دەستەبەر كردن، وە چەندین جۆری كشتوكاڵی نوێشی هێنایە میسر، وەك چاندنی لۆكە و قامیشی شەكر. لەبواری ئاودێریشدا چاكسازی ئەنجامدا و چەندین دەروازە و پردی دروست كردن، بەناوبانگترینیان

پردی خەیری بوو. لە بواری بازرگانیشدا پێگەی بەرزی میسری قۆستەوە و گرنگی دایە بەندەری دەریاوانی و رێگای گواستنەوەشی بۆ فەراهەم کرد.

لە بواری سەربازیشدا هەڵسا بە ئامادەکردنی سوپایەکی بەهێزی میسری[195]. میسریەکانی بانگکردە ریزی سوپا و قوتابخانەی سەربازی دامەزراندن، بناغەی یەکەی سەرەتایی دەریاوانی دانا و کەشتیگەلی میسری دامەزراند، ئەو کەشتیگەلە چەندین جەنگی یەکلاکردەوەو سەرکەوتنی تێدا بەدەست هێنا، گرنگترینیان: جەنگی مورە لە ساڵی (١٨٢٧ن)، جەنگەکانی شام لە ساڵی ( ١٨٣٢- ١٨٣٩ن). هەروەها خانەی پیشەسازی دەریایی لە ئەسکەندەرییەدا دامەزراند، کە ئێستا پێی دەگوترێت (جبەخانەی دەریایی)، ئەویش بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی کەشتیگەلی میسری. هەروەها چەندین چاکسازی لە بەڕێوەبردن و کارگێڕی میسریدا ئەنجام دا، ئەنجوومەنی دیوانەکان و دیوانی باڵای دامەزراند، کە بارەگاکەی لە قەڵا بوو، والیش سەرۆکایەتی ئەنجوومەنەکەی دەکرد، چەندین لقیشی لەناو حکومەتدا هەبوون، وەك دیوانی قوتابخانەکان و دیوانی جەنگی.

محەمەد عەلی پاشا لە ساڵی (١٨٤٩ن) لە ئەسکەندەرییە کۆچی دوایی کردووەو لە مزگەوتەکەی خۆی (مزگەوتی محەمەد عەلی) لە قەڵای سەلاحەددین ئەیوبی لە قاهیرە بەخاك سپێردراوە[196].

ئەمەی خوارەوەش لیستێکە بەناوی ئەندامانیماڵباتی عەلەوی ( کوڕ و نەوەکانی محەمەد عەلی پاشا)، کە لە ساڵی (١٨٠٥- ١٩٥٢ن) حوکمی میسریان کردووە:

- والی محەمەد عەلی پاشا (١٨٠٥- ١٨٤٨ن).
- والی ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی پاشا لە (حوزەیران تا تشرینی دووەم ١٨٤٨ن).
- والی عەباس حلمی یەکەم کوڕی تۆسۆن پاشا (١٨٤٨- ١٨٥٤ن).

- والی محەمەد سەعید پاشا کوڕی محەمەد عەلی (١٨٥٤- ١٨٦٣ن).
- خدێوی ئیسماعیل پاشای کوڕی محەمەد عەلی (١٨٦٣- ١٨٧٩ن).
- خدێوی محەمەد تۆفیق (١٨٧٩- ١٨٩٢ن).
- خدێوی عەباس حلمی دووەم (١٨٩٢- ١٩١٤ن).
- سوڵتان حوسێن کامل (١٩١٤- ١٩١٧ن).
- سوڵتان ئەحمەد فواد (١٩١٧- ١٩٢٢ن)، کە دواتر بوو بە مەلیك فوادی یەکەم لە (١٩٢٢-١٩٣٦ن).
- مەلیك فاروقی یەکەم (١٩٣٦- ١٩٥٢ن).

## چوارەم: فەرماندە سەربازی و کارگێڕیەکانی کورد لەسەردەمی محەمەد عەلی پاشا وماڵباتەکەی:

محەمەد عەلی پاشا بۆ چەسپاندنی حوکمەکەی لە میسر بە شێوەیەکی سەرەکی پشتی بەستبوو بە فەرماندە و سەربازە کوردەکان. ئەوەش، یەکەم: بۆ ئەو باوەڕەی دەگەڕێتەوە کە بە توانای رۆڵەکانی نەتەوەکەی هەبوو لە هونەری جەنگی و سەرکردایەتی و کارگێڕی. دووەمیش: بۆ دڵنیایی لە دڵسۆزی و وەفادارییان، کە پێی ناسرابوون. ئەو سەرکردە کوردانەی لەکاتی دەسەڵاتی خۆی و دوای ئەویش دەسەڵاتی ماڵباتەکەی خزمەتیان کردووە ئەمانەن:

### القائد، حجو بيك (فەرماندە حاجۆ بێگ):

ئەوەی لێی زانراوە ئەوەیە، ئەو فەرماندەیەکی کوردی پلە یەك بووە، وە باڵی راستەی محەمەد عەلی پاشا بووە لە دامەزراندنی دەوڵەتەکەی، هەروەها لە لەزاڵبوون بەسەر مەمالیکەکانی میسر. کاتێك کە سوڵتان سەلیمی سێیەمی عوسمانی داوای لە فەرمانڕەواکانی هەرێمەکان و وڵاتەکەی کرد رۆڵە و سەرۆك هۆزەکان کۆ بکەنەوە و بەرەو ئاستانە بیاننێرن، بۆ ئەوەی فێری هونەری جەنگی و رێکخستنی سەربازی نوێ بن، حەجۆ (یان حاجۆ) گەنجێکی تەمەن

بیست و پێنج ساڵە بوو، لە زادگای خۆی لە شاری وان لە کوردستانی تورکیا دەژیا. بەختی هێنا کە بەرەو ئاستانە و دواتر بۆ ئەدرنە چوو، پاشان تێکەڵی سوپای نوێی عوسمانی بوو. کاتێك کە پلەی (یوزباشی سوار)ی وەرگرت، ئەوکات ئاژاوە لە نێوان ( سوپای ئینکشاری و نیزامییەکانی سوپای عوسمانی) دروست ببوو، بۆیە دەرفەتەکەی قۆستەوەو گەڕایەوە شوێنی لەدایك بوونی خۆی لە وان. دواتر لەگەڵ شێخ عوبەیدوڵلای زاوای، باسی لە دەرکەوتنی گەندەڵی بەڕێوەبردندا کرد لە ناو خەلافەت دا، هەروەها باسی لە تەشەنەسەندنی فیتنە و پیلانگێڕی کرد، کە هەڕەشەیان لە دواڕۆژی حوکمی عوسمانی دەکرد. ئەوە لە کاتێکدابوو کە فەڕەنسییەکان بە سەرکردایەتی ناپلیۆن پۆناپارت هێرشیان کردبووە سەر میسر لە (١٧٩٨- ١٨٠١ز)، بۆیە یوزباش حەجۆ راسپێردرا بۆ کۆکردنەوەی ئەو سەربازە کوردە دلێرە گیانبەخشانەی رێگای خوا، تا پەیوەندی بکەن بە سوپای سەدری ئەعزەم (یوسف ضیاء باشا)، کە راسپێردرابوو بۆ وەدەرنانی فەڕەنسییەکان لەشکرکێشی بکاتە سەر میسر.

بۆیە هێندەی نەبرد حەجۆ توانی هەزار گیانفیدای دلێری کورد کۆبکاتەوەو ئەویشیان کرد بە (دەلیل پاشا)، واتە لە یوزباشی کردیان بە بێکباشی بەسەریاندا، دواتر پەیوەندییان کرد بە سوپای (نصوح باشا)، کە هێزێکی نارێکخراو بوون و بەرەو میسر کەوتبوونە رێ. حەجۆ لەگەڵ یەکە کوردییەکەی خۆی، بەشداری هەموو ئەو جەنگانەی کرد، کە لە نێوان سوپای عوسمانی و سوپای فەڕەنسی لە میسر روویاندا.

کاتێکیش کە سوپای عوسمانی بەرامبەر بە فەڕەمسییەکان بە فەرماندەیی (کلیبەر) شکا و بەرەو خانکە گەڕایەوە دواوە، حەجۆ بەرگری لە دواوەی سوپا گەڕاوەکە دەکرد.

پاشان دەنگوباسی حەجۆ و تیپە کوردیەکەی ون دەبێ، تا سەرەتاکانی

سەردەمی محەمەد عەلی پاشا، کە زۆر پێی سەرسام دەبێ و رۆڵی ئەو لە جەنگەکانی دژ بە فەرەنسییەکان بەرز دەنرخێنێ، وە ناسناوی (یلدرم حەجۆ-حەجۆی بروسکە) ی لێ دەنرێت، چونکە ئەو قاهیرەی لە دەست هێرشەکانی مەمالیکەکان رزگار کرد، وەك ئەوەی کە (جبرتی) لە مێژووەکەیدا باسی کردووە[197].

## المشیر، شاهین باشا (لە ١٨٨٤ز کۆچی دوایی کردووە):

موشیر، (**پلەیەکە ئێستا بەرامبەرە بە جێگری سەرۆك کۆمار-و**) شاهین پاشا کوڕی عەلی ئاغا کوردێکی رەسەنەو بە (کنج) ناودارە (**رەنگە گەنج یان قنج بێت-و**)، وەزیری جەنگی میسری بووە لە سەردەمی محەمەد عەلی پاشا.

لەسەردەمی محەمەد عەلی پاشا، باوکەکەی ئەوی بردە میسر، پاشان لەگەڵ نێردەیەك بۆ خوێندنی زانستە سەربازییەکان چۆتە قوتابخانەی (سان سیر) لەپاریس. دوای ئەوەی گەڕایەوە، پەیوەندی بە سوپای میسرییەوە کرد، لەجەنگی دژ بە وەهابییەکانی حیجاز لە (١٨١١- ١٨١٨ز) بەشداری کردو ئازایەتییەکی زۆری نواند.

شاهین پاشا لە سەردەمی والی عەباس حلمی (١٨٤٨- ١٨٥٤ز)و والی محەمەد سەعید لە (١٨٥٤- ١٨٦٣ز) وردە وردە پلەکانی بەرز بوونەوە، تا لە سەردەمی والی عەباس گەیشتە پلەی قائمقامی. لە ساڵی (١٨٥٣- ١٨٥٥ز) لەگەڵ پەلامارەکەی میسری، کە بۆ یارمەتی دانی سوپای عوسمانی نێردرابوو، بەشداری جەنگی قرمی کرد، پاشان لە ساڵی (١٨٥٥ز) پلەی (میرالای) پێدرا.


پۆلێك قەتابی لە قوتابخانەی سان سیر

له سه‌رده‌می خدێوی ئیسماعیل (١٨٦٣- ١٨٦٣ز) شاهین پاشا له ساڵی ( ١٨٦٦ز) به پارێزگاری قاهیره داندرا. هه‌ر له‌و ساڵه‌دا خدێوی ئیسماعیل ئه‌وی به نێرده‌یه‌کی سه‌ربازی نارده فه‌ره‌نسا و له پای ئه‌وه‌وه پله‌ی "فه‌ریق"ی پێدرا و ساڵی (١٨٦٧ز) نێردرایه سودان، بۆ لێکۆڵینه‌وه له یاخی بوونێکی سوپای سودانی له کسلا وسواکن. کاتێکیش که له فه‌ره‌نسا بوو، ئاماده‌ی نمایشێکی سه‌ربازی بوو، که ئیمپراتۆر ناپلیۆن بۆناپارتی سێیه‌م له پاریس به بۆنه‌ی گه‌ڕانه‌وه‌ی که‌تیبه‌ی سودانی ئه‌نجامی دا، که له ساڵی (١٨٦٧ز) له‌گه‌ڵ سوپای فه‌ره‌نسی ناردبووی بۆ مه‌کسیك.

له ساڵی (١٨٦٩ز) شاهین پاشا کرایه وه‌زیری جه‌نگی میسری، بۆ جاری دووه‌م له ساڵی (١٨٧١ز) سه‌ردانی سودانی کرده‌وه بۆ پشکنینی رۆژهه‌ڵاتی سودان. له ساڵی (١٨٧٥ز) به‌ڕێوه‌بردنی هێڵی ئاسنی سودانی پێ سپێردرا، وه بڕیاری دا هێڵه ئاسنه‌که له گه‌لی حه‌لفا له باشووری میسر درێژ بکاته‌وه تا دنقلا له سودان.

بۆیه شاهین پاشا پله‌کانی له‌دوای یه‌کدا به‌رز ده‌بوونه‌وه تا گه‌یشته پله‌ی موشیر. جارێکی تر وه‌زاره‌تی جه‌نگی له سه‌رده‌می محه‌مه‌د شه‌ریف پاشا له ( ١٨٧٩ز) پێ سپێردرا، له‌و ساڵه‌دا خدێوی ئیسماعیل له ده‌سه‌ڵات خراو ئه‌ویش له‌گه‌ڵیدا رۆیشت بۆ تابۆلی له ئیتالیا، له‌وێ مردن گه‌یشته سه‌ری و له ساڵی ( ١٨٨٤ز) کۆچی دوایی کرد و روفاته‌که‌شی گواسترایه‌وه میسر و له‌وێ نێژرا[١٩٨].

## عباس بازارلی ( له ١٨٣٩ز کۆچی دوایی کردووه):

ئه‌فسه‌رێکی کورد بوو، چووبووه خزمه‌ت محه‌مه‌د عه‌لی پاشا و به (جوندی) ناوی ده‌رکردبوو، له جه‌نگه‌کانی محه‌مه‌د عه‌لی له سودان به‌شداری کردبوو، له ساڵه‌کانی (١٨٣٥- ١٨٣٨ز) به‌ڕێوه‌بردنی چه‌ند ناوچه‌یه‌کی میسری پێ سپێردرابوو، له ساڵی (١٨٣٩ز) له میسر کۆچی دوایی کردووه[١٩٩].

**تیمور کاشف ( ۱۱۷۹/ ۱۲٦٤ك- ۱۷٦٥/ ۱۸٤۸ز):**

ناوی محەمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی عەلی کوردییە، ناسراو بووە بە تەیمور کاشف، بنەچەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نەژادی کوردی و خەڵکی قەلاچوالان بووە لە کوردستانی عێراق. وە باپیری ماڵباتی تەیموریەکانی میسرە.

تەیمور کاشف لە ساڵی (۱۸۰۱ز) لەگەڵ محەمەد عەلی پاشا بەسەر پشتی کەشتی هاتە میسر، پەیوەندییەکی توندوتۆڵو بەهێز لەنێوانیاندا دروست بوو[۲۰۰]. کاتێکیش کە محەمەد عەلی بوو بە والی بەسەر میسر، تەیموری لە نزیکەکانی خۆی دانا. لە زۆر لە کاروبارەکانیشی پشتی پێ دەبەست، وەك لە رووداوی لەناوبردنی مەمالیکەکان لە قەلا لە ساڵی (۱۸۱۱ز).

تەیمور کاشف چەندین کاری سەربازی و کارگێڕی لە میسر وەرگرت. کاتێك کە محەمەد عەلی پاشا وەهابییەکانی لەناو برد و حیجازی خستە ژێر رکێفی خۆی، پێنج ساڵان تەیموری کردە والی بەسەر ئیمارەتی مەدینەی پیرۆز. دوا پۆستی کارگێڕیش کە تەیمور کاشف لە میسر وەریگرت پلەی (کاشف الشرقیة) بوو، لێرەشەوە بوو کە ناسناوی کاشفی بەسەردا بڕا، ئەویش لە دوای چل ساڵ خزمەتی بەردەوام ( **کاشفی پلەو پایەی ئەو کەسانە بووە کە سەرپەرشتی زەوی‌و زارو پردو رێ و بانەکانیان دەکردو سەرانەشیان کۆدەکردەوە – لە ویکیپیدیاوە– و).**

محەمەد عەلی پاشا، شاهین کاشفی بانگهێشتی کۆشکەکەی دەکرد لە شبرا، (**رەنگە مەبەست تەیمور کاشف بێت و لێرە بە هەڵە ناوی شاهین کاشف هاتبێ– و)** وە بە وشەی کوردی ئاقداش (**پێدەچێ مەبەست ئارقداش یان قارداشە بەزمانی تورکی–و)** واتە (برا یان هاوڕێ) بانگی دەکرد، لە شاهین کاشف زانراوە (**دیسان لە جیاتی تەیمور، شاهینیان نووسیوە، کە پێدەچێت هەڵە بێ و لەگەڵ شاهین پاشا لێیان تێکەڵ بووبێ - و)** زۆر خواناس و دادپەروەر و کەمێکیش لە کاروبارەکانی توند بووە. رۆشنبیرێکیش بووە کە

زمانی کوردی و تورکی و فارسی و عەرەبی زانیوە، ئەو رۆشنبیرییەی ئەو کاریگەری هەبووە بەسەر نەشونمای ئەدەبی کوڕەکەی خۆی ( ئیسماعیل پاشای تەیمور)و (عائیشە عسمەت)ی نەوەکەی، کە بە عائیشەی تەیمووری بەناوبانگە، لە تەمەنی سەرووی هەشتا ساڵی لە ساڵی (١٨٤٨ز) کۆچی دوایی کردووەو لە تەنیشت مەزاری ئیمام شافعی لە قاهیرە بە خاك سپێردراوە[٢٠١].

**اسماعیل رشدی باشا ( ٧ ذی الحجة ١٢٣٠/ ٢٥ شوال ١٢٨٩٨هـ/ ١٨٨٢/١٨٢٣ز):**

ناوی ئیسماعیل کوڕی روشدی پاشا کوڕی محەمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی تەیمور کاشفی گۆرانی کوردییە، لەگەورە فەرمانبەرانیماڵباتی محەمەد عەلی پاشایە لە میسر. لە کۆزەرانێکی باشدا ژیاوە، لە منداڵییەوە رووی داوەتە زانست و ئەدەب. فێری تورکی و فارسی بووە، لە نووسینی پەخشانی تورکی ئەوەندە بە توانا بووە، کە هەموو هاوشانەکانی خۆی بۆڕ داون. محەمەد عەلی زۆر پێی سەرسام بووە، بۆیە کردوویەتی بە نووسەری تایبەتی خۆی، دواتر کردوویەتی بە جێگری بەڕێوەبەرایەتی رۆژهەلات. هەروەها کراوەتە بەڕێوەبەری چەند بەڕێوەبەرایەتییەك، دواهەمینیان بەڕێوەبەرایەتی رۆژئاوا بووە، کە گەورەترین بەڕێوەبەرایەتی ئەوکاتی میسر بووە. **(پێشتر بە تێبینی روونمان کردەوە کە ئەو سەردەم بە پارێزگا دەگوترا بەڕێوەبەرایەتی و بە پارێزگاریش دەگوترا بەڕێوەبەر، خوێنەری کورد دەبێ درك بەو زاراوەسازییانە بکات، کە تایبەت میسر بەکاریان دێنێت و رەنگە لەگەڵ زاراوەی وڵاتێکی دیکەی عەرەبی جیاوازییان هەبێت- و)**

دواتر گەڕاوەتەوە دیوان، سەرۆکایەتی (کۆمەڵەی هەقانی) کردووە لە سەردەمی ئیبراهیم پاشا (١٨٤٨ز)، پاشان لە سەردەمی والی عەباس حلمی لە (١٨٤٨-١٨٥٤ز) بۆتە جێگری دیوان، پاشان بۆتە چاودێری تایبەت لە فەرمانگەی ئاسەفی. لەسەردەمی والی محەمەد سەعید پاشا لە (١٨٥٤-١٨٦٣ز) بۆتە سەرۆکی دیوان، پاشان لە (١٨٧٩- ١٨٩٢ز) چاودێری تایبەتی خدێوی

محەمەد تۆفیق پاشا بووە بۆ ماوەی شەش مانگان، تا مەرگ گەیشتۆتە سەری و لە (١٨٨٢ن) کۆچی دوایی کردووە.

هەرچی سەبارەت بە خوورەوشتیەتی، ئەوا زۆر بە نەرمونیان و خاکەرایی، هەروەها بە زمان پاراوی، وە بە شەیدا و عاشقی زانست و زانایان ناسراو بووە، زۆریش خەریکی خوێندنەوە بووە، بە عەشقەوە کتێبی گرتوونەتە خۆی. (عائشە تەیموری) شاعێرە و زانای گەورە (ئەحمەد تەیمور پاشا) [٢٠٢] لە رۆڵە خانەدان و ژیرەکانی ئەو بوون.

## ٧-(الفریق، اسماعیل حقی باشا - ابو جبل - (١٨١٨- ١٨٨٣ن):

**(تێبینی: بێ ئەوەی ئاماژە بەشەشەم (٦-) کەسایەتی کرابێ، راستەوخۆ لەپێنجەمەوە بازدراوەتە سەر حەوتەم، جا یان هەڵەی چاپ لەژمارەکان بووە، یان شەشەم کەسایەتی لەسەرکردە سەربازیو کارگێرییەکانی کورد لەسەردەمی محەمەد عەلی پاشاوماڵباتەکەی پەڕیوەو نەگەڕاوەنەتەوە سەریو پێیان نەزانیوە- و )**

سەرهەنگ ناوی ئیسماعیل حەقی پاشای کوڕی سلێمان ئەبوبەکری ناسراو بە - ئەبو جەبەل)ە و لە ماڵباتێکی کوردی رەسەنە لە ویلایەتی مەعموریەی عەزیز لە ئەنادۆڵ. باوکی ئەو قائیمقامی شارۆچکەکە بووە، لە ساڵی (١٨١٨ن) لە دایك بووەو ساڵی (١٨٣٣ن) باوکی ناردوویەتی بۆ میسر و چۆتە قوتابخانەی جەنگیی ئەلا، دوای دوو ساڵ خوێندن دەرچووە و چۆتە ناو (سلك)ی سەربازی، بەشداری هێرشی ئیبراهیم پاشای حیجازیی کردووە دژ بە وەهابییەکان و لەو شەڕەدا بریندار بووەو ئازایەتییەکی زۆری نواندووەو بەو هۆیەشەوە ناسناوی (ابو جبل)ی لێنراوە.

دوای گەڕانەوەشی بۆ میسر، چەندین پۆستی کارگێڕی وەرگرتووە، تا لە ساڵی (١٨٥٠ن) گەیشتۆتە پلەی لیوا. بە بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی قنا و ئسنا داندراوە، پاشان لە ساڵی (١٨٥٢ن) لەجێی رۆستەم پاشا بۆتە حاکمی سودان.

له ساڵی (١٨٥٤ز) بەشداری شەڕی قرمی کردووە وەك فەرماندەی لیوای میسری بەرامبەر بە سباستوپول (ئێستا بەشێکە لە روسیا)، پاشان سەرکردایەتی گشتی هێرش و هەڵمەتی میسری پێ سپێردراوە.

دوای گەڕانەوەشی بۆ میسر لە ساڵی (١٨٥٧ز) کراوەتە سەرۆکی ئەنجوومەنی تەنتا، پاشان فەرماندەی هێزی پیادە، دواتر خانەنشین کراوە. بەڵام جارێکی تر گەڕێندراوەتەوە بۆ ئەندامی ئەنجوومەنی حوکم. دواتر ئەرکی سەرکوتکردنی عەرەبەکانی ناوچەی فیوم و واحاتی لە میسر پێسپێردراوە.

جارێکی تر کراوەتەوە بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی قنا و ئسنا، پاشان لە ساڵی (١٨٦٣ز) کراوەتە سەرۆکی ئەنجوومەنی سەربازی میسری. ئینجا کراوەتە بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی رۆژئاوا. پاشان پلەکەی بۆ سوپاسالار بەرز کراوەتەوە. دواتر کراوەتە ئەندامی ئەنجوومەنی حوکم، لە ساڵی (١٨٦٧ز) کراوەتە بەرپرسی گشتی پشکنین، ئەوجا کراوەتە پارێزگاری میسر. جارێکی دی لە ساڵی (١٨٧٤ز) کراوەتەوە بە ئەندامی ئەنجوومەنی حوکم. پاشان لە (١٨٧٥ز) بۆتە جێگری ئەنجوومەن، دوای ئەوە لە ساڵی (١٨٧٦ز) بۆتە ئەمینداری گشتی بەیتولمال، ئینجا سەرۆکی ئەنجوومەنی حوکم، تا لە ساڵی (١٨٧٩ز) خانەنشین کراوە.

زۆر هۆگری خدێوی تۆفیق بووە، ئامادەی ئەو کۆنگرەیەش بووە کە لە کۆشکی (راس التین) لە ئەسکەندەرییەی بەست، بۆ چارەسەر کردنی پرسی شۆڕشی عورابی لە ساڵی (١٨٨٢ز) بەر لە لەوەی کەشتیگەلی بەریتانی لە قەڵاکان بدات. لە (٢٥ی نیسانی ساڵی ١٨٨٣ز) کۆچی دوایی کردووە[٢٠٣].

## ٨-علی رضا بیك، ناسراو بە کوردی (١٨١٤- ١٨٩٠ز):

ئەفسەرێکی سەربازی و کارگێڕی بووە لە میسر و سودان. لەگەڵ باوکی خۆی لە هێرشێکی میسر بە فەرماندەیی ئیسماعیل کەمالی سێیەم کوڕی محەمەد عەلی پاشا لە ساڵی (١٨٢٠ز) چۆتە سودان. ئەو لە تەمەنێکی زووی منداڵیدا

چۆتە ناو سوپا. زۆری پێنەچوو تا بوو بە (بلوك باشی) واتە ئەفسەر لە هێزی میللی غەیرە نیزامی. پاشان لە ناوچەی رۆژهەلاتی نیلی شین ئەرکی باج کۆکردنەوەی پێ سپێردراوە، چەندین ساڵ لەو پۆست و ئەرکەدا مایەوە.

لە ساڵی (١٨٦٥ز) بۆ پلەی (سنجق) بەرز کراوەتەوە، کە بەرامبەر بە ئامیر لیوایە. چەند هەڵمەتێکی سەربازی لە بازاڕی "ئەبی سن" بە فرمانی حاکمی گشتی سودان ئەنجام داوە. ئینجا پلەکەی کراوەت قائیمقام، پاشان لە ساڵەکانی نێوان (١٨٦٦- ١٨٧١ز) کراوەتە بەرپرسی هەرێمی نیلی سپی.

لەو کاتەی کە ئەرکەکانی خۆی لە سودان جێبەجێ دەکرد، بە تۆمەتی خراپ سوود وەرگرتن لە دەسەلات عەلی رەزا بەگی حوکم دا، بەلام دواتر بێتاوان دەرچوو، بۆیە لە ساڵی (١٨٧٥ز) گەرێندرایەوە سەر وەزیفەی (حاکمی هەرێمی نیلی سپی)، لەوێ هەستا بە دامرکاندەوەی یاخیبوونی شلُلوکی لە سودان. کاتێکیش کە راپەرینی مەهدی لە جەزیرە روویدا، ئەو بەشداری کرد لە دامرکاندنەوەی، لەوکاتەدا (١٨٨٤ز) لە خەرتووم گەمارۆ درا، بەلام توانی خۆی دەرباز بکات. پاشان فەرماندەیی هێزێکی غەیرە نیزامی پێسپێردرا بۆ پاراستنی سنووری باشووری میسر لە کاتی راپەرینەکەی سودان، تا لە ساڵی (١٨٩٠ز) خانەنشین کرا و لە هەمان ساڵدا لە قاهیرە کۆچی دوایی کرد.[٢٠٤]

---

١٦٣- چاڵدێران دەکەوێتە باکوری خۆرئاوای دەریاچەی ورمێ لە کوردستانی ئێران.

١٦٤- ب. لیرخ: دراسات حول الاكراد واسلافهم الخالدين الشماليين. ترجمه عن الروسية د. عبدي حاجي، منشورات دار علاءالدين، حلب ١٩٩٢م، ص١٧.

١٦٥- لە پەراوێزی ململانێی نێوان عوسمانی/ سەفەوی، کێشەی سنوور دروست بوو، کە لە مێژوودا بە کێشەی سنووری عوسمانی/ سەفەوی ناسراوە، کە بووە هۆی لێکدابڕانی رۆڵەکانی یەك نیشتمان، بەڵکو نێوان خودی هەر هۆزو خێڵێکی کوردیش. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی زیانێکی گەورەی کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسییان پێ بکەوێ.

سەرەرای بەستنی چەندین ڕێککەوتننامە لەنێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی، هەروەها هاتنە ناوەوەی وڵاتانی ئەوروپا بۆ کێشەکە، بەڵام کێشەی سنوور هەروا مایەوە تا بەستنی ڕێککەوتنی جەزائیر لە ساڵی ١٩٧٥ز. کە تیایدا سەددام حوسێن دەسبەرداری ڕووبەرێکی زۆری ستراتیژی بوو لەسەر سنوور لەگەڵ ئێران. کە بووەی زەرەرو زیانێکی گەورەی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی بۆ عەرەب و کوردەکانی عێراق. ئێستا هەوڵی چرووپری عێراقی هەیە بۆ چاوخشاندنەوە بەو ڕێککەوتننامەیە.

١٦٦- همري باركي، واخرون: القضية الكردية في تركيا، ترجمة هفال، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر- اربيل، الطبعة الاولى ٢٠٠٧م، ص١٢.

١٦٧- یەکێك بووە لە پیاوچاکانی کورد و زاناکانیان. بە "حەکیم" ناسراوە، پایەیەکی بەرزی بووە لەلای سوڵتان سەلیمی یەکەم، لەگەڵ ئەودا بەشداری هەڵمەتی سەر مسری کردووە لە ساڵی (١٥١٧ن). ئەو لە پێشەنگەکانی دامەزراندنی کارگێڕی ناوخۆیی بووە لە کوردستان، کە خەرجی و پێداویستییەکانی ئەو سەردەمی دابین دەکرد. لە ساڵی (١٥٢٠ن) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە وەرگێڕانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "مشاهیر الكرد وكردستان"ی محەمەدەمین زەکی بەگ، ل ١٠٨، ل١١٠.

١٦٨- بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت ڕۆڵی بەدلیسی بڕوانە وەرگێڕانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "خلاصە تاريخ الكرد وكردستان"ی محەمەدەمین زەکی، ب١، ل ل ١٦٠- ١٩٠.

١٦٩- ن. ا. خالفين: الصراع على كردستان " المسألة الكردية في العلاقات الدولية خلال القرن التاسع عشر"، ترجمة عن الروسية د. احمد عثمان ابوبكر، بغداد ١٩٦٩، ص٦٣.

١٧٠- نيكتين: الكرد، دراسة سوسيولوجية تاريخية، ترجمه عن الفرنسية وعلق عليه د. نوري طالباني، منشورات مكتب الفكر والتوعية في الاتحاد الوطني الكردستاني، السليمانية، الطبعة الثالثة ٢٠٠٧م، ص٣٠٨.

١٧١- عبدالعزيز نوار: تاريخ العراق الحديث من نهاية حكم داوود باشا الى نهاية حكم مدحت باشا. دار الكتاب العربي، القاهرة ١٣٨٧هـ/١٩٦٨م، ص٤.

١٧٢- بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەم میرنشینانە بڕوانە: وەرگێڕانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "خلاصە تاريخ الكرد وكردستان"ی محەمەدەمین زەکی بەگ، ب١، ل٢١١-٢٢٠.

١٧٣- عبدالرحمن قاسملو: كردستان والاكراد، دراسة سياسية و اقتصادية. بيروت، ط١ ١٩٧٠م، ص٤٥-٤٧.

١٧٤- Hassan Arafa: The kurds An historical and political study. Oxford University Press. London- New York- Toronto. 1966. pp. 22-23.

١٧٥- کاتێك کە سوپای ئیبراهیم پاشا لەشەڕی دژ بە سوڵتانی عوسمانی لە سنووری کوردان نزیك بووەوە، هەندێك لە میرە کوردەکان، وەك محەمەد پاشای ڕواندزی هەڵسا بە پەیوەندی کردن بە ئیبراهیم پاشا و لەگەڵی ڕێککەوت، کە ئەوان ئامادەی هەر هاوکاری و ڕێنوێنییەکیانن بەرامبەر بە پشتگیری کردنیان بۆ ڕزگار بوون لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی، لەبەر گرنگی ئەم باسە پێویستی بە توێژینەوەیەکی تایبەت هەیە، هەردەبێ بەڵگەنامەی تایبەتیش بەم باسە لە ئەرشیفی خانەی بەڵگەنامەییەکانی گەلی مسری دەستبکەون، بە تایبەتی لە پارێزگای عابدین.

١٧٦- باپیرەی ماڵباتی تەیموری بە ڕەسەن کورد لە مسر. بڕوانە کتێبی محەمەد عەلی عەونی...بکە ل٩٠-٩٩.

١٧٧- بۆ ئاشنا بوون بە ناوەرۆکی فەرمانەکە بڕوانە: رشيدة تيمور: السلامك، الهيئة المصرية العمة للكتاب- القاهرة ٢٠٠٨م، ص ٢٠١ ص٢٠٤.

١٧٨- سەرچاوەی پێشوو، ل٥.

١٧٩- ئێستا دەکەوێتە مەقەدۆنیا.

١٨٠- سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٠.

١٨١- محەمەد تەیمور چەندین زمانی دەزانین، ئەو لە ژندی خۆی کە (قەلاچوالان)ە ڕۆیشتۆتە ئاستانە بۆ چوونە ناو سوپای عوسمانی، لەوێ وەك وەرگێڕ لە سوپا دامەزراوە. ئەوکات سەروەختی ئامادەکاری بوو بۆ هێرش کردنە سەر فەرەنسیەکان و وەدەرنانیان لە مسر، بەلام ئەو لەگەڵ هێرشەکە نەڕۆیشت. سەرەتا گەڕایەوە قەلاچوالان بۆ هێنانی (فەرەح)ی برای، ئینجا لە ڕێی شامەوە گەیشتەوە هەڵمەتەکەی سوپا. ئەودەم کاتی هەڵمەتی ناپلیۆن بوو بۆ سەر شام. دوای شکانی ناپلیۆن لە عەککا، محەمەد تەیمور درێژەی بە ڕۆیشتنەکەی خۆیدا بەرەو مسر، بەلام (سیدنی اسمیث) داوای لێکرد کە لەگەڵ ئەودا بەڕێی دەریا بۆ مسر سەفەر بکات، لە ڕێگادا کەشتیەکەی بەریتانی بەرەو دوورگەی رۆدس بایاندایەوە بۆ بەهانەوەچوونیان، بەلام کەشتیەکەی تورکی لەوێ بوونی نەبوو. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ژیانی محەمەد تەیمور بڕوانە: رشیدە تیمور: سلاملك.

١٨٢- رشیدە تیمور: سلاملك. ص١٨٠-١٨١.

١٨٣- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨١.

١٨٤- سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٧.

١٨٥- محمد علی الصویرکي: الکرد في بلاد مصر، توێژینەوەیەکە لە کتێبی: محمد علي عوني المؤرخ والادیب الکردي المصري ١٨٩٧-١٩٥٢م، ص٩٧.

١٨٦- عبدالرحمن الرافعي: تاریخ الحرکة القومیة، ج٢، ص١٩٣. الصویرکي: سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٤-٩٦.

١٨٧- شاری قۆلە ئێستا دەکەوێتە مەقەدۆنیا، ماڵ و تەکیەیەکی محەمەد عەلی پاشای تێدا هەیە.

١٨٨- زۆر هەوڵماندا ناوی ئەو قازییە بزانین بۆ ئەوەی دەستمان بەو کتابە رابگات، بەلام بێ هوودە بوو، هەروەها لەگەڵ هەندێك لە نەوەکانی ماڵباتی عەلەویش هەوڵماندا دەستی بخەین، کەچی ئەویش بێ ئەنجام بوو. بەڵکو لە داهاتوودا دەستمان بکەوێت.

١٨٩- گۆواری (المصور)ی مسری، ژمارە (١٣١١) ڕێکەوتی ٤ی سەفەر ١٣٦٩ك/ تشرینی دووەمی ١٩٤٩ز. ل ٥٦.

١٩٠- لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا لەگەڵ (میر عەباس حەلیم) لە (١٦ی تەمموزی ٢٠١٠ز، ئەوەی دیکەیان لە ١ی تەمموزی ٢٠١١ز، بۆ زیاتر دڵنیابوون، ئەو لێدوانەی سەرەوەی بۆ داین .

١٩١- عفاف لطفي السید: مصر في عهد محمد علي، ترجمة عبدالسمیع عمر زین الدین، ومراجعة السید امین شلبي، منشورات المجلس الاعلی للثقافة (المشروع القومي للترجمة)، الطبعة الاولی، القاهرة ٢٠٠٤م، ص٥٢-٥٣، ص٣٩٧.

١٩٢- دیدارێك لەگەڵ مامۆستا (ماجد فرج) لە گەڕەکی (العجوزة) لە قاهیرە، ڕۆژی ٢٨ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٠ز.

١٩٣- بۆ زیاتر ئاشنابوون بە ژیانی محەمەد عەلی لە قۆلە بڕوانە: نشات الدیهي: محمد علي باشا بدایات قاسیة ومجد عظیم. طبع دار الجمهوریة للصحافة ضمن سلسلة "کتاب الجمهوریة" اب ٢٠٠٩م. محمد فریك بك: البهجة التوفیقیة في تاریخ مؤسس العائلة الخدیویة. منشورات دار الوثائق القومیة، الطبعة الثانیة، القاهرة ٢٠٠٦م.

١٩٤- بڕوانە : (تاریخ الجبرتي).

١٩٥- ئەو فەلسەفەیەی کە محەمەد عەلی پاشا سوپای مسری لەسەر دامەزراندووە بە شێوازێکی زۆر نیشتمانی بووە لە رووی تازەگەری و ئینتیمای نیشتمانییان زۆر بەرز بووە، نەك خێڵەکی و تایەفەگەری، وەك زۆرێك لە سوپاکانی ئەوکات. باشترین بەڵگەش ئەو هەڵوێستە جوامێرانەیەی سوپای مسری بوو لە شۆڕشی (٢٥ی کانوونی دووەمی ٢٠١١ز). بە بەراورد لەگەڵ سوپای وڵاتانی دیکە بەرامبەر بە گەلانیان.

١٩٦- بۆ زانیاری زیاتر لەسەر مسر لە سەردەمی محەمەد عەلی و نەوەکانی دوای خۆی، بڕوانە: سلسلە عبدالرحمن الرافعي. کە پازدە کتێب لەخۆ دەگرێت، دارولمەعارف چاپ و بڵاوی کردوونەتەوە، دوای ئەویش دەستەی گشتی مسری بۆ کتێب چەند چاپێکی لێ بڵاوکردۆتەوە.

١٩٧- دەستنووسێکی بڵاونەکراوەی محەمەد عەلی عەونی بە ناونیشانی " الرسالة العونیة في الاسرة التیموریة"، لەلای (دورییە عەونی) کچی، (یەکێ لە سێ نووسەرەکەی ئەم کتێبە-ی) پارێزراوە.

١٩٨- وەرگێڕانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "مشاهير الكرد وكردستان"ی محەمەدەمین زەکی بەگ، ب١، ل٢٤٢-٢٤٣. میری بصری: اعلام الكرد، ص٧٥ ص٧٦. محمد علی الصویرکی: سەرچاوەی پێشوو ل٩٧-٩٨.

١٩٩- میری بصری: اعلام الكرد، ص٧٣. محمد علی الصویرکی: سەرچاوەی پێشوو.

٢٠٠- رشیدة تیمور: السلاملك. الهیئة المصریة العامة للکتاب، القاهرة ٢٠٠٨م.

٢٠١- الرسالة العونیة في الاسرة التیموریة- میري بصري: اعلام الکرد، ص٧٧، ممحمد علي الصویرکي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٨-٩٩.

٢٠٢- الرسالة العونیة في الاسرة التیموریة، وەرگێڕانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "مشاهير الكرد وكردستان" ل١١٥. میری بصری: اعلام الکرد، ص٧٣. محمد علی الصویرکی: سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩.

٢٠٣- میری بصری: اعلام الکرد، ص٧٤-٧٥. محمد علی الصویرکی: سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩-١٠٠.

٢٠٤- میری بصری: اعلام الکرد، ص٧٤. محمد علی الصویرکی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٠.

# بەشی شەشەم:

## ناوداران و بلیمەتانی میسریی
## کە کوردی رەسەن بوونە لە میسری نوێ[7]

ئەنجامی هاتنی کوردەکان لە سەردەمە جیا جیاکاندا بۆ میسر و نیشتەجێ بوون تیایدا، وایلێهات ژمارەیەکی زۆریماڵباتی میسری بە رەسەن کوردی تێدا هەڵبکەون، لەناویشیاندا چەندین کەسایەتی ناودار لە بواری جیاجیای ژیانی میسریدا دەرکەوتن. هەندێك لەو کەسایەتییە میسرییە بە رەسەن کوردانە رەورەوەی بیرو زانستیان لە میسری هاوچەرخدا پێشخست. کەوا ئیمڕۆ ژمارەیەك خانەوادەی میسری بە رەسەن کوردی تێدا دەژین، لەوانە خانەوادەو ماڵباتی (کوردی، ئەییوبی، وانلی، خەربوتی، ماردینی، ئۆرفەلی، بەدرخان، تەیمور، عەونی، سوێرکی....تد)، بۆ ئەوەی بوارەکەش زۆر درێژ نەکەینەوە ئەوا تەنها نموونە بە خانەوادەی (تەیموری و بەدرخانی و ماڵباتێکی خانەوادەی کوردی دەهێنینەوە، وەك نموونە بۆ هەموو خانەوادەکانی دیکەی میسری بە رەسەن کورد).

## خانەوادەی تەیموری لە میسر:

لە کۆن و لە ئێستاشدا خانەوادەی تەیموری بە رەچەڵەك کورد رۆڵێکی بالاّ و چاکەیەکی زۆریان هەبووەو هەیە بەسەر رێڕەوی زانست و ئەدەب لە میسر و جیهانی عەرەبی، هەر لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و بە درێژایی سەدەی بیستەم، تا ئێستاش رەخنەگر و توێژەر و لێکۆڵەرانی مێژووی ئەدەبی میسری هاوچەرخ ئاماژە بە ئەدیبی کورد (محەمەد تەیمور) دەکەن وەك رابەری چیرۆك لە میسر. هەروەها (ئەحمەد تەیمور پاشا) خاوەن ئەرشیف و دەستنووسی گەورە و توێژەری پەرتووکی (تراث)، هەروەها (عائیشە تەیمور) وەك رابەرێکی نوێخواز لە شیعری هاوچەرخی میسری.

ئەم خانەوادەیە چاکە و خزمەتێکی زۆری بە هەموو بوارەکانی ئەدەب و زانستدا هەبووە، هەر لە باپیرەی دامەزرێنەری خانەوادەکە (محەمەد تەیمور کاشف)و (ئیسماعیل تەیمور پاشا)ی کوڕی، کە شارەزا بوو بە پەخشانی

تورکی لە کۆشکی محەمەد عەلی پاشا و (عائیشەی تەیموری) شاعیرەی ون و لەبیرکراو و زانای لێکۆڵەر (ئەحمەد تەیمور پاشا) و (ئەدیب- محەمەد تەیمور و مەحمود تەیمور)ی نەوەکانی .

ئەو خانەوادەیە لە (محەمەد تەیمور کاشف)ەوە کەوتوونەتەوە، کە لە پێشتر ئاماژەمان پێکردووە و یەکێك بووە لەو فەرماندانەی کە محەمەد عەلی پاشا بۆ حوکمڕانی و بەڕێوەبردنی میسر داوای یارمەتی و بەشداری لێکردووە. هەروەك چۆن باسمان لە ئیسماعیل پاشای کوڕی کرد، کە عائیشەی تەیموری لێ کەوتۆتەوە، هەروەها زانای گەورە ئەحمەد تەیمور کە محەمەد تەیموری شاعیرو مەحمود تەیموری چیرۆکنووسی لێ کەوتوونەتەوە، ئەمەی خوارەوەش کورتەیەکە لە ژیانی ئەو زانا قاڵبوو و پایەدارانە:

## زانای بلیمەت (احمد تیمور باشا) (١٢٨٨. ١٣٤٨ك/ ١٨٧١. ١٩٣٠ز):

ئەدیب و زەانزان و توێژەر و مێژوونووس ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی محەمەد کوڕی ئیسماعیل کوڕی عەلی تەیموری گۆرانی کوردی، لە قاهیرە لەدایك بووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە. ئیسماعیل پاشای باوکی پلەی سەرۆکی دیوانی خدێوی پێدراوە. کاتێکیش کە کۆچی دوایی کردووە، ئەحمەد منداڵێکی بچووك بووەو خوشکەکەی، عائیشە تەیموری شاعیرەی ناسراو، بەخێوی کردووە. لە قوتابخانەی (مارسیل)ی فەرەنسی خوێندوویەتی، زۆر هۆگری ئەدەبی عەرەبی بووە. لەسەر دەستی مامۆستایانی تایبەتمەند و شارەزا فێری زمانی عەرەبی و تورکی و فارسی بووە. زۆر شەیدا و عاشقی خوێندنەوە بووە، ساماندارییی وایلێکرد دەستنووس و کتێبە بژاردە و نایابەکان کۆبکاتەوە، تا گەیشتە ١٩ هەزار بەرگ، دوای مردنیشی رادەستی خانەی کتێبی میسری کرانەوە.

زۆر هانی هەموو هەوڵە زانستیەکانی ئەدا بۆ زیندووکردنەوەی کەلەپوور. سەرباری ئەوەش هەر لە سەرەتای دامەزراندنی ئەنجوومەنەکە لە (١٩٢٤-




۱۹۳۰ن) به ئەندامی ئەنجوومەنی پیرانی میسری داندرا. بەڵام دواتر بەهۆی تێکچوونی باری تەندروستی دەستی لەکار کێشاوەتەوە. لە ساڵی (۱۹۱۹ن) پلەی (باشەوی) پێدرا. هەروەها بۆتە ئەندامی ئەنجوومەنی شوێنەواری میسری، هەروەها بۆتە ئەندامی کۆمەڵەی زانستی لە دیمەشق و قاهیرە، وە ئەنجوومەنی باڵای خانەی کتێبی میسری بۆ زیاتر لە جارێك. کچی ئەحمەد روشدی پاشای وەزیری ناوەخۆی کردۆتە هاوسەر و سێ منداڵی لێ هەبووە بە ناوەکانی " ئیسماعیل و محەمەد و مەحمود" تا بە (باوکی هەردوو بلیمەت) ناسراوە، کە محەمەد و مەحمودن.

ئەو کتێبانەی کە نووسیونی ئەمانەن: "التصوير عند العرب" و (نظرة تاريخية في حدوث المذاهب الاربعة" و "تصحيح لسان العرب" بۆ ئیبن مەنزور، وە "تصحيح القاموس المحيط" و " اليزيدية و مشاء نحلتهم" و "تاريخ العلم العثماني" و "ضبط الاعلام" و "البرقيات و المقالة" و "لعب العرب" و "ابو العلاء المعري و عقيدته" و "الالقاب و الرواتب" و معجم الفوائد" کە گرنگترین نووسینی بووە. وە "الاثار النبوية" و "اعيان القرن الرابع عشر" و " الامثال العامية" و "الكنايات العامية" و "تراجم المهندسين" و "نقد القسم التاريخي من دائرة معالم فريد وجدي" و "التذكرة التيمورية" کە دوو بەرگە. وە "السماع والقياس" و "ابيات المعاني و العادات" و "المنتخبات في الشعر العربي" و "تاريخ الاسرة التيمورية" و "اسرار العر" و "اوهام شعر العرب في المعاني" و "ذيل طبقات الاطباء" و "مفتاح الخزانة" کە پێرستی گەنجینەی ئەدەبی بەغدادییە. وە "ذيل تاريخ الجبرتي" و "الالفاظ المصرية" و "قاموس الكلمات العامية" کە شەش بەشە. وە "رسائل بين احمد تيمور باشا و الاب انستاس

الكرملي" و "صناعة الكتاب في علم الحروف و مخارجها" و "اعلام الفكر الاسلامي في العصر الحديث" و "علي بن ابي طالب و شعره و حكمه" و "اوهام شعراء العرب في المعاني" و "الموسيقى و الغناء عند العرب" و "الحب و الجوال عند العرب" و "اسرار العر" و "المختار من المحفوظات العر في الاستاذة" و "نوادر المحفوظات العر و اماكن وجودها" و "الاسلحة النارية في الجيوش الاسلامية" و "التذكرة التيمورية" و "تراجم اعيان القرن الثالث عشر و الرابع عشر" و "اسماء الاطعمة".

رۆژی (٢٦ی نیسانی ١٩٣٠ز) له قاهیره كۆچی دوایی كردووه، ئەو نموونەی خاكەڕایی و نەفس بەرزی و وەفا و جێی شانازی گەورە پیاوانی زانست و دانایی و بەخشندەیی بووە، لەگەڵ خەڵكەكەدا هاتۆتەوەو كاتێكیش كە هاوسەرەكەی كۆچی دوایی كردووە، تەمەنی ئەو بیست و نۆ ساڵ بووە، بەڵام لە ترسی ئەوەی نەبادا لەگەڵ (محەمەد و مەحمود)ی كوڕی خراپ بێت، بۆیە ژنی نەهێناوەتەوە[٢٠٥].

**( محمد تیمور)ی ئەدیب (١٣١٠-١٣٣٩ك/ ١٨٩٢-١٩٢١ز):**

ناوی محەمەد كوڕی ئەحمەد كوڕی ئیسماعیل پاشای تەیمورە، شاعیر و ئەكتەر و نووسەری شانۆیە، لە بەناوبانگترین بناغە دارێژەرانی نووسینی چیرۆك و شانۆیە لە میسر. لەدایك بوون و كۆچی دوایی لە قاهیرە بووە، بۆ



خوێندنی پزیشكی چۆتە بەرلین، دواتر لەوێ وازی لێهێناوەو چۆتە پاریس، خووی داوەتە خوێندنەوەی كتێبەكانی ئەدەبی فەڕەنسی. دوای سێ ساڵان لە (١٩١٤ ز) گەڕاوەتەوە میسر. لەوكاتەوە لەژێر كاریگەری ڕێبازی واقعی، كە ئەوكات لە ئەدەبی ئەوروپیدا باو بووە، خۆی تەرخان كردووە بۆ ئەدەب و شانۆ. بەشداری

کردووه له دامەزراندنی "کۆمەڵەی هاوڕێیانی نواندن" . تیپی شانۆی مەهدییە زۆرێك لە شانۆگەرییەکانی ئەوی نمایش کردوون، وەك (عبدالرحمن رشدی، منیره المهدیه، عکاشه، عزیز عید) لەگەڵ چەند شانۆگەرییەکی کۆمێدی و کۆمەڵایەتی وەك (العصفور في القفص، عبدالستار افندي (١٩١٨)، الهادية (١٩٢٠)) و ئۆپەرێتی "العشرة الطيبة" کە لەلایەن سەید دەروێش ئاوازی بۆ داندراوە. لە بواری نواندنیشدا کارامە بووەو تیپێکی نواندنی خێزانی پێکهێناوە، کە خۆی نووسەری رۆمانەکە و هەر خۆیشی رۆڵی پاڵەوانەکەی تێدا بینیوە و هەڵبەستی مەنەلۆژەکانی نواندنی داناوەو پێشکەشی کردوون، بەلام مەرگ بواری زیاتری نەداوە و لە تەمەنی سی ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

ناوبراو بە پێشەنگی نووسینی کورتە چیرۆك دەژمێردرێ، لەسەر دەستی ئەودا چیرۆکی هاوچەرخی عەرەب لەدایك بووە، بەتایبەتی لەگەڵ چیرۆکە ئەدەبییە بەناوبانگەکەی بەناوی لە شەمەندەفەردا (في القطار)، هەروەها پێشەنگی چیرۆك و شانۆ بووە. بە شێوازی ئەدەبی نەتەوەیی میسری، کە مۆرك و شێوەیەکی لۆکاڵی پێوە دیار بووە، دەینووسی. بە شێوەیەکی گشتیش لە واقعی ژیان و شێوازی چیرۆکەکاندا لەژێر کاریگەری ئەدەبی فەرەنسی دابووە.

رۆژهەڵاتناسی رووسی کراچۆفسکی دەربارەی ئەو دەڵێ" ئەو دامەزرێنەری چیرۆکی میسرییە، داهێنەری وێنەکێشانی واقعی ژیانی کۆمەڵایەتی تازەیە. زۆریش ئاگاداری ئەدەبی ئەوروپی بووە، مۆرکی کورتە چیرۆکەکانیشی لە ناخی ژیانی میسریدا هەڵقولاون، کە وێکدەچێ لەگەڵ شێواز و رێچکەی موپاسان و چیخۆف".

لە شاکارەکانی، بریسکەی رۆح "ومیض الروح " و شانۆی میسری "المیسرح المصري- "، هەروەها دوو چیرۆکی گاڵتەئامێزیشی نووسیون یەکێکیان چۆلەکە لەناو قەفەسدا"العصفور في القفص" و ئەوەی دووەمیان عەبدولسەتارە فەندی "عبدالستار افندي "، دوا بەرهەمیشی کتێبێکە بەناوی ئەوەی کە

چاوەکان دەیبینن "ما تراه العیون " کە کۆکراوەی چیرۆك و یاداشتەکانیەتی لە دوای مردنی ئەودا کۆکراونەتەوەو چاپ کراون.[٢٠٦]




**( محمود تیـمـور)ی ئـەدیـب ( ١٣١١-١٣٩٣ك/ ١٨٩٤-١٩٧٣ز):**

ناوی مەحمود کوڕی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیل تەیمورە، میری چیرۆکنووسانە لە جیهانی عەرەبی، ئەحمەد تەیمور پاشای باوکی لێکۆڵەری شارەزا و زانا بوو، عائیشە تەیمورییەی پووری شاعیرەو محەمەدی براشی ئەدیبێکی گەورە بوو.

مەحمود لە قاهیرە لەدایك بووە، لە قوتابخانەکانی میسر خوێندوویەتی، بۆ چارەسەری نەخۆشی چۆتە سویسرا، (**پێموایە سویسرایەو بە هەڵەی چاپی لە نوسخە عەرەبیەکەدا بۆتە سوسیرا– و**)، لەوێ ئاشنای ئەدەبی فەرەنسیو رووسی بووە، وە دەستی کردووە بە توێژینەوە تیایاندا، کاتێکیش کە گەڕاوەتەوە بۆ میسر، خۆی تەرخان کردووە بۆ بوژانەوەی ئەدەب بە هەموو رەنگەکانیەوە، لە رۆمان و شانۆگەری و چیرۆك.

سەرەتای دەستپێکردنی چیرۆکنووسینی لە ساڵی (١٩١٩ز) بووەو بە شێوە زاری گشتی نووسیوە، دواتر شێوە زمانی رەوانو پاراوی کردۆتە ئامرازی نووسین و تیاشیدا سەرکەوتوو بووە. لە چیرۆکەکانیدا وێنای ژیانی رۆژانەی رۆڵەکانی گەلەکەی، بە تایبەتی چینی زەحمەتکێشی کردووە بە شێوە زاری گشتی خۆیان. لە تەمەنی لاویشدا پەخشانە شیعری نووسیون و چەند تێکستێکی ئەدەبی و چەند توێژینەوەیەکی لە زمانی فەرەنسی وەرگێڕاون.

لە ساڵی (١٩٤٩ز) بۆ ئەندامێتی لە (کۆڕی زمانی عەرەبی) لە قاهیرە هەڵبژێردرا. هەروەها بە ئەندامی تەتەر لە کۆڕی زانستی عێراقی لە ساڵی ( ١٩٦١ز) دەستنیشان کرا. رۆمانەکەی خۆی بەهەردوو تێکستی شێوە زاری



٦

گشتی و ڕەوان لە بەرگێکدا چاپ کرد. لە ڕۆژی (٢٣ی ئابی ١٩٧٣ن) لەکاتی گەشت، لە شاری لۆزان لە وڵاتی سویسرا کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی هێنراوەتەوە بۆ قاهیرە.

هەرچی سەبارەت بە شاکارەکانیەتی ئەوا لە پەنجا تێپەڕیون، هەندێکیان بۆ چەندین زمان وەرگێڕدراون، کە باس لە کێشە سەردەمیەکان و کەلەپووریی و مێژووییەکان دەکات، سەرباری ئەو چیرۆکانەی کە دەربارەی گەشتەکانی خۆی، یان ئەو چیرۆکانەی کە گوزارشت لە کەسایەتییە فیرعەونییەکان دەکەن. وە وێنایەکی جوانی بۆ هەموو ئەو پیاوانە کێشاوە کە لە نزیکەوە ناسیونی. باسی ئافرەتانی ئەندەلوسیەکانیشی لە ڕۆمانی "طارق الاندلس" کردووە، لە نووسینە چاپکراوەکانی ئەمانەی خوارەوەن:

چیرۆك: "الشيخ سيد العبيط" لە ساڵی (١٩٢٥ن). وە "رجب افندي" ساڵی ( ١٩٢٨ن)، "كليوباترا في خان الخليلي" لە(١٩٤٦ن) و "سلوى في مهب الريح" لە ( ١٩٤٧ن) و "الحاج شلبي" و "نداء المجهول".

شانۆگەرییەکان: "حواء الخالدة" لە (١٩٤٥ن)، وە "اليوم خمر" لە (١٩٤٧ن)، وە "صقر قريش" لە (١٩٥٦ ن) و "النبي الانسان". لە کتێبەکانیشی "مشكلات اللغة العر" و "معجم الحضارة". زۆرێك لە کورتە چیرۆکەکانیشی وەرگێڕدراونەتە سەر زمانە ئەوروپییەکان.

ژمارەیەك خەڵاتیشی دراونەتێ، وەك خەڵاتی کۆڕی زمانی عەرەبی لە قاهیرە لە ساڵی (١٩٤٧ن). خەڵاتی دەوڵەت بۆ ئەدەب لە (١٩٥٠ن)، خەڵاتی واسف غالی پاشا لە پاریس لە (١٩٥١ن) و خەڵاتی دەوڵەت بۆ ڕێزلێنانی ئەدەبی بۆ ساڵی ( ١٩٦٣ن ).

شێوازی نووسینی زۆر ساکار بووەو لە ژێر کاریگەری زمانە ئەوروپییەکان بووە. زمانی چیرۆکنووسینی زۆر سادە و ڕەوان بووە، بە لەبەرچاوگرتنی گوزارشت کردن بە زمانی پاراو. دکتۆر شەوقی زەیف ئەوی بە دامەزرێنەری

هونەری چیرۆکنووسی داناوە لە ئەدەبی هاوچەرخی عەرەبی. هەر سەباردت بە ئەو، پێشەنگی ئەدەبی عەرەبی دکتۆر تەها حوسێن رووی تێ دەکات و دەڵێت "بڕوا ناکەم نووسەرێکی دیکەی میسری وەها گەیشتبێتە جەماوەری رۆشنبیر و نارۆشنبیر، وەك ئەوەی کە تۆ گەیشتوویی؟ هێشتاش هەر دەنووسی، رەنگە هێشتا خەڵکیش گوێبیستی هەندێك لەوە بن کە تۆ دەینووسی، تا ئەوەی ئەگاتە دڵەکانیان وەك ئەوەی کە رزگارکەر دەگاتە شارێك و قینیان دائەمرکێنێ‌و بەخۆیان سەرسام دەکا".[٢٠٧]

## عائشة التيموري ) (١٣٢٠-١٢٥٦ك/ ١٨٤٠- ١٩٠٢ز):


(عائشەی تیموری)

عائیشە عسمەت کچی ئیسماعیل پاشای کوڕی محەمەد کاشف تەیمورە، شاعیرە و ئەدیب و لە بلیمەتەکانی میسرە. پێشەنگی بوژانەوەی ئەدەبی ژنانە لە میسری هاوچەرخ. شیعرەکانی بە عەرەبی و تورکی و فارسی هۆنیونەتەوە. لە قاهیرە لەدایك بووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە. ساڵی (١٨٥٤ز) لە تەمەنی پازدە ساڵیدا شووی بە محەمەد تۆفیق بەگی ئیسلامبۆلی کردووەو دوو منداڵی لێ بووە بە ناوی (محەمەد و تەوحیدە)، تەوحیدەی کچی لە تەمەنی لاویدا کۆچی دوایی کردووەو عائیشە حەوت ساڵان هەر بۆی گریاوە. ساڵی (١٢٧١ك) لەگەڵ هاوسەرەکەی چۆتە ئاستانە. ساڵی (١٨٨٢ز) باوکی کۆچی دوایی کردووە و دوای ئەویش لە ساڵی (١٨٨٥ز) هاوسەرەکەی کۆچی دوایی کردووەو پاشان گەڕاوەتەوە میسر. ئیدی خۆی تەرخان کردووە بۆ ئەدەب، وتارەکانیشی لە رۆژنامەکان بڵاودەکردنەوە و ناوبانگەکەشی زۆر هەڵکشا. لەولاشەوە ئەو خوشکی زانای پایە بەرز ئەحمەد

تەیمور پاشا بوو. لە تەمەنی سێزدە ساڵی دەستی دایە شیعر نووسین، بە سێ زمانی عەرەبی و تورکی و فارسی نووسیویەتی. یەکەم کەسیش کە شیعرەکانی خوێندنەوە باوکە ئازادیخوازەکەی بوو، زۆر هانیدا بۆ ئەوەی چرۆی شیعرەکانی بپشکوێن. چوار دیوانی شیعریشی هەن کە ئەمانەن ("حلیة الطراز-ط" ئەو دیوانەی شیعری عەرەبییە و بە ناوی خۆی "عائشە" بڵاویکردۆتەوە، هەرچی کۆمەڵە شیعری تورکیو فارسییەکەیە لە ساڵی (١٨٨٦ز) بە ناسناوی "عسمەت" بڵاویکردوونەتەوە. هەروەها "نتائج الاحوال في الاقوال والافعال.ط" لە ئەدەب لە ساڵی (١٨٨٨ز). وە "شکۆفە= وردة. ط" ئەوە تاکە دیوانە شیعرە تورکییەکەیەتی و لە ساڵی (١٨٩٤ز) دەریکردووە، بەڵام هەندێك بەیتی بە زمانی فارسیشی تێدایە. کە شاعیرە لە لاواندنەوەی تورکی بەسەر تەوحیدەی کچیەوە نووسیویەتی. لێرەوە هەندێ کەس وای بۆ چوونە کە ئەمە دیوانێکی "تورکی فارسی"یە، بەڵام پێچەوانەکەی راستە، چونکە شاعیرە بە روونی لە پێشەکی دیوانە تورکییەکەدا گوتوویەتی کە شیعرە فارسییەکانی لە هەرەتی منداڵیدا داناون و تەوحیدەی کچی هەڵیگرتبوون، بەڵام دوای مردنی کچەکەی ئەو شیعرە فارسییانەی لەگەڵ کەلوپەلە تایبەتەکەکانی کچەکەی سووتاندوونە. لەمەدا دەردەکەوێ کە ئەو دیوانی تایبەتی بە زمانی فارسی نەبووە، نە بە دەستنووسو نەچاپکراو. بەڵام باڵادەستی ئەو لە زمانی فارسیو ئەدەبەکەی لەو نموونە شیعرە فارسییانەی دەردەکەوێ کە لە دیوانە تورکییەکەیدا هەن، هەروەها لەسەر گڵکۆکانی خانەوادەکەی لە ئیمام شافیعی ئاماژەی بۆ کردوون، وە لە وەرگێڕانی درێژو قووڵ کە بەپێنووسی خۆی بۆ پێشەکی دیوانە تورکییەکەی نووسیوەو لەساڵی (١٣١٥ك/ ١٨١٨ز) لە چاپخانەی (المحروسة)ی عەزیز ئەلیاس لە قاهیرە چاپکراوە. لە کتێبی (الدر المنشور في طبقات ربات الخدور) ی خاتوو زەینەب فەواز دا هاتووە، کە دیوانە تورکیەکەی کە بەناوی "شکۆفە"یە ئێستا (١٢١٢ك/ ١٨٩٤ز) لە ئاستانە لەژێر

چاپدایە، ڕەنگە دووجار چاپ کرابێ، جارێکیان لە قاهیرە و ئەوەی تر لە ئاستانە، ئەشبێ لە ئاستانە چاپ نەکرابێ، ئیدی هەر خوا سەرڕاست و زانایە.

لە(٢٥ی ئایاری ١٩٠٢ز) لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە. نەبیل ئەنحاج دەربارەی ئەو گوتوویەتی: "ئەدەبی عەرەبی لە ماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا ئافرەتێکی ئەدیبی ئازای نەناسیوە، کە وەك عائیشە تەیموری بەرپرسیارێتی داکۆکیکردنی لە ژنانی عەرەب هەڵگرتبێ. ئەو پێشەنگی ئەدەبی هاوچەرخی ژنان بووە و داوای ئازادی ژنانی عەرەبی کردووە لەو کۆت و بەند و نەریتانەی، کە بە مەرامی جوانی و پاراستنیان بەسەریاندا سەپێندراوە".

عائیشەی تەیموری خاتوونێکی تێکەڵ بووە لەگەڵ ئافرەتانی دیوەخان، خاتوونی گەورەی دیوەخان عائیشەی بۆ بۆنە و ئاهەنگەکانی کۆشك بانگ دەکرد و پشتیشی پێ دەبەست بۆ کاری وەرگێران لەگەڵ میوانە بیانییەکان، کە لە کۆشك سەردانیان دەکردن. بۆیە عائشە بە بیر و بە ڕۆح و بە دونیابینی خۆی زۆر جیاواز بوو لە ژنانی دەوروبەری، بەمەشدا توانی بەسەر ژنانی سەردەمی خۆیدا دەربکەوێ و سەربکەوێ.

شیعرەکانی عائیشە هەمەڕەنگ و هەمەجۆر بوونە و لە بواری (زمان پاراوی و غەزەل و ئامۆژگاری و ئایینی و ڕەوشتی و پاڕانەوە) نووسراون، وە لاواندنەوەکانی لە باشترین و باڵاترین نموونەی شیعریەکانیەتی، بە تایبەتی ئەو لاواندنەوانەی بۆ تەوحیدەی کچی نووسیون لە ئاستێکی زۆر بەرزدان. نادیە نویهز دەربارەی عائیشە گوتوویەتی: "ئەوە عائیشەی تەیمورییەی شاعیری پێشەنگە، کە لە ژیانی خۆیدا خەمەکانی ئاوێتەی خۆشییەکانی و ناویانگی تێکەڵ بە کزی، مزگێنی تێکەڵ بە تاڵاو کردوون، جوانترین شیعریش بە شکۆمەندییەوە لە کێڵگەی ئازار دەدرەوشێتەوە"[٢٠٨].

##ماڵباتی بەدرخانییەکان لە میسر:

ماڵباتی بەدرخانییەکان بە گشتی رۆڵێکی هەرە بەرچاویان هەبووە لە مێژووی کورددا. جێ پەنجەشیان زۆر ئاشکرا دیارە بەسەر بزووتنەوەی کوردی، بە تێکۆشانی سیاسی و رۆشنبیرییانەوە. میرە بەدرخانییەکان بە تەنها بەرگرییان لە خاکەکەیان نەکردووە، بەڵکو لەناویاندا رۆشنبیری وا هەڵکەوتوون کە باوەڕیان بە دادپەروەری بووەو بەجۆرێك بۆی تێکۆشاون هاوشانی تێکۆشانی گەلانی دیکە بێت.

ناوی ئەو خانەوادەیە بۆ ناوی میر بەدرخانی کوڕی عەبدال خان دەگەڕێتەوە، کە فەرمانڕەوایەتی میرنشینی بۆتانی کردووە لە ماوەی (١٨٢١– ١٨٤٧ز). کە سنوورەکەی لە باشوور گەیشتۆتە لێوارەکانی موسڵ، لە رۆهەڵاتەوە گەیشتۆتە سنە، لە رۆژئاواوە دیاربەکر و سیورك، لەوێشەوە بۆ دوورگەی کریت لە دەریای ناوەڕاست، تا ئەوکاتەی کە دەسەڵاتداری عوسمانی لە ساڵی (١٨٦٦ز) رێی پێداوە بگەڕێتەوە دیمەشق و هەر لەوێشدا لە ساڵی (١٨٦٩ز) کۆچی دوایی کردووە.

سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە سەردەمی حوکمڕانی خۆیدا هەوڵی داوە هەندێك، لە کەسایەتییەکانی ماڵباتی بەدرخانی دەستەمۆ بکات و بەلای خۆیاندا بخات، ئەمین بەدرخانی وەك پشکێنەری داد دامەزراندووە، پلەی باشەویشی داوەتە سێزدە کەسیان. بەڵام چالاکییە سیاسی و رۆشنبیرییەکانی ئەو خانەوادەیە لە پێناو مافەکانی گەلی کورد لە کوردستانی نیشتمانیاندا نەوەستاوە. بەدرخانییەکان هەڵساون بە دەرکردنی رۆژنامە و گۆوار و چاپەمەنییەکانی وەك: رۆژنامەی "کوردستان" لە (١٨٩٨ز)، کە بانگەشەی دەوڵەتی سەربەخۆ و یەکگرتووی کوردی دەکرد. ئەو چاپەمەنییە سیاسییانە هێرشیان کردە سەر سوڵتان و حکومەتەکەی، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە مانەوەی چەندین فەرماندەی سیاسی و رۆشنبیریان سنووردار بکرێت.

سەرەنجام، لە ترسی ستەمی تورکەکان، ژمارەیەك لە فەرماندە و رۆشنبیرەکانیان بەرەو وڵاتی شام و میسر هەڵاتن، بۆ ئەوەی دەرفەتێکی باشتر و گونجاویان هەبێ بۆ بەردەوامیدان بە خەباتی کوردانەیان.

لەوانەی کە بەرەو میسر کۆچیان کرد، سەرەتا مقداد مەدحەت بەدرخان بوو، کە یەکەم رۆژنامەی کوردی بەناوی "کوردستان" لە (١٨٩٨ز) لە قاهیرە دەرکرد (**کوردستان یەکەم رۆژنامەی کوردییەو لەلایەن مقداد مەدحەت بەدرخان لە ٢٢-٤-١٨٩٨ز لە قاهیرە دەرچووە، ئەو رۆژەش بە رۆژی رۆژنامەگەری کوردی داندراوو هەموو ساڵێ لە ٢٢ی نیسان یادی بەرز رادەگیرێو چالاکیو فیستیڤاڵی جۆراوجۆری بۆ سازدەکرێت- و**)، دواتر کۆچی ئەندامانی ئەو خانەوادەیە زیاتر بوو بۆ میسر. ئەویش دوای سەرکەوتنەکانی ئەتاتورك (**مستەفا کەمال ئەتاتورك- و**)، کە ئەو خانەوادەیەی بە دوژمنی هەرە سەرسەختی خۆی دادەنا. بۆیە ئەمین عالی بەدرخان لە ساڵی (١٩٢٥ز) هاتە میسر، ئینجا سورەییا بەدرخان لەدوای کۆتایی هاتنی شەڕی جیهانی یەکەم هاتە میسر و توانی لە ساڵی (١٩٣٠ز) رەگەزنامەی




میسری وەربگرێ. رۆڵێکی بەرچاویشی گێڕا چ لە سەرلەنوێ دەرکردنەوەی رۆژنامەی کوردستان لە میسر لە ساڵی (١٩١٩ز)، یان لە دامەزراندنی "کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان" لە ساڵی (١٩٢٠ز) لە میسر.

هەندێك لە نەوەکانی خانەوادەی بەدرخانییەکان[٢٠٩] لە میسر دەڵێن کە سەرەتای بوونی خانەوادەکەیان لە میسر دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٨١٥ز)، بە

تایبەتی لە هەرێمی (فیوم) کە (٩٠کم) لە قاهیرە دوورە و تێدا نیشتەجێ بوونە. ئەوەش دوای ئەوەی ئەوە هات کە محەمەد عەلی پاشا فرمانێکی بالای دەرکرد بە بەخشینی چوار هەزار دۆنم لە ناحیەی قەڵەمشا و ئتسا بە ئەندازیار عەلی عالی بەدرخان. لەو مێژووەوە ئەندازیار عەلی عالی بەدرخان لە فیوم نیشتەجێ بووە. لە کارەکانیشی دروستکردنی پردەکانی لاهونی کۆنە. (لاهون شارۆکەیەکە سەر بە سەنتەری فیوم لە پارێزگای فیوم لە میسر- لە ویکیپیدیاوە- و ).

دوو خانەوادەی تر لە خانەوادەی بەدرخانییەکانی میسر بوونەتەوە، کە خانەوادەی جندی و خانەوادەی والین، خانەوادەی جندی لە پارێزگای فیوم و دێهاتەکانی دەوروبەری بڵاوبوونەتەوە، بە تایبەتی لە (اتسا و قلمشا و غرق و حجر و برنس و تتون و عزبة قلمشا و عزبة خلیل جندي و عزبة عثمان جندي)، تا وایلێهات خانەوادەی جندی لە رێی پەیوەندی و تێکەڵاوی لەگەڵ سەرجەم بنەماڵەکان، دەستی بەسەر سەنتەری ئتسا داگرت، پاشان لەتەواوی کون و کەلەبەرەکانی ناو سەنتەری شارۆکەکە و دەرەوەیدا بڵاو بوونەوە.

عەلی جندی چوار کوڕی بوونە، (سیف النصر، بدرخان، والي، ریاض). سەیف ئەلنەسر زۆر ژنی هێناون، هاوسەرگیری لەگەڵ بیست و یەك ژندا کردووە، بۆیە وەچەی زۆری هەن، ئەوەش هۆکارێك بووە بۆ بڵاوبوونەوەی رەگ و ریشەیان بە زۆربەی ئاواییەکانی سەر بە سەنتەری ئتسا.

هەرچی بەدرخان پاشایە، بوو بە بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی فیوم و بەنی سویف (ئەوکات بە پارێزگا دەگوترا بەڕێوەبەرایەتی و بە پارێزگاریش بەڕێوەبەر)، بەپێی پلەو پایەکەیەوە بەدرخان پاشا ناسناوی باشەویەی پێدرا. هاوڕێیەکی نزیکی سەعد زەغلولیش بوو، ماڵەکەشی لە تەنیشت ماڵەکەی ئەو بوو، کە پێی دەگوترا (بیت الامة)، باخچەیەك نێوان هەردوو ماڵەکەی لەیەك جیا دەکردەوە. سەعد زەغلول و حەمەد پاشا بە بەردەوامی لە ماڵی بەدرخان

پاشا لەگەڵ ئەودا کۆدەبوونەوە. ئەحمەد بەدرخانیش لە کوڕانی بەدرخان پاشا بووەو یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی سینەمای میسری. عەلی بەدرخـانـیـش کـە نەوەی بووە، ئەویش دەرهێنەرێکی بەناوبانگی سینەمایی بووە.

هەرچی والی بەگی عەلی جندییە، ئەو کوێخا و دەمڕاستی قەڵەمشا و دەوروبەری بووە، ئەو ئەگەرچی کابرایەکی کـورتـەبـالاّ بـووە، بـەڵام پـیـاوێـکـی بـەهـێـز و تێکسمڕاو بووە هەروەك میر جەلادەتی باپیرەی. مەلیك فواد عـەلی، نـاسـنـاوی (باکوییە)ی دا بە والی بەگ جندی و ناسنـاوی (بـەهـویـیـە)شـی دایـە دووان لـە کوڕەکانی والی بەگ.

لە وەچەو وەچەزادەکانی والی بەگ جندی، ئەحمەد بەگ والی جندی، ئـەنـدامـی ئەنجوومەنی (نواب) پەرلەمان بووە بۆ سێ کەڕەت، لە هەڵوێستە زانراوەکـانـی ئەحمەد بەگ کاتێك ئەندامی ئەنجوومەنی (نواب) بووە، کاتێك تەها حوسـێـنـی وەزیری مەعاریفی ئەوکات داوای کردووە خۆی و خێزانەکـەی لـەسـەر خـەرجـی دەوڵەت بۆ چارەسەری بچنە دەرەوە، بەڵام ئـەحـمـەد بـەگ ئـەو داوایـەی ڕەت کردۆتەوەو پێی گوتووە تۆ بۆت هەیە لەسەر خەرجی دەوڵەت بچیتـە دەرەوە، بەڵام هاوسەرەکەت دەبـێ لـەسـەر خـەرجـی خـۆی بچـێـت نـەك هـی دەوڵـەت.

هـەرواشـبـوو، تـەهـا حـوسـێـن لـەسـەر خـەرجـی دەوڵـەت سـەفـەری کـرد و هاوسەرەکەشی لەسەر خەرجی خۆی. هەروەها کاتێك ناکۆکی کەوتۆتـە نـێـوان خەڵکی گوندی (الغرق)، ئەو ئاشتەوایی لەنێودا کردوون‌و گوندەکەشی کـردۆتـە دوو بەش، (الغرق القبلية) و (الغرق البحرية)، ئەوەش بە مەبەستی نەهێشـتـنـی ململانێی نێوان خێزانە پێکناکۆکەکان.

هەرچی سەبارەت بە سەید بەگ والی جندییە، ئەوا بۆ مـاوەیـەکـی دوور و درێـژ کوێخای قەڵەمشا بووە، ئەو دامەزرێنەری "کۆمەڵەی لاوانی موسڵمان" بووە لـە فیوم. لە وەچەکانی ئەویش " کوێخا مەئمون والی جنـدی، هـەروەهـا ڕاوێـژکـار ئیسماعیل والی جندی، کوێخا ئەحمەد والی جندی کوێخای (منشاة)ی فیوم، ئەو

کەسێك بووە کە شاهێدی ڕێزو شکۆو جوامێری بۆ دەدرێت، ئەو خەسڵەتانەش لە باوك و باپیرانی بۆی ماونەتەوە، لە وەچەکانی ئەویش " کوێخا ئەحمەد سەیید والی جندی‌و ئەیمەن والی جندی کوڕی.

## ماڵباتی "کوردی"، دامەزرێنەری تەریقەتی نەقشبەندی کوردی لە میسر:

زۆر خانەوادە لە میسر هەن ناسناوی "کوردی"یان هەیە، لە قاهیرە و منوفیە و غەر و مەنسورەو چەندین پارێزگای تر نیشتەجێن. لەناویاندا خانەوادەی "کوردی" کە لە قاهیرە نیشتەجێن و دەگەڕێنەوە سەر شێخ محەمەدەمینی کوردی، کە تەریقەتی نەقشبەندی لە میسر دامەزراندووە.

ئەمەی خوارەوە کورتەیەکە لە ژیانی ئەو و نەوەکانی‌و کەسایەتییە هەرە چالاکەکانیان لە میسر:

## شێخ محەمەدەمینی کوردی:

شێخی تەریقەتی نەقشبەندییە، زانایانی هاوچەرخی ئەزهەر شایەدی خواناسی و چاکە و دینداری بۆ دەدەن. لەسەرووی هەموویانەوە شێخی ئەزهەر (محەمەد سەید تەنتاوی) و موفتی ناوداری میسری (عەلی جمعە)، کە لە ئاخاوتن و وتارەکانیدا سەرسامی خۆی بە مێژووی پڕ شکۆی گەلی کورد و بەرگرییان لە ڕۆحی ئیسلام و ناسنامەی نەتەوەیی و خەباتە دوور و درێژەکەیان کردووە: دەڵێت :"کورد رۆڵێکی شەرافەتمەندانە و پڕ شکۆ و مێژوویی هەیەو لاپەڕەکانی مێژوو بە پیتی درەوشاوە تۆماری کردوون". ئەو موفتیە بەڕێزە ئاماژە بەو خۆشەویستی و ڕێزەی کورد دەکات بۆ زاناو پیاوچاکانی خوا و ئالوبەیتی پێغەمبەرانی ڕەوانپاك. هەروەها



دەڵێت شێخ محەمەدەمینی کوردی یەکێکە لەو نموونانـە، دوای ئـەویش شـێخ نەجمەددینی کوڕی. دەربارەی ئەمەی دوایی دەڵێت :"ئەم شێخـی تـەریـقـەتـە زۆر لە والییەکانی میسر نزیك بووە، سـەرپـەرشـتـی دڵـنـیـابـوون لـە دروسـتـی خواردنەکانیانی کردووە. ئەو کوردێك بووە کە ئامۆژگاری خەڵـکـی کـردووە بـۆ نزیك بوونەوە لە خودا، تەنانەت لە کاتی ئاخاوتنیـشـدا بـە شـێـوەزاری گـرانـی کوردی دواوە".

شێخ محەمەدەمینی کوردی ئەربیلی (ئەربیـلـی دەسـتـەواژەو گـوزارشـتـێـکـە دەچێتەوە پاڵ خەڵکی هەولێر–و) لە نیوەی دووەمی سەدەی سێزدەی کۆچی لە شاری هەولێر لە کوردستانی عێراق لەدایك بووە. لە حوجرەی باوکی خولـیـا و ئاشنا بووە بە زانست و ئایین، پێگەییوە و قورئانی پیرۆزی لـەبـەر کـردووە. باوکەکەی لە پەیڕەوانی تەریقەتی قادری بووە، دواتـر لـەسـەر دەسـتـی شـێـخ عوسمانی سیراجەددینی کوردی تەوێڵە، شێخـی تـەریـقـەتـی نـەقشبـەنـدی لـە کوردستانی عێراق پەروەردە بووە.

لە ساڵی (١٢٩٩ك/ ١٨٨٢ز) بۆ ئەنجامدانی حەجی ماڵی خودا چۆتـە حـیـجـاز و ساڵێك لە مەککە ماوەتەوە. هەروەها چەند ساڵێك لـە شـاری مـەدیـنـەی پـیرۆز ماوەتەوە. لەوێ مکوڕ بووە لەسەر خوێندن و فێر بوون لە ڕێـی قـوتـابخـانـەی مەحمودییە، تا زۆر شارەزا بووە لە زانست و زانیاری و لە مزگەوتی پێغەمـبـەردا وانەی گوتوونەتەوە. تا بوو بە جێگری حوجرە. پێشوازیشی لە خوێندنی فیقـە و فەرمووده کردووە. ئامادەی وانەکانی مامۆستای توێژەران شێـخ محـەمـەدی ئەشمونی دەبوو لە وتارەکانی بوخاریدا و ئسوڵی فیقهی لەسەر دەستی (شـیـخ مصطفى عز الشافعي) و زانایانی پایەداری دیکە وەرگرتووە. تا دوا ساڵـەکـانـی ژیانیشی بەردەوام بوو لەسەر وانەکانی (سليم البـشـير)ی شـێـخ ئـەلـئـیـسلام، شێخی مزگەوتی ئەزهەر. شێخ سەلیم ئەلبەشیر ڕێزی لێ دەگرت و بـاوەڕی پـێ بـوو. زۆریـش داوای دوعـای لێ دەکـرد، سـەلـیـم ئـەلـبـەشـیر دەربـارەی شـێـخ

محەمەدەمین دەڵێ : "تا شێخ محەمەدەمینی کوردی ماوە دونیاش دەخێر و خۆشیدایە".

شێخ محەمەدەمینی کوردی لەگەڕەکی (امبابە) نیشتەجێ بووە و هەر لەوێش ژنی هێناوەو ژمارەیەکی زۆر منداڵی کوڕ و کچیان بووە. شێخی کوردی وا راهاتبوو هەموو رۆژێك بەر لە بانگی بەیانی لە ماڵ دەچووە دەرەوەو رووی دەکردە مزگەوتی ئەزهەر بۆ نوێژ کردن. هەروەها لە مزگەوتی (سنانیە) نزیك ماڵەکەی پێشنوێژی کردووە. هیچیشی لە مووچەکەی خۆی بۆ خۆی هەڵنەدەگرت و دەیدایە هەژار و نەداران. شێخ محەمەدەمینی کوردی لەسەر مەزهەبی شافیعی بووە، کە مەزهەبی زۆرینەی هەرە زۆری کوردانە.

شێخ محەمەدەمینی کوردی لە بەیانی رۆژی (١١ربیع الاول ١٣٣٢هـ/ ١٩١٥ن) کۆچی دوایی کردووە، لەگەڵ بیستنی هەواڵی کۆچی دوایی شێخ، لە هەموو لایەکی میسرەوە موریدان و شوێنکەوتووانی هاتن بۆ بەخاك سپاردنی.

ئەمانەی خوارەوە لە نووسراوەکانی شێخ محەمەدەمینی کوردیین:

- ارشاد المحتاج الى حقوق المحتاج
- تنوير القلوب
- تعريب رسالة ايها الولد، وخلاصة التصانيف لامام الغزالي
- الحقيقة العلية في مناقب النقشبندية
- سعادة المبتدئين في علم الدين، وهو على المذهب الشافعي
- مرشد العوام لاحكام الصيام، وهو في مسائل بالمذاهب الاربعة
- ضوء السراج في فضل رجب و قصة المعراج
- فتح المسالك في ايضاح المناسك على المذاهب الاربعة
- العهود الوثيقة في التمسك بالشريعة و الحقيقة
- هداية الطالبين لاحكام الدين، وهو على المذهب المالكي
- المواهب السرمدية في مناقب السادة النقشبندية

- نعيمة البرية في الخطب المنبرية، وهو ديوان خطب

شێخ محەمەدەمینی کوردی، (مەدرەسە) قوتابخانەیەکی رەسەنی هەبوو لە خواناسی و باوەڕداری، ئەو قوتابیانەش کە لەسەر ئاستی میسر و جیهان لە ژێر کاریگەریەکەی دابوون و پێی سەرسام بوون، ئەمانە بوون:

- (شیخ سلامة العزامي)، کە دوای کۆچی دوایی شێخی کوردی ئەو سەرپەرشتی تەکیەو خانەقاکەی کرد.
- (شیخ محمد یوسف السقا)، ئەو لە نەوەکانی شێخ محەمەدەمینی کوردییە و لە زاناکانی ئەزهەری شەریفە.
- زانای گەورە (شیخ الولي عبدالوهاب سليم)، وتاربێژی مزگەوتی ئیمام شافیعی لە قاهیرە.
- زانای ڕێزدار (شیخ ابراهيم ناجي).
- زانای ڕێزدار (شیخ محمد یوسف الباهي).
- زانای گەورە شێخ (ابوالخير محمد بن عبدالوهاب الاهناسي).
- زانای ڕێزدار (شیخ سليمان شاكر).
- زانای ڕێزدار (شیخ موسا زوهیر).
- زانای لێکۆڵەر (شیخ محمد رازي حنفي)، کە لە زانایانی هەرە گەورە و بەناوبانگەکانی ئەزهەر بووە.
- ئەدیبی ڕێزدار، (شیخ سليمان بن علي الجهين).
- خواناس، (شیخ وافي عبدالصمد اشعث).
- (شیخ محمد حسنين العدوي المالكي).
- (شیخ محمد بخيت المطيعي).
- (شیخ محمد زاهد الكوثري).
- (شیخ یوسف الدجوي).

## شێخ نەجمەددین کوڕی شێخ محەمەدەمینی کوردی:

وتارخوێنی گەورەی هاوچەرخ و خواناس شێخ نەجمەددین کوڕی شێخ محەمەدەمینی کوردی، ڕۆژی هەینی (٢٩ی محەڕەمی ١٣٢٥ک/ ٢٥ی ئاداری ١٩٠٧ز) لە گەڕەکی بولاق لەدایك بووە. دوای ئەوەی خێزانەکەیان لە گەڕەکی ئیمبابە بۆ بولاق گواستییانەوە. هێشتا منداڵ بوو باوکی بنەماکانی تەریقەتی نەقشبەندی فێرکرد. تەمەنی حەوت ساڵ بوو کە باوکی کۆچی دوایی کرد، هەر لە سەرەتای تەمەنییەوە قورئانی پیرۆزی لەبەر کرد. پاشان بنەماکانی خوێندنەوەو نووسین و نەحو و عەقیدە و فقهی لەسەر مەزهەبی شافیعی، هەروەها بنەماکانی ژمێریاری و زانستیشی خوێندن. دواتر


شێخ نەجمەددین

پەیوەندی کرد بە ئەزهەری شەریف، بوو بە قوتابی زانای گەورەو فەرموودەناس شێخ محەمەد زاهد ئەلکەوسەری، کە قوتابی باوکی ئەو بوو، لەسەر دەستی ئەو فێری زانستەکانی فەرموودەو (ڕاوی) گوێندەکانو زانستی (جرح و تعدیل)، واتە چاکەو ڕاستگۆیی یان خراپەو ناپەسندی ڕاویەکانەوە بوو، تا بوو بە (حجە) لەو زانستانە. (حجە ناسناوێکە لە حەوزەی علمی ئەبەخشرێتە ئەو کەسانەی لە بواری زانستا ئەگەنە پلەی باڵا- و).

پاشان چووە بەردەستی شێخ سەلامە ئەلعوزامی، کە ئەویش قوتابی باوکی بوو، دوای مردنی شێخ محەمەدەمینی کوردی ببووە جێنشینیو مورشیدو ئامۆژگاریکار. شێخ سەلامە ئیجازەی ئیرشادو هەموو ئەو زانستەی دەربارەی دیارو نادیار وەریگرتبوو دایە شێخ نەجمەددینی کوردی. هەروەها ئەرکی پێگەیاندنی زۆرێك لە موریدەکانی خۆیشی بە شێخ نەجمەددین سپارد. دوای

کۆچی دوایی شێخ سەلامە لە رۆژی (١٢ المحرم ١٣٧٦هـ/ ١٩٥٨ز)، موریدەکان کۆبوونەوەو بەیعەت و پابەند بوونی خۆیان بە شێخ نەجمەددینی کوردی راگەیاند بۆ جێنشینی و ئیرشاد، لەسەرووشیانەوە وەزیری ئەوقاف و ژمارەیەکی زۆری مامۆستا و زانای زانکۆکانی میسر.

سەرەرای وانەگوتنەوە، شێخ محەمەد نەجمەددین هەڵسا بە چاپکردنی کتێبەکانی باوکی. توێژینەوەشی لە کتێبی "النهایة في الفتن و الملاحم- ابن کثیر) کرد.

موریدەکانی شێخ نەجمەددین رێز و خۆشەویستییەکی زۆریان بۆ هەبوو، هەمیشە سەردانیان ئەکرد، رێزی زانست و چاکەکەیان دەگرت. لەناویشیاندا مامۆستای گەورە (شیخ عبدالحلیم محمود)ی شێخی زانکۆی ئەزهەر. هەروەها (د. شیخ محمد حسین الذهبي)ی وەزیری ئەوقاف. وە لەوانەی کە بە بەردەوامی سەردانی شێخ نەجمەددینیان دەکرد : (د. محمد طیب النجار)ی سەرۆکی زانکۆی ئەزهەر، (د.عبدالغني عبدالخالق) مامۆستای کۆلێژی شەریعە، هەروەها خواناس (شیخ صادق العدوي) باوکی شێخ ئیسماعیل سادق ئەلعەدەوی وتاربێژی مزگەوتی ئەزهەر، وە خواناس (شیخ صالح الجعفري) وتاربێژی مزگەوتی ئەزهەر، وە خواناس (شیخ محمد ابو العیون)ی مامۆستای کۆلێژی ئسولی دین و شێخی تەریقەتی خەڵوەتی لە میسر، کە سوور بوو لەسەر وەرگرتنی تەریقەتی نەقشبەندی لەسەر دەستی شێخ نەجمەددینی کوردی.

ئەمانە هەندێك لە قوتابییانی شێخ نەجمەددینی کوردین:

- (د. عوض الله الحجازي)، سەرۆکی پێشووی زانکۆی ئەزهەر.
- (د. بدوي عبداللطیف)، سەرۆکی پێشووی زانکۆی ئەزهەر.
- (د. طه محمود الدیناري)، عەمیدی پێشووی کۆلێژی شەریعە.
- ( د. جاد الرب رمضان)، عەمیدی پێشووی کۆلێژی شەریعە.

- ( د. كامل الخولي)، مامۆستای زمانی عەرەبی لە زانكۆی ئەزهەر.

- (د. سيد عبد الطواب)، عەميدی كۆلێژی كچان لە ئەزهەر.

- (د. محمود فرج)، مامۆستای كۆلێژی زمانی عەرەبی.

- (د. رياض هيلال)، مامۆستای كۆلێژی زمانی عەرەبی .

هەروەها دەيانی تر لە زانايان و شێخە بەڕێزەكان.

- شێخ نەجمەددين سوور بوو لەسەر پێگەياندنی منداڵەكانی خۆی بە پەروەدەيەكی چاك و تەندروست، وە رۆحی ميانڕەوی ئايينی و لێبووردەيی تێدا چاندن. زۆربەشيان پەيوەنديان بە ئەزهەرەوە كرد و بوون بە زانای هەرە گەورە، رۆڵەكانيشی ئەمانە بوون:

-خواناس، (د. عبدالرحمن بن شيخ نجم الدين الكوردی)، جێگری سەرۆكی زانكۆی ئەزهەر، يەكێك بوو لە مامۆستا هەرە گەورەكانی زمانی عەرەبی، لە دوای كۆچی دوايی باوكی سەرپەرشتی خانەقای نەقشبەندی كردووە. دوای دوو ساڵ لە مردنی باوكی، ئەويش لە ساڵی (١٩٨٨ز) كۆچی دوايی كردووە.

-(شيخ علاء الدين الكوردی)، لە بليمەت و دەرچووانی زانكۆی ئەزهەرە، هێشتا باوكی لە ژيان دابوو، كە ئەو لە سەرەتای هەشتاكانی سەدەی رابردوو لە تەمەنی لاويدا كۆچی دوايی كرد.

-شێخ ئەلئيسلام و خواناس، (د. ضياء الدين الكوردی)، سەرۆكی بەشی عەقيدە لە كۆلێژی ئسوڵی دين، ئەو موعجيزەی سەردەمی خۆی بووە لە زانست و زانياری و خوێندنەوەو وشياری، دوای شێخ عەبدولرەحمانی برای، ئەركی جێنشينی تەرقەتی نەقشبەندی گرتە ئەستۆ و بەباشترين شێوەش رايگرت. لە (٣١ی كانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٣ز) كۆچی دوايی كرد.

خواناس، (د. محمد بن نجم الدين الكوردی)، بەكاری ئيرشاد و جێنشينی نەقشبەندی هەستاوە، راوێژكار بووە لە ئەنجوومەنی وەزيرانی ميسری، وە دكتۆراشی لە شەريعەتی ئيسلامی، لە زانكۆی ئەزهەر وەرگرتووە.

- شيخ حميد نجم الدين الكوردي.

- شيخ احمد ابن نجم الدين الكوردي.

- شێخی ناودار، (حسن ابن شيخ نجم الدين الكوردي)، دادوەر لە وەزارەتی دادی میسری، لە دەرچووە یەکەمەکانی قۆناغی خۆی بووە لە زانکۆی ئەزهەر.

- (شيخ حسين ابن شيخ نجم الدين الكوردي)، دەرچووی کۆلێژی شەریعەت لە زانکۆی ئەزهەر.

لە نەوەکانی شێخ نەجمەددینی کوردی، ئەوانەی لە ئیرشاد و زانستدا هەڵکەوتوون : شێخ ئەحمەد و شێخ محەمەدی کوڕانی شێخ زیائەددینن.

شێخ نەجمەددینی کوردی لە بەیانی ڕۆژی هەینی (٢٦ ذي العقدة ١٤٠٦هـ/ ١٩٨٦ز) کۆچی دوایی کردووە.

لە ئاستی کۆمەڵایەتیشدا ئەوماڵباتە خاوەن پێگەیەکی بەرز و جێی ڕێز و خۆشەویستی کۆمەڵگای میسری بوونە، بە تایبەتی کە ئەو ماڵباتە لە لابەنی چاکەخوازی و ئاشتەوایی نێوان خێزانە پێکناکۆك و دژەکان ڕۆڵێکی گەورەیان بینیوە، سەرکەوتووش بوونە لە چارەسەر کردنی زۆر کێشەو ململانێ، جا یان لە بواری ژنخوازییەوە بووبێ، یان میرات، یان لە ڕووداوە پێکهەڵپژان و شەڕ و ناکۆکییەکان بووبێ، کە ڕوویانداوە. کاربەدەستانی حکومیش لە ناوچەکەدا لە زۆر لە کێشە ئاڵۆز و دژوارەکان پەنایان بردۆتە بەر ئەو ماڵباتە بۆ چارەسەر کردنیان، ئەویش بەهۆی جێباوەڕ بوونیان بەهۆی ئەو پاکی و دادپەروەرییەی کە لە حوکمەکانا دەریانبڕیوە. هەروەها بەهۆی پێگە و سەنگینی ئەو قسە و ئاخاوتن و ئامۆژگاریانەی، کە ئەوان لە ناوچەکەدا بوویانە[٢١٠].

چەندین ماڵباتی دیکەی میسری کوردی ڕەسەن هەن، لەوانە : ماڵباتی ئەییوبییەکان، کە بنەچەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سوڵتان سەلاحەددینی ئەییوبی، وەك کە پێشتر باسی باوانەکانمان کردن[٢١١]. لێشیان باس دەکرێ کە ئەوان، وا ڕاهاتوون هەموو ساڵێك لە ساڵیادی کۆچی دوایی سەلاحەددینی

ئەییوبی سەردانی دیمەشق بکەن بۆ سەر گۆڕی سەلاحەددین و هەفتەیەکی تێدا دەمێننەوە، لەو هەفتەیەدا بە چەندین چالاکی و کاری خێر و چاکە هەڵدەستن و دواتر دەگەڕێنەوە میسر.

هەروەها ماڵباتی (محیەددین)ی بەناوبانگ، کە رەچەڵەکەکەیان لە دنیکیانەوە دەگەڕێتەوە سەر کوردە رەسەنەکان، وەك ئەوەی (د. عومرو محی الدین)[٢١٢] بۆمان باس دەکات. ئەو لە پشتی خۆیان دوو خێزانی دیکەی دۆزیونەتەوە، کە کوردی رەسەنن، ئەوانیش: خێزانی (درەندەلی) و (ریان)ن. شایانی باسە کە زۆرێك لە نەوەکانی محیەددین پۆستی باڵایان لە بواری سەربازی و سیاسی و ئابووری و رۆشنبیری لە دەوڵەتی میسری وەرگرتووە، لەوانە (فواد محی الدین، خالد محی الدین، زکریا محی الدین، محمود محی الدین...)و چەندانی تر.

## بەناوبانگترین کەسایەتییەکانی میسری بە رەسەن کورد:

لەو ناو و کەسایەتییانەی کە زۆرمان دەربارە خوێندوونەتەوە و هەستمان بە ئاستی بەشدارییەکانیان کردووە لە ژیانی میسریدا، رۆژێ لە رۆژان (بە تێڕوانینی خۆمان) هەستمان بە هاوڵاتیبوونێکی جیا لە هاوڵاتیبوونی میسری لێ نەکردوون، لەگەڵ ئینتیمایەك جگە لە ئینتیمای ئەو وڵاتەی تێیدا دەژین. بەڵام بەڵگەنامەکان دەریانخستووە، زمانیش باسیان کردووە، سەرەداوەکانیش کۆکراونەتەوە و زانیاری زیاتریان لەسەر ئەوان دەرخستووە و سەلماندوویانە کە بنەچەکەی ئەوان کوردە، جا نزیك بێ یان دوور. بەمەش بەهایان لە جاران بەهادارتر و جوانییان لە پێشان زیاتر درەوشاوەتەوە. ئێمەش کە باسیان دەکەین، تیشك دەخەینە سەر ئەم خاڵە و چەند نموونەیەکی میسری بە رەسەن کوردیش روون دەکەینەوە، لەو کەسایەتیانەش :

## میری شاعیران (احمد شوقی ١٨٦٨-١٩٣٢ز):

یەکێك لەو کوردانەی کە لە کوردستانی عێراقەوە هاتوون، بە دیاریکراوییش لە شاری سلێمانی، کەسێکە بە ناوی ئەحمەد شەوقی، کە دەکاتە باپیری ئەحمەد شەوقی شاعیر (لە باوکەوە). کە راسپاردەیەکی لەلای ئەحمەد پاشای جەززار بۆ والی میسر (محەمەد عەلی) هێناوەو والیش دواتر لە دەرباری خۆی هێشتوویەتیەوەو چەند بەردەستێکیشی بۆ داناون. ئەو عەرەبی و تورکی و کوردی بە نووسین و دارشتنەوە زانیوە.


ئەحمەد شەوقی

ئەو باپیرەیە لە کارەکانی خۆی پێی بەپێ چۆتە پێش، تا لە سەردەمی والی سەعید پاشا (١٨٥٤- ١٨٦٣ز) بوو بە ئەمینداری گشتی گومرگەکانی میسر[٢١٣]. دوای ئەوەی باپیری ئەحمەد شەوقی شاعیر (لە باوکەوە) هاتە میسر، باپیرەکەی دیکەیشی (لە دایکە کوردەکەی)[٢١٤] لە سەردەمی (ئیبراهیم پاشا – ١٨٤٨ز) هاتە میسر. کە ناوی (احمد حلیم نجدلی) بوو، کە خەڵکی گوندی (نەجد)ەیە، کە رەنگە مەبەست لە (نەغەدە) بێ، کە دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی کوردستانە لە نزیك دەریاچەی (ئورمیە) ورمێ[٢١٥]. ئیبراهیم پاشا پێی سەرسام بووەو لە خۆی نزیك کردۆتەوە و کەنیزەکێکی یۆنانی بە ناوی (تمراز)ی لێ مارە کردووە، کە لە جەنگی مورە لە ساڵی (١٨٢٧ز) بە دیل گیرابوو، وە لە تەمەنی دە ساڵیدا بوو، ئەو کەنیزەکە لە کۆشکدا لەلای خزمەتکارەکانی ئەو دەژیا. لەو ئافرەتەدا کچێکی بوو، کە دواتر بوو بە دایکی ئەحمەد شەوقی میری شاعیرانمان. ئەحمەد حەلیم پاشا بەردەوام بوو لە خزمەتکردن و وەرگرتنی پۆستی جیاجیا، تا گەیشتە پلەی نوێنەری تایبەتی خدێوی ئیسماعیل. دوای کۆچی دواییشی، خدێوی مووچەکەی گواستەوە

سەرناوی (تمران) ی بێوەژن، کە لە دوای شووکردن ناوی بوو بە (حەلیمەخان)[216].

ئەحمەد شەوقی باپیرە، ژنێکی میسری چەرکەسی هێنا و کوڕێکی لێ بوو ناوی نا (علی)، کە دەکاتە باوکی ئەحمەد شەوقی شاعیر. ئەحمەد شەوقی باپیر لە سەردەمی والی سەعید کۆچی دوایی کرد و سەروەت و سامانێکی زۆری بۆ خێزانەکەی بەجێ هێشت و عەلی کوڕی بەسەری رادەگەیشت. شەوقی لە بەشی یەکەمی شەوقیاتەکەیدا دەڵێت: "..مردنەکەی ئەو (مەبەسەت لە باپیریەتی) لە کاتی کارەکە (کە پۆستی ئەمینداری گشتی گومرگەکانی میسر بووە) لە کاتێکدا بوو کە سامانێکی باشی لێ بەجێما بۆ باوکم و ئەویش زۆر باش و بێ کەموکوڕی پێی ژیا، منیش کە تەنیا و تاقانە بووم، لە سایەدیدا ژیام"[217].

پاشان عەلی هاوسەرگیری لەگەڵ کچێکی جوان کرد ( کە کچی ئەحمەد حەلیم نەجدەلی بوو) و وە لە ساڵی (١٨٦٨ز) هەندێکیش دەڵێن (١٨٦٩ز) کوڕێکیان بوو کە (ئەحمەد شەوقی شاعیر)ە و لەگەڵ خۆیاندا لە گەڕەکی حەنەفی لە قاهیرەدا دەژیا، لە کاتێکدا کە هێشتا دایکەکەی کارەکەری دەکرد لە کۆشکی خدێوی، بۆیە داپیرەکەی ئەرکی پەروەردەکردنی شاعیری گرتە ئەستۆ، تا ئەرکی باوکەکەی سووک بکات و ژیانێکی پڕ لە خۆشی و بەخشندەیی لەگەڵدا بردە سەر[218].

**ئەحمەد شەوقی و شانازیکردن بە کورد بوونیەکەی:**

میری شاعیران بە تەواوی رەچەڵەکەکەی بۆ رۆشن ببووەوە، هەم لە باوك و هەمیش لە دایکیەوە. هەر بۆنەیەکیشی هاتبایەتە پێش ئەوەی دەدرکاند. لە پێشەکی بەشی یەکەمی (شەوقیاتەکەی) دا هاتووە:" گوێم لە باوکم بووە کە بنەچەکەی ئێمەی دەگێڕایەوە سەر کورد، ئینجا عەرەب"[219]. محەمەد عەلی عەونی روونی دەکاتەوە ئەو گوتەیەی ئەحمەد شەوقی کە دەڵێ "ئینجا عەرەب" لەو باوەڕەوە هاتووە کە پێیوابووە بنەچەکەی کوردان عەرەبن، وەك

ئەوەی کە لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا باو و بڵاوە[220]. بەڵام راستییەکەی ئەوەیە، کە رەگ و ریشەی کورد لە ناوچەکەدا رەگ و ریشەیەکی رەسەنە، وەك ئەوەی عەرەب و فارس.

خوالێخۆشبوو (حقي شبلي)، نەقیبی پێشووی هونەرمەندانی عێراقی سەبارەت بە ئەحمەد شەوقی و شانازیکردنی بە کورد بوونەکەی، لە دیدارێکی رۆژنامەوانیدا لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی بیست، کە لە قاهیرە چاوی بە ئەحمەد شەوقی کەوتووە، کاتێك کە ناسناوی میری شاعیرانی پێدراوە، دەڵێت : "کاتێك کە زانی من عێراقیم، هاتە لام و زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم و بەشێوەیەکی گشتی دەربارەی عێراق پرسیاری لێکردم، بەتایبەتیش دەربارەی کورد و شاری سلێمانی، منیش باروودۆخی ئەوکاتم بۆ باس کرد. یەکێ لە بەشداربووانی کۆنگرەکە، سەبارەت بەو گرنگیپێدانەی بە نێردەی عێراقی پرسیاری لێکرد، ئەحمەد شەوقی گوتی ئەوانە لە وڵاتی منەوە هاتوون، لە خاکی باو و باپیرانم، بەوپێیەی کە بنەچەکەی من دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خاکە، بە تایبەتیش کە کوردم، چونکە باپیری من محەمەد (لە پێشدا بە ئەحمەد ناوی هاتووە و لێرەش بە محەمەد، رەنگە ئەمەی دوایی هەڵەی چاپ بێت- و) لەوێوە کۆچی کردووە بۆ میسر". هەندێك لە نووسەران ئەو گوتانەی حەقی شبلییان پشتڕاست کردۆتەوە، کە حەقیقەتەکە دەردەخات و دەڵێت باپیری ئەحمەد شەوقی لە شاری سلێمانی چۆتە ئیستەنبۆل و پاشان لە میسر نیشتەجێ بووە[221].

ئەمە بوو ژین و لەدایك بوونی ئەحمەد عەلی محەمەد شەوقی، کە ناسراوە بە (ئەحمەد شەوقی) میری شاعیران. لە سەرەتای منداڵیدا بەدەست هەڵکوتانێکی سادە لە چاوەکانی گیرۆدە ببوو. لە زۆربەی کاتەکانیش بە چاوەکانی تەماشای سەرەوەی دەکرد. رۆژێکیان داپیرەکەی، کە سەرپەرشتی دەکرد، لەگەڵ خۆی دەیباتە کۆشك بۆ لای خدێوی ئیسماعیل، کە هێشتا تەمەنی لە

سێ ساڵی تێنەپەڕیبوو، خدێویش کیسەی زێڕەکانی لە پێش منداڵەکە لەسەر زەوی ڕوو دەکات، زێڕەکانیش سەرنجی منداڵەکە ڕادەکێشن‌و دەچێت یارییان پێ دەکات، بۆیە خدێوی بە داپیرەی دەڵێت تۆش لە ماڵەوە وەهای بکە، تا لێڕادێ کە هەر تەماشای زەوی بکات. داپیرەش دەڵێت گەورەم ئەو دەرمانە لە دەرمانخانەکەی تۆ نەبێ دەست ناکەوێ، ئەویش دەڵێت : " هەرکاتێك ویستت بیهێنە بۆ ئێرە، من دوا کەسم لە میسر کە زێڕم لێ هەڵبوەرێ"[٢٢٢].

ئەحمەد شەوقی بۆ خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی (شیخ صالح) لە گەڕەکی حەنەفی لەبەر خوێندن دادەنرێ، دواتریش لە قوتابخانەی دواناوەندی خدێوی، زۆر بە سەرکەوتووییش دەیانبڕێ. تا بڕوانامەی ماف و بڕوانامەی هونەری وەرگێڕان وەردەگرێ. دواتر لە کۆشك دەبێتە فەرمانبەر.

ساڵی (١٨٩١ن) لەلایەن خدێوی و لەسەر خەرجی تایبەتی ئەوەوە ناردرایە فەڕەنسا بۆ خوێندن لە بواری ماف و ئەدەبی فەڕەنسی. دوای ئەوەی، کە خوێندنی لە هەردوو زانکۆی مۆنبیلیە و پاریس تەواو کرد، لە ساڵی (١٨٩٣ن) گەڕایەوە میسر تا هەواڵی دەرچوونی خۆی بگەیەنێتەوە خدێوی.

ساڵی (١٨٩٦ن) خدێوی ئەوی وەك نوێنەری حکومەتەکەی نارد بۆ ئامادەبوون لە کۆنگرەی ڕۆژهەلاتناسەکان لە شاری ژنێف لە سویسرا. لەو کۆنگرەیەدا شەوقی قەسیدەی (كبار الحوادث في وادي النيل)ی خوێندەوە، ئیدی ئەستێرەکەی دەستی بە درەوشانەوە کرد.

شەوقی لە گەشتە ساڵانەییەکانی بۆ تورکیا هاوەڵی خدێوی عەباس حلمی دووەمی دەکرد، لەوێ لە بەرامبەر سوڵتان عەبدولحەمیدی سوڵتانی تورکیا شیعری دەخوێندنەوە، ئەویش پلەی (بیك)ی پێ بەخشی و ناسناوی خاوەن شکۆشی لێنا (بیك یان بیە، ناسناو و دەستەواژەیەکی تورکییە، لەدوای ناسناوی (باشا) دێت. بۆ کەسانی چینی سەرەوە یان بە سەرۆکی هۆزە بچووکەکان، یاخود بە بازرگان و دەستڕۆیشتووان دەگوترا بیك یان بیە— و).

دوای لێخستنی خدێوی عەباس حلمی لە ساڵی (١٩١٤ز)، بۆ ماوەی پێنج ساڵان ئەحمەد شەوقیشیان لەگەڵ خێزانەکەی بۆ ئیسپانیا دوور خستەوە. ساڵی (١٩٢٠ز) ئەخمەد شەوقی وەك شاعیرێکی گەورە گەڕایەوە میسر و وەك قارەمانێك پێشوازی لێکرا.

شەوقی دوور نەبوو لە هەست و ناسۆریەکانی شەقامی میسری، لە خۆشیو ناخۆشییەکانی گەلی میسریدا بەشداری کردووە، هەموو ڕووداوەکانیشی لە دووتوێی هەستی قووڵی نیشتمانیدا دەردەبڕی، هەر ئەمەش بوو وایکرد تەواوی شاعیرانی میسر و عەرەبی لە ئاهەنگێکی گەورە لە خانەی ئۆپێرای میسری لە ساڵی (١٩٢٧ز) لەلایەن گەورە بیرمەندانی جیهانی عەرەبی بە سەرۆکایەتی سەعد زەغلول بۆیان سازکردبوو، بیکەن بە پێشەنگی خۆیان.

جگە لە شیعرەکانی، ئەحمەد شەوقی لە ساڵەکانی (١٩٢٧– ١٩٣٢ز) حەوت شانۆگەریشی نووسیون، کە ئەمانەن (مصرع كليوباترا، مجنون ليلى، عنترة، قمبيز، اميرة الاندلس، على بك الكبير).

ئەحمەد شەوقی هاوسەرگیری لەگەڵ خەدیجە شاهین کردووە و حوسێن و ئامینە و عەلی لێ بوونە، ئەوانیش هەر سێکیان مردوون و جگە لە نەوەکانی، کە ئەحمەد شەوقی کوڕی عەلی (ئەمە سێیەم ئەحمەد شەوقییە بەو ناوە کرابێت و نەوەی ئەحمەد شەوقی شاعیرە، ئەویش نەوەی ئەحمەد شەوقی سلێمانییە– و) و نعمە ریاز. ئەم دووانە لە قاهیرە دەژین و ئامینە موئنس، کە لە پاریس دەژی، لەدوای بەجێماون. ئامینەش خۆشەویسترین منداڵی ئەو بووە لەلای[٢٢٣].

لە ڕۆژی (١٣ی تشرینی یەکەم ساڵی ١٩٣٢ز)، ئەحمەد شەوقی کۆچی دوایی کرد و تێکڕای میسر بە گەنج و پیرەوە ماڵئاواییێکی شایانیان لێ کرد، چونکە ئەو کە کۆچی دوایی کرد تەنها شاعیری میسر نەبوو، بەڵکو میری شاعیرانی عەرەب بوو. گۆڕەکەیشی کەوتۆتە گەڕەکی خاتوو عائیشە لە قاهیرە[٢٢٤].

**قاسم امين، سەرنووسەری (المراة المصرية والعربية)،( ١٨٦٣- ١٩٠٨ز):**

سەرنووسەری (المراءة)، دادوەر، چاکسازی کۆمەڵایەتی، قاسم کوڕی محەمەد بەگ ئەمین. نووسەرێکی بەناوبانگی میسرییە. باوکەکەی میرێك بووە لەمیردکانی سلێمانی لەکوردستانی عێراق. بەهۆی ناکۆکییەکی نێوان کوردو عوسمانییەکان باوکیان وەك بارمتە بردۆتە ئاستانە، پاشان لەسەردەمی خدێوی ئیسماعیل پاشا (١٨٦٣- ١٨٩٧ز) رایانگوێزاوەتە میسر، لەوێ پەیوەندی کردووە بە ریزەکانی سوپای میسر، تا گەیشتۆتە پلەی میرالای (میرالای پلەیەکە بۆ فەرماندەی کەشتیگەلی دەریایی، بەرامبەر بەپلەی ئەدمیرال- لەویکیپیدیاو- و).



قاسم لە ساڵی (١٨٦٠ز) لە ئەسکەندەرییە لەدایك بووە، پاشان چوونەتە قاهیرە و لەوێ چۆتە بەر خوێندن و زۆر بە خانەدانو زیرەکی ناسراوە. دوای ئەوە لە ئەزهەر درێژەی بە خوێندن داوە. پەیوەندی لەگەڵ پێشەوا و چاکسازی ناسراو محەمەد عەبدەو سەرکردەی گەورە سەعد زەغلول پتەو بووە. بۆ خوێندن نێردراوەتە فەرەنسا و لەوێ مافی لە زانکۆی مونبیلیە تەواو کردووە، ساڵی (١٨٨٥ز) گەڕاوەتەوە میسر. وەك بریکاری جێگری گشتی لە دادگا دامەزراوە. پلەکانی ناو دادگای بڕیون تا بۆتە راوێژکار لە دادگای تێهەڵچوونەوە. نزیکەی (٢٣ ساڵ) لە دادگای میسری خزمەتی کردووەو نموونەیەك بووە لە دادپەروەری و پاکی و بوێری لە ئەدەبدا.

بە داکۆکیکاری مافی ئافرەتانی عەرەبی ناسراوە. داواشی لە ئافرەتان کردووە بخوێنن، و فێرببن، تا بتوانن رۆڵی پێشەنگی خۆیان لە کۆمەڵگادا ببینن. هەندێك

له نووسەرەکانی هاوتەمەنی خۆی بەشێك لە بیروڕاکانی ئەویان رەت کردووە، کاتێکیش کە لە ساڵی (١٨٩٩ن) لە تەمەنی سی و چوار ساڵی کتێبی (تحرير المراءة) ی دەرکردووە، بە توندی هێرشیان کردۆتە سەر. لەسەرووشیانەوە پێشەوای ئابووری (طلعت حرب)، لەگەڵ زانایانی ئایینی و پارێزگاران. قاسم ئەمین بە کتێبی دووەمی کە ناوی (المراءة الجديدة) یەو لە ساڵی (١٩٠٦ن) دوو ساڵ بەر لە کۆچی دواییەکەی دەرچوو، بەرپەرچی ئەوانی دایەوە. لە (٢٣ی نیسانی ساڵی ١٩٠٨ن) لە تەمەنی چل و پێنج ساڵی بەهۆی جەڵتەی دڵ لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە"[٢٢٥].

## محمد علی عونی:



( محەمەد عەلی عەونی)

محەمەد عەلی عەونی توێژەرێکی کوردە، تەمەنی خۆی خستۆتە خزمەت رۆشنبیری، تا ئەوەی کە ناسناوی پردی شارستانیەتەکان "جسر الحضارات"ی لێنرا. ئەو هەر بەوەندە نەوەستاوە کە باس لە گەلی کورد بکات، کە خۆی لەوان کەوتۆتەوە و خەباتەکەیان لە رێی کاروانی شارستانیەتی مرۆڤایەتی دەربخات، بەڵکو سوور بووە لە ناساندنی نەتەوەکانی دیکەی ناوچەکەش.

محەمەد عەلی کوڕی عەبدولقادر ئەفەندی کوڕی محەمەد عەلی ئاغای سویرکی یە. ساڵی (١٨٩١ن) لە شاری سویرك لە ویلایەتی دیاربەکر لە کوردستانی تورکیا لە دایك بووە. لە ماڵباتێکی سۆفییەکانی قادری نەقشبەندی، کە بە زانست و فتوادان ناسراون. (لێرە هەردوو تەریقەتی قادری و نەقشبەندی بەیەکەوە نووسراون، کە پێدەچێ ئەو ماڵباتە پابەند و موریدی هەردوو تەریقەت بووبن –و)، باوکەکەی موفتی شاری سویرك بووە. باپیرەکەشی،

شێخ محەمەد عەلی ئاغا وانە و دەرسی داونەتەوە، دوای ئەوەی کە وازی لە کاری خۆی هێناوە لەناو سوپای عوسمانی، کە پلەی (دەلیل باشی یان بێك باشی) هەبووە. لە قوتابخانەی فەیزییە وانەی وەعز و ئیرشادی داوەتەوە، کە تاکە قوتابخانە بووە لە سویرك. زۆر زانا لەسەر دەستی ئەو دەرچوونە، لە ساڵی (١٣٤١ك/ ١٩٢١ز) کۆچی دوایی کردووە.

محەمەد عەلی عەونی خوێندنی سەرەتایی لە کوردستان تەواو کردووە.ماڵباتەکەیان ناچار بوونە بۆ میسر هەڵبێن، ئەگەرچی تەمەنیشی بچووك بووە، ئەویش بەهۆی ئەو ستەمەی کە تورکەکان بەرامبەر بە کەمایەتییە ناتورکەکان ئەنجامیان دەدا، بە تایبەتیش بەرامبەر بە کورد. کاتێ گەیشتە میسر، ماڵباتە کوردەکانی پێشووتر گەیشتبوونە ئەوێ و گرتیانە خۆ، وەك ماڵباتی تەیموری و بەدرخانیەکان. لەوێ پەیوەندی بە حوجرەی کوردانەوە کردووە لە ئەزهەری شەریف. لە سەردەمی قەیسەر بڕوانامەی ئەزهەری بە پلەی بەرز پێدرا، کە لە جیاتی دوازدە ساڵ بە شەش ساڵانی بڕی، ئەوەش ئەو ماوە دیاریکراوەیە بوو بۆ قوتابیانی نامیسری لە ئەزهەر.

کاتێك کە دیوانی مەلەکی میسری رایگەیاند پێویستی بە وەرگێڕی زمانە رۆژهەڵاتیەکان هەیە، محەمەد عەلی عەونی داوای خۆی پێشکەش بە دیوان کرد بۆ بەشداربوون لە پێشبڕکێیەك بۆ دانانی کەسێك وەك وەرگێڕ بۆ زمانە رۆژهەڵاتییەکان بۆ بەشی وەرگێڕان و بە میسری کردنی بەڵگەنامەکانی تایبەت بە میسر، کە بە زمانی تورکی عوسمانی نووسرابوون. ئەو بەشە لەلایەن مەلیك فوادی یەکەم بڕیاری کردنەوەی بۆ درا. لەو پێشبڕکێیەدا محەمەد عەلی عەونی دەرچوو، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە جگە لە زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی و فەرەنسی، چەندین زمانی کۆنی دیکەی دەزانین، هەروەها لە کردنەوەی رەمزو دەستنووس و هێڵکارییە مێژووییەکانیش بە توانا بووە. بۆیە لەسەر ئەو وەزیفەیە دامەزرا و بەشەکەی کردەوەو تا رۆژی مردنیشی هەر

سەرپەرشتی کرد. جگە لەمانە، ئەرکی پاراستنی هەموو ئەو فرمان و بەڵگەنامە مێژووییە فەرمییانەشی پێ سپێردرا، کە مێژووەکەیان دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی «حەمەد عەلی پاشای دامەزرێنەری دەوڵەتی نوێی میسر» کە ئێستا بە بەڵگەنامەکانی (عابدین) ناسراون. بەهۆی ئەو پەیوەندییە بەرفراوانەشەوە کە لەگەڵ ڕۆژهەڵاتناس و زانایانەوە هەیبووە لە سەرتاسەری جیهان، ڕۆشنبیرییەکی بەرفراوانی پێکەوەناوە.

سەرباری کارەکانیشی کە زۆربەی کاتیان لێ گرتووە، بەڵام نەتەوەی کوردیشی لەبیر نەکردووە کە بۆ سەلماندنی ناسنامەی خۆی تێکۆشاوە، ئەویش بە پێنووسەکەی بۆی تێکۆشاوە. تا خوێنەری عەرەبی بە خەبات و تێکۆشانی گەلی کورد ئاشنا بکات. هەمیشەش ئەوەی دووپات دەکردەوە کە: گەلی کورد و عەرەب دوو هاوپەیمانی ستراتیژین، کە یەکیانگرتووە لە بەرامبەر هەر هەیمەنەیەکی فارسی و تورکی. ڕۆژگاریش بیرۆکەکەی ئەویان سەلماندووە. ئێستاش دەبینین کە ململانێ لەسەر ناوچەکە لەنێوان فارس و تورکانە، بەهۆی غیاب و ئامادەیی عەرەبەوە.

## لە کارەکانی:

محەمەد عەلی عەونی دەستی راگەیشت بە دانەیەك لە دەستنووسی یەکێك لە گەورەترین شوێنەواری کوردی، کە بە زمانی فارسی نووسراوە بەناوی (شەرەفنامە)، کە لە سەدەی شازدە لەلایەن شەرەفخانی بەدلیسی نووسراوە[٢٢٦]. باوەڕیشی بە هاوڕێکەی خۆی (الشیخ فرج الله زكي الكردي)[٢٢٧] هێنا کە ئەو کتێبە بە زمانی زگماکی خۆی چاپ بکرێت. بۆیە محەمەد عەلی عەونی لە ساڵی (١٩٣٠ن) هەستا بە نووسینی پێشەکییەك بە زمانی عەرەبی، پاشان هەڵسا بە وەرگێڕانی کتێبەکە بۆ زمانی عەرەبی، کە لە دوو بەش پێکهاتووە: بەشی یەکەم تایبەتە بە مێژووی وڵاتان و میرنشینە کوردەکان و ساڵی (١٩٥٨ن) واتە دوای شەش ساڵ بەسەر کۆچی دواییەکەی لە میسر چاپ

و بڵاوکرایەوە. بەڵام بەشی دووەمی تایبەتە بە مێژووی فارس و تورك، ئەویش لە ساڵی (١٩٦٣ز) لە میسر بڵاوکراوەتەوەو (د. یحیا الخشاب)[٢٢٨] پێشەکی بۆ نووسیون.

محەمەد عەلی عەونی هەڵساوە بە وەرگێڕانی ( پوختەی مێژووی کورد و کوردستان -خلاصه)ی محەمەدەمین زەکی بەگی لە کوردی بۆ عەرەبی، هەروەها کتێبی (ناودارانی کورد و کوردستان)ی محەمەدەمین زەکی بەگی لە کوردییەوە کردۆتە عەرەبی. ئەوەش دوای ئەوەی کە گەڕایەوە بۆ بەشی یەکەم و پێیداچووەوە و چەند زانیارییێکی بۆ زیاد کرد، ئەو کتێبەی لە ساڵی ( ١٩٣٠ز) لە میسر چاپ و بڵاوکردەوە. هەروەها کتێبی (القضية الكردية ماضي الكرد و حاضرهم)ی بە ناوی خواستراو (د.بلە ج شێرکوە) نووسیوە، ئەمەش بۆ ئەوەی کە کۆشکی مەلەکی تووشی ئیحراجی نەبێتەوە، لە کاتێکدا کە پەیوەندییەکی باشی هەبووە لەگەڵ تورکیا. هەر لە کتێبەکانی ئەو: دەستنووسێکە بە ناوی (الرسالة العونية في انساب الاسرة التيمورية) کە هێشتا چاپ نەکراوە و لەسەر ماڵباتی تەیموورییەکانە.

لە چلەکانی سەدەی بیست، لیژنەی (هەزار کتێب) داوایان لێکرد بۆ وەرگێڕانی بەشی دەیەمی (سیاحەتنامە)ی نووسەری تورکی (ئەولیا چەلەبی) لە ساڵی ( ١٦٦٠ك)، لە تورکی کۆنەوە بۆ زمانی عەرەبی. نووسەر لەو بەشەی کتێبەکەیدا میسری بە خۆشەویستی و هۆگری وەسف کردووە. محەمەد عەلی عەونی بەهۆی عەشق و خۆشەویستی بۆ میسر، وەریگێڕایە سەر زمانی عەرەبی، بەڵام چاپ نەکرا تا لە ساڵی (٢٠٠٣ز) خانەی (الوثائق المصرية) بە چاپی گەیاند.

کاتێکیش کە ئەمیرە فەزیەی خوشکی مەلیك فاروق لەلایەن ڕەزا شای پەهلەوی شای ئێران بۆ وەلی عەهد محەمەد ڕەزا پەهلەوی خواسترا، ئەرکی فێرکردنی زمانی فارسی بە محەمەد عەلی عەونی سپێردرا. لە بەرامبەریشدا ڕەزا شای پەهلەوی مەدالیایەکی فارسی بەنرخی پێشکەش کردووە، جگە لە

مەدالیای نیل، کە لەلایەن میسرەوە پێی بەخشرا.

لە هەڵوێستە جوامێرەکانیشی، کاتێك کە مەلیك فاروق داوای لێ کردووە (بە زۆر) بسەلمێنێ کە رەچەڵەکەکەی دەگەڕێتەوە سەر پێغەمبەر (د.خ)، بۆ ئەوەی فاروق متمانە و سۆزی گەلی میسر دژ بە ئینگلیز مسۆگەر بکات، چونکە گەفی لادانیان لێ دەکرد، لە بەرامبەریشدا مەلیك (۱۰۰۰ دۆنم)ی بداتێ. بەڵام محەمەد عەلی عەونی بۆی جێبەجێ نەکردووە، چونکە هیچ بەڵگەنامەیەکی راستەقینە لەبەر دەستدا نەبوونە ئەوە بسەلمێنن کە رەچەڵەکی مەلیك بگەیەنێتەوە سەر بنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ).

محەمەد عەلی عەونی لە خاتوو زەینەب محەمەد ئەلرفاعی میسری سعێدی، دوو کوڕ و کچێکی هەن: خوالێخۆشبوو (ئەندازیار سەلاحەددین عەونی) و (ئەندازیار عسامەددین عەونی)، هەروەها نووسەر (دوریە عەونی)، **(ئەمەی دوایی یەکێکە لە سێ نووسەری ئەم کتێبە– و)**، لەگەڵ ژمارەیەك نەوە.

محەمەد عەلی عەونی لە تەمەنی پەنجا و پێنج ساڵی، لە (۱۱ی تەمموزی ۱۹۵۲ز) لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە و لەسەر لووتکەی چیای مەقتەم، لە باخچەی مغاوری بەکتاشی نێژراوە، کە دەڕوانێتە سەر مەزاری سۆفی ئیسلام (عمر بن القارض)، کە عەونی لە ژیانیدا زۆر بە فەلسەفەی ئەو سەرسام بووە.

لە حەفتاکانی سەدەی بیست، رۆڵەکانی هەڵسان بە پێشکەش کردنی کتێبخانە بەنرخەکەی باوکیان، بەو هەموو کتێبە ناوازانەوە، بە زانکۆی قاهیرە. هەندێك لە دەستنووسەکانیشیان لەوانەش فەرهەنگی عەرەبی/ کوردی پێشکەش کرد بە کۆڕی زانیاری کوردی لە بەغدا، کە دواتر ئەو کۆڕە بەر لە چاپ کردنی فەرهەنگەکە لەلایەن حکومەتی عێراقەکە داخرا[۲۲۹].

لە بەرامبەر ئەو خزمەت و پایەی کە ئەو زانا و مێژوونووسە گەورەیە هەیبووە، وەزارەتی رۆشنبیری لە حکومەتی هەرێمی کوردستان و بە چاودێری بەڕێز مەسعود بارزانی (سەرۆکی هەرێم)، فیستیڤاڵێکی رێزلێنانی بۆ ئەو خزمەتە

نایابەی ئەو مێژوونووس و توێژەر و زانای گەورە محەمەد عەلی عەونی لە (١-٢ / ١١ / ٢٠٠٧ ز) لەژێر ناونیشانی (محەمەد عەلی عەونی پردێك بۆ رۆشنبیرییەکان) سازدا. ئەویش بە ئامادەبوونی خەڵکێکی زۆر، کە لە سەرانسەری کوردستان داوەت کرابوون. وەفدێکی رۆشنبیرانی میسریش کە پێکهاتبوو لە ژمارەیەك لە رۆشنبیر و نووسەر، لەگەڵ هەندێك لە منداڵ و نەوەکانی ئامادەی ئەو فیستیڤاڵەیە بوون.

**عباس محمود العقاد** (١٨٨٩- ١٩٦٤ز):

مێژوونووسێکی کارامە، زمان پاراو، سیاسییەکی لێزان و رۆژنامەنووسێکی


( عباس محمود العقاد)

وشیار، پلە و پایە بەرزەکەی نە بە شان و شکۆ نە بە سوڵتانی، نە بە پلە و بڕوانامە وەرنەگرتووە، بەڵکو بەو بەهرە جۆراوجۆرانە و هەوڵ و تێکۆشانە بەرزەو رەنجە بەردەوامەوە پێیگەیشتووە. ئەو بە قەڵەم و کتێبەکانیەوە ژیا. هیچ ئەرك و وەزیفەی وەرنەگرتن، نە لەبەر رق لێبوونەوە لەکاری وەزیفی، بەڵکو بۆ پێداگیری لە ئازادییەکەی و شانازی پێوەکردنی، نەبادا بەهۆی کاری وەزیفییەوە لێی سنووردار بکرێن. هەروەها بەو عەشقەی بۆ مەعریفە و زانینی هەبوو. کاتێك کە مرۆڤ بەژن و بالای بەرز بێ، دەبێتە جێی سەرنجی دەوروبەر و لێی رادەمێنن. کاتێکیش مرۆڤ بەرز و بڵند بوو بە رۆشنبیرییەکەی و داهێنانەکەی و هەست کردن بە کەرامەتەکەی، ئەوا دەبێتە جێی سەرنجی دڵ و هۆشی خەڵکانی دەوروبەری. عەقاد بەرز و

بڵند بوو، هەم لە بەژن و باڵا و هەم لە توانا و ڕۆشنبیری و داهێنان.

عەباس مەحمود ئیبراهیم مستەفا ئەلعەققاد لە ڕۆژی (٢٨ی حوزەیرانی ساڵی ١٨٨٩ز) لە شاری ئەسوان لە میسر لە دایك و باوکێکی بە ڕەسەن کورد لەدایك بووە. ئیبراهیم مستەفای باپیری لە ولایەتی دیاربەکری کوردی لە کوردستانی تورکیا هاتۆتە میسر و لە شاری ئەسوان لە سعێدی میسر نیشتەجێ بووە، ئەو شارەی کە کۆمەڵێك خێزانی کوردی تێدا دەژیان. باپیرەی ئەو کاری پەشمینی ئاوریشمی دەکرد، هەربۆیە ناسناوی عەققادی کەوتۆتە سەر، وەك ئەوەی کە نووسەر و ئەدیب (عامر العقاد) ی برازای عەققاد باسی لێوە کردووە.

هەرچی بنەچەکەی دایکەکەشیەتی، ئەوا ئەویش کوردییە، لە کوردەکانی ئەسوان. عەققاد لە بەژن و باڵا و ئارامی خۆڕاگری لەکاتی تەنگانە و ناخۆشی و گەڕاوەتەوە سەر دایکی (بە دایکی چووە)، کە زۆر خواناس و بە ئیمان بووە. عەققادیش سێیەکی ئەو داهاتەی لەڕێی کاری ڕۆژنامەوانی و نووسینی کتێب دەستی دەکەوت بۆ دایکی دەنارد. دایکەکەی لە ساڵی (١٩٤٩ز) لە تەمەنی شەست ساڵی کۆچی دوایی کردووە. هەروەها باپیرەکەشی (لە دایکیەوە) ناوی حاجی محەمەد ئاغا شەریف بووە، یەکێك بووە لە کوردە ناودارەکانی ئەسوان، وە یەکێك بوو لە پەیڕەوکارانی تەریقەتی نەقشبەندی قادری.

هەرچی سەبارەت بە مەحمود عەققادی باوکیەتی، ئەوا بە پیاوێکی خواناس و دەستپاك و چاکەکار ناسراوەو خێزانەکەی خۆیشی زۆر خۆشویستووە. کاری ئەمینداری کردووە لە خانەی (المحفوظات) لە شاری ئەسوان. زۆریش هۆگری ئەدەب بووە. هەمیشە ئامادەی کۆڕی ئەدیب و زانایان بووە، بە تایبەتی کۆڕی (شیخ احمد الجداوی)، کە زانایەکی ئەزهەری شەریف بووە و پەیڕەوکاری سەید جەمالەددینی ئەفغانی بووە. کۆڕی ئەو کۆڕی ئەدەب و زانست بووە. عەباسیش هەر لە منداڵییەوە حەزی لە خوێندن و خوێندنەوە بووە. عەققاد چەند برایەکی دیکەشی هەبوون، وەك : محەمەد، ئیبراهیم، کوێخا، مستەفا،

ئەحمەد (باوکی عامر عەققادی ئەدیب)، تاهر. باوکیان لە ساڵی (١٩٠٧ز) کۆچی دوایی کردووە.

هاوڕێی هەمیشەیی عەققاد - هەر لە بیستەکانی سەدەی بیست تا کاتی مردنی- ئەدیب و نووسەر (محمد طاهر الجبلاوي) (١٨٩٨- ١٩٧٩ز) سەبارەت بە رەچەڵەکی عەققاد هەمان شت دەڵێ، کە عامر عەققاد گوتوویەتی، کە بنەچەکەیان کوردی رەسەنن و ئەو خۆی لە عەققاد بیستوویەتی.




بۆ زیاتر روونکردنەوە، عەققاد ویستوویەتی بۆ ئەوانی دی بسەلمێنێ کە بنەچەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەر کوردانی دیاربەکر، هەمان ئەو شارەی بنەچەکەی محەمەد عەلی پاشای دامەزرێنەری میسری هاوچەرخی بۆ دەگەڕێتەوە.

عەققاد بە بۆنەی جەژنی نەورۆز، جەژنی نەتەوەیی کورد ئاهەنگی دەگێڕا. لە ساڵی (١٩٥٢ز) عەققاد قەسیدەی (نەورۆز)ی نووسی، تیایدا شۆڕشی (٢٣ی تەمموزی ١٩٥٢ز) بە شۆڕشی نەورۆز چوواندووە، کە جەژنی ئازادی و رزگارییە لە ستەم و ملهوڕی، وە بۆ رزگار بوون لە حوکمی مەلەکی لە میسر. عەققاد لە قەسیدە(چامە شیعریەکەیدا) دەڵێت:

| | |
|---|---|
| اهلا بنوروز وليد | اهلا بميلاد سعيد |
| يوم جديد قلت بل | عهد على مصر جديد |

هەر لەو چامە شیعریەیدا عەققاد داوا دەکات جەژنی نەورۆز بکرێتە جەژنێکی جیهانی، نەك تەنها بۆ گەلی کورد، بەڵکو ببێتە جەژنێك بۆ هەموو جیهان و

مرۆڤایەتی. چونکە ئەو جەژنە مانای پیرۆزی هەیەو ئاماژەیەکی پرشنگدارە بۆ خۆشەویستان لە هەموو دونیا، ئەمەش کۆپلەیەکی کۆتایی چامە شیعریەکەیەتی:

| | |
|---|---|
| یا صحبة التوفیق | وفقتم الی النهج السدید |
| عید الوفاء اذ استعید | فمن الوفاء المستعید |
| عید له في ذمة ال | تاریخ توفیق حمید |
| عید الاوائل والاواخر | والخمائل والورود |
| ما احوج الدنیا اذا | احتفلت الی عید وحید |

عەققاد داوا لەخەڵکانی تر دەکات لەپاڵ جەژنی نەورۆزدا یەکبگرن، چونکە ئەو جەژنە جەژنی یەکگرتنو خۆشەویستییە، لەجێی ناکۆکییەکانی نێوانیان.

عەققاد کە پێگەیشت، عەقڵو ئاوەزی لەتەمەنی گەورەتر بوو. وا رێککەوت جارێکیان ئیمام محەمەد عەبدە سەردانی قوتابخانە سەرەتاییەکەی بکات، مامۆستای زمانی عەرەبی دەفتەری عەباسی نیشانی ئیمام دا، ئەویش بەزەردەخەنەوە چاوی پێدا گێڕاو گفتوگۆی لەگەڵ عەققاد کرد، پاشان رووی کردە مامۆستاکەیو گوتی: چەند باشە ئەو کورە لەدواڕۆژدا ببێتە نووسەر.

عەققاد زمانی ئینگلیزی خوێند تا بڕوانامەی سەرەتایی بە سەرکەوتوویی بەدەست هێنا، ئەمەش بواری ئەوەی بۆ رەخساند کە راستەوخۆ دەست بکات بە خوێندنەوەی ئەدەبی ئینگلیزی. ئەو دەربارەی خۆی گوتوویەتی، کە بەر لە تەمەنی دە ساڵی فێری خوێندنەوەو نووسین بووە. هەرچییەکیش لە رۆژنامە و کۆواری بەردەست بکەوتبان دەیخوێندنەوە و سوودی لێوەردەگرتن بۆ زیادکرکردنی خەرمانەی زانیاریەکانی. لە ساڵی (١٩٠٥ ز) بە خۆبەش کاری وانە گوتنەوەی لە قوتابخانەیەکی خەیریدا کردووە، هەروەها کاری فەرمانبەری حکومیشی دەکرد، پاشان وازی لە هەردووکیان هێناوە و رووی کردۆتە کاری ئەدەب و رۆژنامەوانی.

لە ساڵی (١٩٠٧ز) لەگەڵ مێژوونووسی کورد (محمد فريد وجدی) گۆواری (بەیان)یان دەرکردووە، لە نێوان ساڵانی (١٩١٢-١٩١٤ز) پاشان گۆواری (عکاض)ی دەرکردووە. شیعرەکانی خۆیشی لە زۆربەی ڕۆژنامە و گۆوارەکاندا بڵاوکردوونەتەوە.

عەققاد لە ژیانی خۆی زۆر بەسۆز بووە، بەڵام لە خۆشەویستیدا سەرکەوتوو نەبووە، دڵە پڕ میهرەکەی پێشی پێ گرتووە، هەرچەندە ئەو (سارە)ی خۆشویستووە، لە کاتێکدا ئەویش ئەدەبیەیەکی بە توانا بووەو شێوازەکەشی نایاب و تەواو ڕۆژهەڵاتییانە بووە. ڕەنگە هەر ئەو شێوازە هۆکاری سەرنجڕاکێشانی بوو بێ لەلای عەققاد، کە بۆ یەکەم جار لە گۆواری (المحروسة) بینیویەتی، کە خۆی تەمەنی لە بیست و حەوت ساڵی و سارەش لە بیست و یەك ساڵی تێنەپەڕی بوو، بەڵام چیرۆکەکەیان زۆر تاڵ و ناخۆش کۆتایی پێ هات و عەققاد بە درێژایی تەمەنی تێیدا ژیا. عەققاد زیاتر لەهەر کەسێك گرنگی بە کاروبار و پرسی ئافرەتان دا، چوار کتێبیشی تایبەت کردوون بۆ توێژینەوەکەی (الانسان الثاني و المراءة- ١٩١٤) و (هذه الشجرة-١٩٤٥) کە توێژینەوەیەکی تێروتەسەلە لەسەر ئافرەت. هەروەها دوو کتێبی تری تایبەت کردوون بە دوو کەسایەتی ئافرەت، یەکەمیان (الصديقة بنت الصديق- ١٩٣٤) و دووەمیشیان (فاطمة البتول والفاطميون- ١٩٣٨)، هەرچی (سارە)یە تاکە چیرۆکیەتی، کە ئەویش مێژووی ئەدەبی ئافرەتانە.

ئەو لە ژیانی خۆیدا زۆر ڕێزلێگیراو بووە، هەم لە میسر و هەم لە جیهانی عەرەبی. ساڵی (١٩٤٠ز) بۆ کۆڕی زمانی عەرەبی لە میسر هەڵبژێردرا، وە ئەو لە یەکەمەکان بووە تیایدا. وە ئەندامی نێردراو بووە بۆ کۆڕی زمانی عەرەبی لە دیمەشق و کۆڕی زانیاری عێراقی. لە ساڵی (١٩٥٩ ز) مەدالیای دەوڵەتی بۆ ڕێزلێنان لە ئەدەب پێبەخشراوەو لەلایەن سەرۆکی پێشوو جەمال عەبدولناسر پێیوەکراوە.

له ڕۆژی (١٣ی ئاداری ١٩٦٤ز)، جیهانی عەرەبی و ئیسلامی گەورەترین ئەدیب و نووسەر و شاعیر و بیرمەند و زانای لەدەست دا، کە هاوتای نەبوو لەنێو زانا و کەسایەتییەکانی سەردەمەکەی. لەدوای خۆیدا (٩٠) کتێبی بەجێ هێشتوون، یازدە لەو کتێبانە دیوانی شیعرین. بەناوبانگترینیشیان (العبقریات) ە..هەموویشیان بەڵگەی دانایی عەققاد دەردەخەن[٢٣٠].

## ئەدیب، عامر العقاد (١٩٣٦- ١٩٨٥ز):

نووسەر و ئەدیب، (عامر ئەحمەد مەحمود ئەلعەققاد)، لە ساڵی (١٩٣٦ز) لە شاری ئەسوان لە باشووری میسر لە خانەوادەیەکی کوردی، کە بنەچەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ دیاربەکر، لەدایك بووە. برازای عەققاد بووە و سکرتێری تایبەت و بەڕێوەبەری کارەکانیشی بووە. چەندین کتێبیشی لەسەر ژیانی مامی خۆی داناون، لە ناویشیاندا کتێبی (لمحات من حياة العقاد الادبية).

له خێزانێکدا پێگەیشتووە کە عەباس عەققادی مامی تێیدا دەرچووە. ساڵی ( ١٩٥٨ ز) مافی خوێندووە، پاشان دە ساڵان لەگەڵ عەباسی مامیدا بووە، تا کاتی کۆچی دوایی عەققاد لە ساڵی ( ١٩٦٤ز). لەسەر دەستی ئەو چەندین زانست فێربووە، وەك زانستەکانی ئەدەب و رەخنەی ئەدەبی و بنەماکانی. عامر لە ساڵی (١٩٨٥ز) کۆچی دوایی کردووە.


عامر العقاد

کتێبەکانیشی بریتین لە : (اخر كلمات العقاد، لمحات من حياة العقاد، غراميات العقاد (جزء من كتاب لمحات)، معارك العقاد الادبية، معارك العقاد السياسية، صالح جودت في مفترق الطرق: دراسة في شعره و

نثره، احمد امين: حياته و ادبه، صوت السماء، بلال بن رياح، المثال النادر: خديجة بنت خويلد، حرب الاكاذيب الشيوعية، جمال عبدالناصر: حياته و جهاده، وجاء مايو، دراسة للكفاح الوطني السوداني، احاديث العقاد الصحفية).

چەند کتێبێکی بە هاوبەشیشی هەن: (العقاد..و هولاء- القاهرة...جمعية العقاد الادبية- العواد...ابعاد و ملامح- السعودية- العواد...قمة و موقف، السعودية).

چەند کتێبێکی لەسەر عەباس هەن، کە کۆیکردوونەتەوەو پێشەکی بۆ نووسیون وەك :(ما بعد البعد- ديوان شعر. دراسات في المذاهب الادبية والاجتماعية. بحوث في اللغة والادب. يوميات ج٤،٣. العقاد في معاركه السياسية والادبية. ذكرياتي مع عاهل الجزيرة العربية لعباس محمود العقاد)[٢٣١].

## نووسەر و رۆژنامەنووس، ابراهيم رمزي:

ئیبراهیم رەمزی بەگ کوڕی محەمەدە گەورە کوڕی عەلی ئاغای ئەرزەڕۆمییە: ئەویش لە بنەچەکەی کوردی رەسەنە و باپیری لە سەردەمی محەمەد عەلی پاشا هاتۆتە میسر. لە ساڵی (١٨٦٧ز) لە شاری فیوم لەدایك بووە. لەوێ کۆواری هەفتانەی (الفيوم) ی دەرکردووە. هەروەها (تاريخ الفيوم) و رۆمانی (المعتمد بن عباد)ی نووسیوە. چۆتە پاریس و ساڵێك و مانگێك لەوێ ماوەتەوە. پاشان گەڕاوەتەوە میسر و لە قاهیرە نیشتەجێ بووەو کۆواری (المراءة في الاسلام)، دوای ئەویش رۆژنامەی (التمدن)ی دەرکردووە. هەروەها لە ساڵی (١٨٩٩ز) قالب و دارێژگەی دامەزراندووە بۆ دروستکردنی پیتی عەرەبی.

پاریدەی ئەحمەد لوتفی داوە بۆ دەرکردنی (الجريدة) و بەڕێوەبردنی. پاشان سەرۆکایەتی وەرگێڕانی لە دیوانی سوڵتان حوسێن ئەلکامل پێ سپێردراوە.

لە دانراو و چاپکراوەکانی: (اصول الاخلاق) لە فەرەنسی وەرگێڕاوە، وە (مبادىء التعاون). هەروەها شیعریشی نووسیوەو زمانی فەرەنسی و تورکیشی رەوان بووە. لە ساڵی (١٩٢٤ز) لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە[٢٣٢].

**دكتور حسن ظاظا ( ١٩١٩- ١٩٩٩ز):**



( د. حسن ظاظا)

دكتۆر حەسەن محەمەد تۆفیق (زازا)، (ئەگەرچی نووسراوە ظاظا، بەڵام مەبەست لە زازایە و ئەو ناسناوەشی هەر لەوانەوە بۆ هاتووە، میسریەکان پیتی (ز) قورس دەکەن و دەیکەن بە (ظ) - و): لە زانا و بیرمەند و ئەدیبە بەرزەکانی میسر و جیهانی عەرەبییە. بەشدارییەکی زۆر گەورەی هەبووە لە بوارەکانی زمان، مێژوو، کۆمەڵایەتی و ئەدەبی، جا بە نووسینی کتێب بووبێ، یان بە نووسینی رۆژنامەوانی، وەیان بەو وانانەی لە کۆڕ و سمینارەکاندا پێشکەشی کردوون. زانایەکی زۆر گەورە بوو لە زمانی عەرەبی و زمانە سامییە کۆنەکان. رەچەڵەکەکەی دەگەڕێتەوە سەر هۆزێکی کورد، کە لە رۆژهەڵاتی تورکیا نیشتەجێن، هەندێك لە خێزانەکانی ئەو هۆزە هاتوونەتە میسر. خێزانی ئەمان لە شاری (منوف) نیشتەجێ بوونە، ئێستا پارێزگای منوفیەیە. باپیری ئەو (لە باوکیەوە) بەڕێوەبەری پۆلیس بووە لەوێ. باوکەکەیشی لە منوف لەدایك بووە، لە قوتابخانەیەکی فەرەنسی خوێندوویەتی، دواتر بۆ تەواوکردنی خوێندنی قۆناغی دواناوەندی چۆتە ئینگلتەرا و لە زانکۆی لەندەن خوێندوویەتی، کە گەڕاوەتەوە میسر کاری نواندنی کردووە، لە ساڵی (١٩٣١ز) کۆچی دوایی کردووە.

هەرچی دکتۆر حەسەن زازا یە لە ساڵی (١٩١٩ز) لە قاهیرە لەدایك بووە. سەرەتا لە کتێبەکانەوە فێری خوێندەواری بووە، دواتر چۆتە قەتابخانەی (مبشرین)ی ئینگلیزەکان. دوای دوو ساڵ خوێندن لێی دەرچووە. پاشان چۆتە

قوتابخانەی دواناوەندی لە ناوچەی کۆشکی نیل، لەوێش وەك چواردەمین کەس لەسەر ئاستی هەموو میسر دەرچووە. سەرەتا دەستی کردووە بەکاری وەرگێڕان بۆ ڕۆژنامەی (البلاغ)ی سەر بە حزبی ئەحراری دەستووری. لە کاتی ئەو کارەیدا چۆتە کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی فوادی یەکەم (ئێستا زانکۆی قاهیرەیە)، ساڵی (١٩٤١ز) بە پلەی یەکەم و پلەی شەرەف بڕوانامە٬ی زمانی عەرەبی و زمانە سامییەکانی وەرگرتووە. ماوەی ساڵێك لە قوتابخانەی دواناوەندی سەر بە باوکانی یەسوعی وانەی داونەتەوە. دواتر لە ساڵی (١٩٤٢ز) کراوەتە موعید لە زانکۆی فاروقی یەکەم (ئێستا زانکۆی "عین الشمس"ە). پاشان نێردراوەتە زانکۆی عیبری لە قودس، لەوێش بڕوانامەی ماجستێری لە ئەدەبی عیبری و بیری یەهود لە ساڵی (١٩٤٤ز) وەرگرتووە. ئینجا گەڕاوەتەوە میسر و لە زانکۆی فاروقی یەکەم بۆتە مامۆستای زمانی عەرەبی و سریانی. پاشان نێردراوەتە فەڕەنسا و زمانی فەڕەنسی خوێندووە. دبلۆمی باڵای دەوڵەتی لە بواری شوێنەوار و مێژووی هونەری لە ساڵی (١٩٥١ز) وەرگرتووە. لە پەیمانگای خوێندنی باڵا لە سوربۆن، مێژووی زمانەکان و مێژووی ئایینەکانی خوێندووە و ساڵی (١٩٥٣ز) لەسەر نامەی دکتۆراکەی بەناونیشانی (سوێندخواردن لەلایەن یەهودییە سامییە کۆنەکانەوە)، لە زانکۆی سوربۆن دکتۆرای وەرگرتووە.

گەڕاوەتەوە میسر و بۆتە مامۆستای کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی ئەسکەندەرییە، پۆستە ئەکادیمیەکانی بڕیون تا لە ساڵی (١٩٦٩ز) پلەی مامۆستای لە زانستە زمانەوانییەکانی دراوەتێ. لەو پۆستەدا ماوەتەوە تا لە ساڵی (١٩٧٩ز) خانەنشین کراوە. لەوماوەیەدا لە چەندین زانکۆ وەك مامۆستا وانەی داونەتەوە وەك زانکۆکانی : قاهیرە، ئەزهەر، عەین ئەلشەمس لە میسر، زانکۆی محەمەد ئەلخامس لە ربات، زانکۆی بەیروت، زانکۆی موسڵ و بەغدا و بەسرە لە عێراق، زانکۆی ئوم درمان لە سودان. ماوەی ساڵێکیش لە زانکۆی وەلی عەهدی

بەریتانیا لە ماڵتا مامۆستا بووە و بە زمانی ئینگلیزی وانەی گوتوونەتەوە.
پاشان بۆ ماوەی ١٢ ساڵ، لە ساڵانی نێوان (١٩٧٨– ١٩٩٠ن) بۆتە مامۆستا لە فیقهی زمان و خوێندنی عیبری لە زانکۆی مەلیك سعود لە ریاز. پاشان بۆتە راوێژکار لە سەنتەری مەلیك فەیسەڵ بۆ توێژینەوەو خوێندنی ئیسلامی، تا لە رۆژی هەینی (٩ی نیسانی ١٩٩٩ن) لە تەمەنی هەشتا ساڵی کۆچی دوایی کردووە.
چەندین کتێبی چاپکراو و وتار و وانە، شیعر و زەجەلی هەن (زەجەل جۆرێك لە هۆنراوەیە–ی) ، دوو بەرنامەی رادیۆییشی هەبوونە بەناوی ( لە دڵی ئیسرائیل) و (باشترینی وتەکان).
لە دانراو و چاپکراوەکانی :"اللسان و الانسان– ١٩٩٠"، دەروازەیەکە بۆ ناسینی زمان. "الساميون و لغاتهم– ١٩٩٠"، "كلام العرب في اللغويات العامة و السامية– ١٩٩٠"، "الفكر الديني اليهودي– ١٩٩٥"، " الشخصية الاسرائيلية– ١٩٩٠"، "ابحاث في الفكر اليهودي–١٩٨٧"، "الصهيونية العالمية و اسرائيل– ١٩٧١" بە هاوبەشی لەگەڵ (د. فتح الله الخطيب) و (د. عائشة الراتب) نووسیویەتی. "منهج سيبويه في النحو العبري بين يهود الاندلس"، "ديوان شعر سيرة البهلول" کە هەژدە سروود و نزیکەی ٥٠٠ بەیتی شیعرە. "القدس"، کتێبێکیش بە زمانی عیبری بە ناوی " اثر الفكر الاسلامي في الفكر العبري في اسبانيا الاسلامية" ، لە راستیدا ئەو کتێبە نامەی ماجستێری بووە و ساڵی ( ١٩٤٤ن) پێشکەشی زانکۆی عیبری کردووە لە قودس. لە کتێبە دەستنووسەکانیشی "كتاب عام عن تاريخ اليهود" کە دە بەرگە، "العرب على المائدة"، " الحيوان في التوراة"، "فلسفة الفن و تاريخه". هەروەها دەیان وتاری ئەدەبی و مێژوویی لە کۆواری (الفيصل) و رۆژنامەی (الرياض)ی سعودی بڵاوکردوونەتەوە، بەشداری کۆڕ و بووە و سمیناری گرێداون و ئێوارە شیعری پێشکەش کردوون [٢٣٣].

## دكتورة سهير القلماوي[٢٣٤] (١٩١١- ١٩٩٧ز):


(د. سهير القلماوي)

دکتۆرە سەهیر ئەلقەلەماوی، لە (٢٠ی تەمموزی ١٩١١ز) لە تەنتا لە باوکێکی کورد (کە پزیشك بووە لە تەنتا) و دایکێکی چەرکەسی لەدایك بووە. بەکەلۆریای لە (کۆلێژی کچانی ئەمریکی) وەرگرتووە. خاوەنی قوتابخانەیەکی زانستی بووە و زیاتر لە سەد توێژەری کچ و کوڕ بڕوانامەی ماجستێر و دکتۆرایان لەسەر دەستی ئەو وەرگرتووە. یەکێك بووە لە سێ پێشەنگەکانی ئافرەتانی میسری (لەگەڵ ئامینە سەعید و عائشە راتب) کە ساڵی (١٩٢٩ز) بۆ یەکەمجار چوونەتە زانکۆی میسر.

یەکەم ئافرەتێکیش بووە بڕوانامەی دکتۆرای لە ئاداب وەرگرتووە. یەکەم خاتوونیش بووە کورسی مامۆستایەتی مسۆگەر کردووە و یەکەم ئافرەتێکیش بووە سەرۆکایەتی بەشی زمانی عەرەبی لە کۆلێژی ئاداب وەرگرتووە و یەکەم ئافرەتیش بووە خەڵاتی رێزلێنانی دەوڵەتی لە ئاداب پێ بەخشراوە.
ساڵی (١٩٢٩ز) چۆتە کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی مەلیك فوادی یەکەم (قاهیرەی ئێستا)، کە عەمیدەکەی تەها حوسێن بووەو بەشی زمانی عەرەبی بۆ هەڵبژاردووە، کە خۆی سەرۆکی بەشەکە بووە، زۆر باشیش چاودێری کردووە، چونکە ئەو تاکە کچ بووە لە نێوان ١٤ قەتابی بەشەکەی. لە کاتێکدا ئەو هێشتا لە ساڵی سێیەمی خوێندنیدا بووە کە لە (الرسالة) و (الثقافة) و (ابوللو)ی نووسیوە. ساڵی (١٩٣٣ز) لیسانسی وەرگرتووە.
یەکەم ئافرەتی میسری بووە لە ساڵی (١٩٣٧ز) ماجستێری وەرگرتووە لەسەر

نامەکەی بەناوی (ادب الخوارج في العصر الاموي). پاشان لە ساڵی (١٩٤١ن) دکتۆرای لە ئاداب وەرگرتووە لە زانکۆی سوربۆن لەسەر نامە بەپێزەکەی بەناوی (الف ليله و ليله). سەرپەرشتی دەستەی نووسەرانی کردووە، یەکەم پیشانگای دەولی بۆ کتێبی لە ساڵی (١٩٦٩ن) لە قاهیرە کردۆتەوە، لە بواری کاری سیاسیشدا لە ساڵی (١٩٥٩ن) بۆ کۆنگرەی نەتەوە هەڵبژێردراوە. ساڵی (١٩٧٩ن) بۆ کۆنگرەی گەل هەڵبژێردراوە. لەبەر ئەوەی ئەو یەکەمجار پیشانگای دەولی کتێبی لە ساڵی (١٩٦٩ن) کردۆتەوە، لە ساڵیادی چلەمینیدا یەکێك لە تەوەرە سەرەکییەکانی ئەو پیشانگا دەولییە ئاهەنگێك بوو بۆ یادی سەهیر قەلەماوی و تیاشیدا گفتوگۆ لەسەر بەرهەمەکانی و رۆڵی ئەو لە بزاوتی فکری و رۆشنبیری عەرەبی کرا.

لە سمینارێك بۆ ئەم مەبەستە سازکرابوو، (د.شمس الدين حجاج)ی قوتابییەکەی خۆی و (د. عمر خشاب)ی نەوەی خۆی، هەروەها (د. جابر عصفور)ی قوتابییەکەی، کە سمینارەکەی بەڕێوەدەبرد، بابەتی پێشکەش کرد و گوتی: "لەلایەنە گرنگ و نادیارەکانی ژیانی قەلەماوی ئەوەیە، کە ئەو شیعری نووسیون و لە کۆواری (ابوللو)ی بە ئیمزای خاتوو سەهیر بڵاویکردوونەتەوە. هەروەها چیرۆکیشی نووسیون، بەڵام دواتر چۆتە سەر رەخنە". هەروەها باسی لە هەڵوێستی ئەو کردووە بۆ پشتگیری لە شیعری ئازاد، لە کاتێکدا کە عەقاد زۆر دژایەتی کردووە. لە هەمان سمیناردا سەبارەت بە کتێبەکەی ئەو بەناوی "المحاكاة" دەڵێت (یەکێکە لە گرنگترین ئەو کتێبانەی کە ئەوکات چاپ کراون). سەهیر قەڵەماوی لە (٤ی ئایاری ساڵی ١٩٩٧ن) کۆچی دوایی کردووە.[٢٣٥]

## شيخ عبدالباسط عبدالصمد:

شێخ عەبدولباست محەمەد عەبدولسەمەد لە ساڵی (١٩٢٧ن) لە شاری (ارمنت) سەر بە پارێزگای قنا لە میسر لەدایك بووە. رەچەڵەکەشی دەگەڕێتەوە سەر

کوردەکانی کوردستانی عێراق. باوکی لە کوردستانی عێراقەوە هاتۆتە میسر و ژنێکی میسری هێناوەو شێخ عەبدولباستی لێ بووە.

هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە دە ساڵان کە تەواوی قورئانی لەبەر کردووە. پاشان (حەوت شێوازەکانی خوێندنەوە)ی خوێندووە، هەمیشە مامۆستاکەی لەگەڵ خۆی دەیبردە بۆنە و ئاهەنگەکان، لە کاتێکدا هێشتا تەمەنی چواردە ساڵی تەواو نەکردبوو، ئەویش بەهۆی ئەو دەنگە خۆش و لەرینەوە بەهێزانەی، کە دەلالەتیان لە پێگەیشتوویی ئەو دەکرد لەو تەمەنە زووەوە وەك قورئانخوێنێکی بەتوانا.

خاوەنی (معجم تتمة الاعلام) دەربارەیدا ئەودا دەڵێت: "خودا دەنگ و سەدا و ئەدایەکی هێندە خۆشی پێ بەخشیوە وەسف ناکرێ". بۆ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز لە مزگەوت و سەنتەرە ئیسلامییەکاندا زۆر دەچووە وڵاتان، بە تایبەتی لە مانگی رەمەزاندا. ئەوەی لێی زانراوە ئەوەیە، کە ئەو وەك شێخی قورئانخوێنانی میسری ناسراوە، هەروەها سەرۆکی سەندیکای خوێندنەوە و لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز بووە لە میسر، وە لە بەناوبانگترین قورئانخوێنانی جیهانی عەرەبی و ئیسلامی بووە لە سەدەی بیست.


(شيخ عبدالباسط)

هەروەها پێشەنگی قورئانخوێنان بووە لە رادیۆ و تەلەڤزیۆن، زیاتر لە (٥٣ ساڵ) قورئانی خوێندۆتەوە، چەندین مەدالیا و خەلاتیشی لەلایەن مەلیك و سەرۆکەکانی دونیا پێ بەخشراوە.

ساڵی (١٩٥١ز) داوای پێشکەش بە رادیۆ کردووەو ئەوانیش

وەریانگرتووە، لەگەڵ یەکەم خوێندنەوەدا بەبۆنەی کردنەوەی مزگەوتی پۆرسەعید، ناوبانگی دەرکرد و بوو بە یەکێك لە پێشەنگە قورئانخوێنە هەرە باشەکانی رادیۆ. تا ئێستاش ئێوارەی هەموو شەممەیەك دەنگی ئەو لە رادیۆ لێ دەدەن. ناوبانگەکەشی لەنێو سەرجەم رادیۆکانی جیهانی ئیسلامی بڵاوبووەوە. رۆڵێکی بەرچاویشی بینیوە لە دامەزراندنی سەندیکای حافز قورئانانی پیرۆز.

لە رۆژی چوارشەممە (٣٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨ز) کۆچی دوایی کردووە، دوای ئەوەی دەیان جار هەموو قورئانی بە هەر حەوت شێوازە دروستەکەی خوێندنەوە بۆ تێکڕای وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی و جیهانی تۆمار کردووە. ئەویش لەرێی ئەو گەشت و سەردانانەی، کە لە سەد سەردان تێپەڕیوە بۆ سەرلپای جیهان. ئیمرۆ هیچ موسڵمانێك نییە بە دەنگە خۆشەکەی ئەو ئاشنا نەبێت و وەك بەیداخێکی بەرز لە ئاسمانی جیهانی ئیسلامی دەشەکێتەوە. رەحمەتی فراوانی خوا برژێتە سەری، لە پای ئەو خزمەتە گەورەیەی بە قورئانی پیرۆز و ئایینی ئیسلامی کردووە [٢٣٦].

### بەشداری کوردەکانی میسر لە بواری هونەری :

لەلایەنی هونەریشدا، ئەو کوردانەی لە میسر جێگیر ببوون، لە بواری نواندن و مۆسیقا و دەرهێنان و هونەری شێوەکاری بە توانا و شارەزا بوون. لە بواری دەرهێنانی فیلمی سینەمایی، دەرهێنەری گەورەی سینەمایی (احمد بدرخان و علی بدرخان)ی کوڕی، چەندین فیلمیان دەرهێناوە، وەك :"الكرنك" و "شفيقة و متولي" و "اهل القمة" و "الحب الذي كان"، لەگەڵ زۆر کاری دیکە، کە گەواهی داهێنیان دەکات. وە لەو کارانەی کە لەگەڵ نووسەری گەورە (نجيب محفوظ) کردوونی، کاریگەری زۆری هەبوو بۆ ناودەرکردنی وەك دەرهێنەر، ئەویش بەهۆی ئەو ناوبانگە مەزنەی کە نووسەر نەجیب مەحفوز هەیبووە.

هەرچی لە بواری نواندنی سینەماییدایە، ئەوا سەندرێلای شاشەی عەرەبی،

هونەرمەند (سعاد حسنی) کورد بووەو کچی خۆشنووس محەمەد حوسنی ئەمین بابا (بابان)ەو لە (٢٦ی کانوونی دووەمی ١٩٤٣ز) لە گەڕەکی بولاق لە قاهیرە لەدایك بووە. باوکی لە سوریەوە چۆتە میسر، بەهۆی ئەو خۆشنووسی و هونەرە جوانەی خۆیەوە


(سعاد حسنی)

توانیویەتی لە نووسینەوەی (خەت) لە میسر سەرکەوتن بەدەست بێنێ. کاتێکیش لە کۆشکی مەلەکی لە سعودیە کاری کردووە، هەڵساوە بە خۆشنووسی و زەخرەفەکردنی بەرگی کەعبەی پیرۆز. دواتر چۆتە میسر و سەرۆك جەمال عەبدولناسر لە ساڵی (١٩٦٥ز) رەگەزنامەی میسری داوەتە سوعادی کچی. هەر ئەو محەمەد بابایە کوڕی گۆرانیبێژی گەورەی سوری حوسنی بابای برای ئەنوەر بابای ئەکتەری کۆمێدییە، کە لە ئێزگەکانی لوبنان بە رۆڵگێڕانی کەسایەتی ئافرەت ناسراوە، ئەویش کەسایەتی (ام کامل)ە. دەگوترێ شاعیر و هونەرمەند (عبدالرحمن خمیسی) لە شەستەکاندا تواناکانی سوعاد حوسنی ئاشکرا کردووە، کاتێك کە رۆڵی (ئۆفیلیا)ی خۆشەویستی (هاملێت)ی لە شانۆگەرییەکی شکسپیر بینیوە.

کاری هونەری سوعاد حوسنی لە کاتی بینینی رۆڵ لە فیلمی (حسن و نعیمة) لە ساڵی (١٩٥٨ ز) دەستی پێکرد و لە دەرهێنانی (برکات) بوو. لەو ماوەیەدا شان بە شان ئەکتەرە هەرە بەناوبانگەکانی میسر دەیان فیلمی سینەمایی و تەلەفزیۆنی پێشکەش بە شاشەی عەرەبی کردوون. رۆڵەکانی ئەو پەیوەست بوون بە نووسین و کاری گەورە نووسەرەکان. رۆڵی بینیوە لە رۆمانی (الحب الضائع)ی (طه حسین). هەروەها لە (بئر الحرمان)ی (احسان عبدالقدوس). وە لە (نادیە)ی (یوسف سباعی)، وە لە (قاهره) و (الکرنك)ی (نجیب محفوظ)،

هەروەها کاری بەپێزی بۆ (کامل شناوی، احمد رجب، احمد رشدی) و چەندانی دی ئەنجام داوە. بۆیە لەڕێی نواندن و گۆرانییەوە ناوبانگی زۆری دەرکردووە. شووی بە چەند کەسێك کردووە، لەوانە دەرهێنەر عەلی بەدرخان بۆ ماوەی (١١ ساڵ) ، وە لەکاتی سەردانمان بۆ لای ئەو، کوردبوونی رەچەڵەکی سوعاد حوسنی دووپات کردەوە. ساڵی (٢٠٠١ز) بە شێوازێکی تەماوی و نادیار لە لەندەن کۆچی دوایی کرد.[٢٣٧]



(تابلۆی محمد سیف الدین وانلی)

لە بواری هونەری تەشکیلیشدا، دوو هونەرمەندی بەناوبانگی کورد هەن کە ئەوانیش (ادهم و محمد سیف الدین وانلی) ین، کە کوردی شاری وانی کوردستانی تورکیان. محەمەد سەیفەددین وانلی لە خێزانێکی بارخۆشی ئەدەب دۆست و هونەر دۆست لە ساڵی (١٩٠٦ز) لەدایك بووە. لە ماڵێکدا پەروەردە بوو، کە چەندین شاعیر و ئەدیب هاموشۆیان دەکرد، وەك ئەحمەد شەوقی و عەبدە حامولی و چەندانی تر. ئەو لە کۆڕی ئەو ئەدیبانە دادەنیشت و گوێبیستی شیعر و گفتوگۆکانیان دەبوو لە بواری ئەدەبی و سیاسی و کۆمەڵایەتی. لە ماڵەکەشیاندا کتێبخانەیەکی زۆر گەورە و پڕ لە کتێبی ئەدەبی و شیعر هەبوو. ئەمە وای لێکرد کە بە قووڵی رووبچێتە نێو خوێندنەوە. جگە لەو تابلۆیانەی لە ماڵەکەیاندا هەڵواسرابوون، کە هی گەورە هونەرمەندانی جیهانی بوون. بەرامبەریان رادەوەستا و لێیان ورد دەبووەوە تا تێیانبگات. بۆیە خۆی بۆ هونەر یەکلایی کردەوە، لەگەڵیشیدا ئەدهەمی برای بەشداری لەگەڵدا کرد. چەندین تابلۆی هونەری دروست کردن، کە داهێنانی زۆر گەورەی تێدا کردوون،

هەربۆیە ناویان لەو شێوازەی هونەرەکەی ئەو نا "گۆرانیی تەجریدی"، (هونەری تەجریدی داماڵینی هەموو ئەوەی دەوروبەرە لە واقیع، پاشان دارشتنەوەی بە روئیایەکی هونەریی نوێ، کە هەستی هونەرمەند لە رەنگ و جووڵەو خەیاڵدا بەرجەستە دەبێ، ئەو هونەرە لە وەستان بەرامبەر بە سروشت و لێ وردبوونەوە لە چۆنیەتی پەیدابوونیەوە پوخت دەکرێتەوە- و). چەندین خەڵات و پاداشتی شایانی وەرگرتووە، پەیمانگایەك و مۆزەخانەیەکیشی بە ناوی "ئەدهەم"ی برای لە ئەسکەندەرییە کردۆتەوە و تابلۆ و وێنەکانی تێدا نمایش کردوون.

ئەو تەواوی ژیانی خۆی بە رەبەنی ژیاوە، لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنی لەگەڵ کچە قوتابییەکی خۆی بە ناوی (احسان مختار) هاوسەرگیری کردووە، کە لە هونەردا دەستی باڵای بووەو ئەویش بەرزی نرخاندووە، بەڵام محەمەد لە ساڵی (١٩٧٦ز) و بەر لەوەی منداڵیان ببێ کۆچی دوایی کردووە. کارەکانی ئەو لەگەڵ کارەکانی ئەدهەم وانلی برای نیشانەی هەرە بەرزن لە مێژووی هونەری شێوەکاری لە میسری هاوچەرخدا[٢٣٨].

هەروەها چەندین هونەرمەندی دیکەی کورد هەن لە میسر وەك "نجیب ریحاني، محمود ملیجي، احمد مظهر، عادل ادهم، صلاح سعدوني، و ...تد..".



یەکێك لە تابلۆکانی ئەدهەم

٢٠٥- محمد علي الصويركي: الكرد في بلاد مصر، ص١١٥-١١٦، نقلا عن: معجم المؤلفين: ١/١٦٦-١٦٧، الموسوعة العر: ١/٥٧٣، الاعلام: ١/١٠٠، مشاهير الكرد:٩٠/٢-٩٣، مجلة تراثنا، ع (٢٢) تشرين الاول ٢٠٠١، تاريخ الاسرة الاموية: ٨٩-٩٢، اعلام الكرد: ٧٩-٨١، معجم المطبوعات: ٦٥٢، مراءة العصر: ٢/٧٢٩، فهرست التيمورية: ٤/١٤٥، المستدرك على معجم المؤلفين:٤٠.

٢٠٦- الرسالة العونية، مصدر سابق، الموسوعة العر: ١/٥٧٤، تاريخ الاسرة التيمورية: ٩٥، الاعلام:٦/٢٢، اعلام الكرد:٨١.

٢٠٧- محمد علي الصويركي، مرجع سابق، ص نقلا عن: الاعلام:٧/١٦٥. الموسوعة العر: ١/٥٧٤. محمد تيمور لوديع فلسطين: الحياة، ع(١٢٤٧) ٦/٩/١٩٩٦. الادب العربي المعاصر لشوقي ضيف:١/٢٦٣. مجاة محمع اللغة العر:٢/٢٠٦. مجلة الادب: حزيران ١٩٧٢. حسين فوزي: الاهرام، ٣١/٨/١٩٩٣. اعلام الكرد: ٨٢-٨٣. مجلة مجمع اللغة العر بدمشق: ٥٤٢/٣٧-٤٧،٦٨١،٥٥٣-٦٨٥، ٢٠٠،٢٠١/٤٩.

٢٠٨- محمد علي الصويركي، مرجع سابق، ص نقلا عن: تاريخ الاسرة التيمورية: ٨٥. الدار المنثور:٣٠٣. بلاغة النساء: ٨٦. مشاهير الكرد: ٢/٢٣٩. معجم المطبوعات: ١٢٥٦. الاعلام:٣/٢٤٠. جريدة الدستور الاردنية: عدد ٦٢٧٢- ١/٢/١٩٨٥. نساء من بلدي:٩٨٩-٩٩٣. معجم المؤلفين:٥/٥٦. ايضاح المكنون: ١/٤٢خ. هدية العارفين:١/٢٣٦. اعلام النساء:٢/١٠٨-١٢٥. تاريخ اداب اللغة العر:٤/٢٤٨-٢٤٩.

٢٠٩- لەولنە: مامۆستا (ليمن والى)، هەروەها مامۆستا (محمود والى) رۆڵەكانى قەڵەمشا لە شارى فيوم.

٢١٠- الشيخ سلامة العزامي، ترجمةتنوير القلوب في معاملة الغيوب: محمدامين الكردي، القاهرة ١٣٨٤هـ. و كتاب نجم الدين الكردي: خلاصة كتاب المواهب السرمدية في مناقب السادة النقشبندية لمؤلفه محمدامين الكردي. وكتاب محمدامين الكردي: سعادة المبتدئين.. الشيخ عمر وجدي في كتاب: مشاهير الكرد وكردستان لمؤلفه محمدامين زكي بك، ص٣٩٤، http:taakhinews.org/?p=31690 ١٢ى كانون الثاني ٢٠١٠م.

٢١١- لەناویاندا: خاتوو (فاطمة لطفي الله الایوبي).

٢١٢- لە دیدارێکدا لەگەڵ بەڕێزیان لە ماڵەکەی خۆی لە گەڕەکی ئەندازیاران لە رۆژی ٢٣ی حوزەیرانی ٢٠١٠ز، کاتێک کە سەرداغمان کرد لە شاری کفر شکر سەر بە پارێزگای قلیو.

٢١٣- شەوقي ضيف: شوقي شاعر العصر الحديث، مكتبة الاسرة، القاهرة ٢٠١٠م، ص ٩-١٠. مشاهير الكرد وكردستان، ص٨٩-٩٠.

٢١٤- هەندێك لە توێژەران بە تورکیان داناوە نەك بە کورد، بەو پێیەی کە لە تورکیا هاتووە، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە کوردە.

٢١٥- www.gilgamish.org/viewarticle.php?id=kurdish_persons-20061118-324

٢١٦- شوقي ضيف: شوقي شاعر العصر الحديث، ص ٩-١٠. مشاهير الكرد وكردستان، ص٨٩-٩٠.

٢١٧- هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو.

٢١٨- هەردوو سەرچاوەکەی پێشوو.

٢١٩- تەماشای پێشەکی بەشی یەکەمی شەوقییات بکە.

٢٢٠- مشاهير الكرد وكردستان، ص٨٩.

٢٢١- www.mriraq.com/vb/showthread.php?t=435270٣raqi-ana.com//vb/showthread.php?p=437026

٢٢٢- شوقي ضيف: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠.

٢٢٣- بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە ئەحمەد شەوقی بڕوانە: شوقي ضيف، سەرچاوەی پێشوو.

٢٢٤- www.mriraq.com/vb/showthread.php?t=435270٣raqi-ana.com//vb/showthread.php?p=437026

٢٢٥- وەرگێڕانەکەی محەمەد عەلی عەونی بۆ "مشاهير الكرد وكردستان، ل٣٦٨. محەمەد عەلی صویرکی، سەرچاوەی پێشوو.

٢٢٦- شەرەفخانی بەدلیسی کوردی، بەڵام کتێبەکەی بە زمانی فارسی نووسیوە، چونکە زمانی رۆشنبیری ئەوکات بووە.

٢٢٧- خاوەنی چاپخانەی زانستی کوردستان بووە لە مسر.

٢٢٨- مامۆستای زمانی فارسیە لە زانکۆی ئەزهەر.

٢٢٩- وتارێکی دوورییە عەونی لە هەفتەنامەی (القاهرە) ژمارە(٢١٣) رێکەوتی ١١ی ئایاری ٢٠٠٤ز.

٢٣٠- فاضل عباس الجاف: الاديب محمود عباس العقاد عنـوان الفكـر: www.bingeh.com/news.php?action=view&id=30

٢٣١- تتمة الاعلام: ج١، ص٢٦١-٢٦٢. محمد علي الصويركي، سەرچاوەی پێشوو.

٢٣٢- الزركلي: الاعلام، ج١، ص ٣٩. محمد علي الصويركي، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٧.

٢٣٣- محمد علي الصويركي، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٩-١٢١.

٢٣٤- ئەم ناوە بە (فەتحە لەسەر سین و کەسرە لەبن یا نووسراوە و ئێمەش وەك خۆی نووسیمان سەهیر نەك سوهێر-ی)

٢٣٥- ماهر حسن: المصري اليوم، ٢٠/ ٧/ ٢٠٠٩م.

٢٣٦- محمد علي الصويركي، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢١.

٢٣٧- محمد علي الصويركي، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢١-١٢٢.

٢٣٨- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢١-١٢٢.

# بەشی حەوتەم

## گەشتە مەیدانییەکان:

گوندی ( الاکراد ) لە پارێزگای ئەسیوت
گوندی ( جزیرە الاکراد ) لە پارێزگای ئەسیوت
گوندی ( میت الاکراد ) لە پارێزگای دقهەلییە
شاری ( الکردی ) لە پارێزگای دقهەلییە
گوندی ( کفر کردی ) لە پارێزگای قلیوبییە
گوندی ( منشاە الکردی ) لە پارێزگای غەربییە
گوندی ( الکردی ) لە پارێزگای کفر شێخ

ئێمە هەڵساین بە ئەنجامدانی چەندین گەشتی مەیدانی بۆ چەند گوند و شارۆچکە و شارێکی میسر، کە ناوی کوردییان پێوەیە، ئەویش بۆ زانینی هۆکار و مێژووی ئەو ناولێنانە. دەبێ ئەوەش بگوترێ کە ئێمە هەموو شوێنەکانی میسر نەگەڕاوین، ئەمەی خوارەوە چەند شوێنێکن کە سەردانمان کردوون:

**یەکەم:**

**گوندی (الاكراد):**

گوندی (الاكراد) گوندێکی کشتوکاڵییە لە گوندەکانی سەنتەری فەتح لە پارێزگای ئەسیوت. دەکەوێتە رۆژهەڵاتی رووباری نیل. بەپێی سەرژمێری ساڵی (٢٠٠٦ز) ژمارەی دانیشتوانی (٧٠٠٠) کەسە[٢٣٩]. هەموویان موسڵمانن و لە خوێندنی ئەزهەردا شوێن و پایەیەکی بەرزیان هەیە و سەرکەوتووترن لە قوتابخانەکانی سەر بە وەزارەتی پەروەدە و زانست. هێوری و ئارامی تایبەتمەندییەکی بەرزی خەڵکی ئەوێیە و بەمە لە دراوسێکانی جیادەکرێتەوە. چونکە کاری توندوتیژی و هەڵچوون و شەڕ و ئاژاوەی تێدا زۆر کەمە. هەر گرفتێکی هەیانبێ، بە حیکمەت و هۆشمەندیی خۆیان لە ماڵی خۆیان چارەی دەکەن. زۆر بە کەمی دەچنە بەردەم دادگا، چونکە ئەنجوومەنی عورفی ناوەخۆیان زۆر گرنگە، هەروەها پایە و مەزاری ئەولیا و پیاوچاکان زۆر کاریگەری هەیە بەسەر بیرورا و میزاجی تەواوی خەڵکی گوندەکە. ئەگەرچی هەندێك بیروڕای سیاسی دیکەشیان کەوتۆتە ناو، وەك ناسرییەکان و وەفدییەکان. خەڵکی ئەو گوندە حەزیان لە خواپەرستییە بە شێوازی سۆفیگەری. خەڵکێکی باش و شکۆمەند و میواندۆستن. هەرچەندە زۆر زووش هەڵدەچن، بەڵام زوو دادەمرکێنەوەو دەگەڕێنەوە حاڵەتی هێمنیی خۆیان.

سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە دانیشتووانی ئەو گوندە لە

بنەچەکەی کوردی ڕەسەنن و لەگەڵ سوپای سەلاحەددین ئەیووبی هاتوونە، کە زۆربەی سوپاکە لە کوردان پێکهاتبووە[٢٤٠]. قسە و گێڕانەوەکانی ئەو خەڵکەش، کە ئێمە دیدارمان لەگەڵ کردن[٢٤١] یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ئەو سەرچاوە مێژووییانە، کە دوای ئەوەی سوپای سەلاحەددین توانییان قاهیرە لە فاتمییەکان پاکبکەنەوە، ئەو سوپایە ڕووی کردە سعێدی میسر بۆ ڕاوەدوونانی ئەو فاتمییانەی ڕوویان کردبووە باشوور، بۆ پاککردنەوەی میسر لێیان، کە



نەتوانن بارودۆخی خۆیان دوور لە قاهیرە ڕێکبخەنەوە لەگەڵ توران شا، کە لە ساڵی (٥٦٤ز) یەمەنی داگیر کردبوو. سەلاحەددین زۆرێك لەو کوردانەی نێو ئەو هێزەی گێڕایەوە لای خۆی، بەهۆی دڵنیا بوون لە دڵسۆزییان بۆی[٢٤٢]، بەوەی کە لە پشتی باپیرانی خۆی بوون. دوای تەواوکردنی ئەرکەکانیشیان لە سعێد و نەوبە و سودان، وە دوای گەڕانەوەیان بۆ قاهیرە، هەندێك لە سەربازانی ئەیووبی دواکەوتن و لە ناوچە جیاجیاکانی باشوور و باکووری ڕووباری نیل و زەویەکانی دەوروبەری جێگیر بوون[٢٤٣].

یەکەم جار کە لە ئەسیوت دابەزین، لە گوندێك نیشتەجێ بوون، پێی دەگوترا (الحمراء) ماوەیەك لەوێدا ژیاون، کە لە لێواری ڕووباری نیل بووە، بەلام دواتر تووشی لافاوێکی گەورە بووە، بۆیە گواستوویانەتەوە گوندی (الولیدیە)ی

دراوسێ. کاتێکیش ئەوێ تووشی لافاو هاتووە، چوونەتە شوێنێکی نوێ، کە کەس پێشتر لێی نیشتەجێ نەبووە، دوای ئاواکردنەوە ناویان لێناوە گوندی کوردان (الاکراد). خەڵکی گوندەکە دەگێڕنەوە یەکەم خێزان هاتۆتە ئەو ناوچەیەو تێیدا نیشتەجێ بووە خانەوادەی (خوتبە) بووە و مزگەوتێکیان تێدا دروست کردووە بەناوی مزگەوتی خوتبە. پاشان خێزانە کوردەکانی دیکەش روویان کردۆتە ئەو گوندە، وەك خانەوادەی (شیخ، بدهلی، جرابعە[٢٤٤]، رمحە، عمر، ریس)، ئێستاش هەندێکی تری هاتوونەتە سەر وەك :ماڵی (مكی، محمود، اسماعیل، حسن علی، حسنین، حسن یوسف). ئێستا ئەمانە هەموویان پێکەوە تەواوی گوندەکە پێکدەهێنن[٢٤٥].

**دووەم: گوندی ( جزيرة الاكراد ):**

هەرچی سەبارەت بە گوندی جەزیرەی کوردەکانە، ئەوا درێژکراوەی گوندی (الاكراد) کوردەکانە، کە کەوتۆتە ئەوبەری بەرامبەریان لەسەر لێواری رووباری نیل، لەچەند دوورگۆکەیەك پێکهاتووە وەك (عزبة الشناروني و عزبة جودة و عزبة العمدة و عزبة دياب و عزبة خلف و عزبة مسعود و عزة الكر)، کە ئەم دوورگۆکانە بەهۆی دروستکردنی بەنداوی (العالي) دروست بوونە. خەڵکێکی زۆری ئەو دوو گوندە بۆ خوێندن و کارکردن روویان کردۆتە شارە گەورەکانی قاهیرە و ئەسکەندەرییە و ئەسیوت و ئەوانی دی. زۆرترین ژمارەشیان لە گەڕەکی شبرای (روض الفرج) لە قاهیرە نیشتەجێ بوونە (ڕەوزلفەرەج یەکێکە لە گەڕەکە کۆنەکانی باکووری قاهیرە، پێشان شوێنی ئاهەنگێڕان و شانۆ بووە، بازاڕی هەرە سەرەکی سەوزەواتی قاهیرەشی لێ بووە، زۆربەی دانیشتووانەکەی خەڵکی دابەزیوی لادێکان و لاپەڕگەکانن. ئێستا کەوتۆتە گەڕەکی شبرا– لە ویکیپیدیاوە– و)، نزیکەی چوار هەزار کەس دەبن، بەپێی ئەو خەملاندنەی ئەو کۆمەڵەیە دایانمەزراندووە و ناویان ناوە " کۆمەڵەی خەیری لاوانی کورد".

**کەسایەتییە بەناوبانگەکانی ئەو گوندە:**

نووسەری گەورە "محمد بدوی"رابەری کورتە چیرۆکی میسری، ئەو لە بەناوبانگترین کەسە دیارەکانی ئەو گوندەیەو خەڵکەکە زۆر شانازی پێوە دەکەن.

- لیوا "عمر حسن عمر" پارێزگاری کفر شێخ لە پەنجاکانی سەدەی رابردوو.
- لیوا "حفظی حسن"، پێشتر پارێزگاری قاهیرە بووە.
- لیوا " عنی حفظی حسن" یاریدەدەری وەزیری بەرگری بووە، پاشان بۆتە پارێزگاری باکووری سینا.
- لیوا " عصام حفظی "، بەرپرسی پاسەوانە تایبەتییەکانی سەرۆکی کۆچکردوو ئەنوەر سادات بووە.

**سێیەم: گوندی (میت الاکراد)[٢٤٦]:**

گوندێکی کشتوکاڵی سەر بە سەنتەری شاری مەنسورەیە لە پارێزگای دقهەلیە، نزیکەی (٧کلم) لە مەنسورە و نزیکەی (١٢٠کلم) لە قاهیرە دوورە، رووبەرەکەی (١٠٠٠ ) دۆنمە، ژمارەی دانیشتووانیشی بەپێی سەرژمێری ساڵی ( ٢٠٠٦ز) نزیکەی (٧) هەزار کەسە، هەموو خەڵکەکەی لەسەر کشتوکاڵ دەژین. رێژەی نەخوێندەواریش لەو گوندە نزیکەی (٪٢٠ )ە، بە تایبەتی لەناو بەساڵاچووان.

**هۆکاری ناونانی گوندەکە بەم ناوە:**

خەڵکی گوندی (میت الاکراد) بە پێچەوانەی خەڵکی شوێنەکانی تر کە سەردانمان کردن، هیچ دەربارەی ناو و مێژووی گوندەکەیان نازانن. تەنانەت لەگەڵ بە ساڵاچووان و رۆشنبیرانیشی قسەمان کرد، هیچ زانیارییەکیان نەبوو. تاکە باسێك کە گوێمان لێ بوو ئەوەبوو کە حاجی محەمەد[٢٤٧] لە باوکی کۆچکردوویەوە "طاهر بیومي" بۆی گێراینەوە کە لە رەمەزانی (١٤٣١ك) لە

تەمەنی سەرووی سەد ساڵییەوە کۆچی کردووە، حاجی ئەحمەد (لەسەرەوە نووسراوە حاجی محەمەد-و) دەڵێت: "باوکم بۆی گێڕامەوە کە لکێك لە رووباری نیل لەلای (عزبة شوقی) لە نزیك گوندی (میت الاکراد) بە شوێنی ئێستای گونددا تێدەپەڕی، هەندێك وێستگە و ئەسکەلە لە هەموو خاڵێك هەبوون بۆ دابەزاندنی سەرنشین و کەلوپەلەکانیان. (وێستگە)ی ئەو گوندەش ناوی "مینا الاکراد" بوو، ئەویش بەهۆی بوونی چەند خێزانێکی کوردی سەردەمی دەوڵەتی ئەییوبی.



دواتر ناوەکە بەپێی بەکارهێنانی باو، گۆڕانی بەسەردا هاتووەو بۆتە گوندی "میت الاکراد".

حاجی ئەحمەد لەسەر قسەکانی باوکی بەردەوام دەبێ، کە گوتوویەتی: هەموو زەویەکانی گوند و دەوروبەری گوندیش موڵکی ئافرەتێکی کورد بووە بە ناوی " زینب هانم"، کە لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانی ئەو موڵکانەیان پێ داون. چونکە ئەو قسەڕۆیشتوو بووە لە ناو دەوڵەت. ئەو خەڵکانەی بهاتبانە لای نەدەچوونە ناو خزمەتی جیهادی و خۆبەخشی، بۆیە خەڵکێکی زۆر روویان تێکردووە و ئەویش زیاتر لەلای خەڵکەکە خۆشەویست بووە. تەنانەت سنووری زەوی و موڵکەکانی گەیشتۆتە گوندەکانی "تلبانە و زریقي و شاوا و وکوم الدربي و کفر البرمون و الزمار"، هەتا ئەمڕۆش ئەمانە لە بەڵگەنامە فەرمییەکاندا لەسەر ناوی ئەو نووسراون.

## چوارەم: شاری (الكردی) و (كفر الكردی) لە پارێزگای دقهەلییە:

شاری (الكردی)، یەکێکە لە شارۆچکەکانی پارێزگای دقهەلییە. (٤٥کلم) لە مەنسورە و (١٨٠کلم) لە قاهیرە دوورە. رووبەرەکەی (١٢کلم٢) و بەپێی دوا سەرژمێری، ساڵی (٢٠٠١ز) ژمارەی دانیشتووانی (٥٠ هەزار) کەسە. تێکرای

خەڵکەکە لەسەر کشتوکاڵ دەژین، کە ڕێژەی (٪٩٥)ی خەڵك تێیدا کار دەکەن. ڕووبەری کشتوکاڵیشی (٧ هەزار) دۆنمە و گەورەترین ڕووبەری موڵکی تاکەکەس لە شارەکە (١٠٠ ) دۆنمە. بەناوبانگترین بەرووبوومە کشتوکاڵییەکانیشی بریتین لە: پیواز، پەتاتە، سیر، برنج، گەنم، پاقلە، وێنجە، گەنمەشامی، مۆز، پرتەقاڵ، لیمۆ. بەناوبانگترین خانەوادەکانیشی کە (٪٦٠)ی کوردی ڕەسەن و (٪٤٠ ) یان خەڵکی هاتوون، بریتین لە: (ال عید، ابو حسین، ابو عمیرة، عامر، تومە، حسنین)ن، بەڵام خێزانە بنەڕەتیەکان بریتین لە (ال عید، تومە، ابو حسین)، ڕێژەی خوێندەواری تیایاندا زۆر بەرزە، ئەوانەی کە بڕوانامەی باڵایان هەیە بە ( ٪٨٠ ) دەخەمڵێنرێن. ڕێژەی نەخوێندەواریش تێیدا ( ٪٥)ە. لە شاری کوردی چەند شوێنەوارێك هەن مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ڕۆمانی، بۆیە گەشتیاران ڕووی تێ دەکەن، ئەو شوێنەوارانەش بریتین لە (تل البلاصون، تل سرور، تل الحمرات، تل الحسنیین).

**مێژووی دروستبوونی:**

مێژووی ئەو شارە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەیوبی. دوای سەرکەوتنی سەلاحەددین لە شەڕی حەتتین بەسەر خاچپەرستان، سەربازە بەشداربووەکانی شەڕەکەی خەلات کردوون و پارچە زەوی لە شوێنە جیاجیاکانی میسر پێ بەخشیون، تیاشیاندا ئەو ناوچەیە. بۆیە ئەو ناوچەیە بۆتە بەشی چەند سەربازێکی ناو سوپاکەی سەلاحەددین. خاکەکەی زۆر بە پیت بووە و نزیکیش بووە لە دەریاچەی (المنزلة)، کە لە (منشیة عاصم) درێژ دەبووەوە، کە (٢کلم) لە شاری کوردی دوورە و سەربازە کوردەکان لەگەڵ خێزانەکانیان تێیدا نیشتەجێ بوونە. پاشان بەهۆی ژنخوازی و هاوسەرگیری ژمارەیان گەیشتۆتە (٥٠) خێزان. بەڵام جێی داخە خەڵکەکە پارێزگاریان لە

ناو و ناسناوی خێزانە کوردەکان نەکردووە و ناویان لەبیر چۆتەوە. دواتر ناو و ناسناوی عەرەبی میسرییان تێدا دەرکەوتووە.




تابلۆی شارۆچکەی الكردى

بەڵام بەهۆی زۆرینەی کورد لەو ناوچەیە، شارەکە بەناوی شاری کوردی (الكردى) ناوی دەرکردووە.

سەرەتا تەنها گوندێك بووە بەناوی (الكردى)، دواتر بووە بە دوو گوند، یەکەمیان (الكردى) و دووەمیشیان (كفر الكردى). سەبارەت بە دابەشبوونی گوندەکەش، مامۆستا ئەحمەد عید[٢٤٨] دەڵێت: "لە سەردەمی محەمەد عەلی پاشا گوندەکە کوێخایەکی هەبوو زۆر توندوتیژ بوو لەگەڵ خەڵکەکە، بە تایبەتی لەسەر ئەو ناوچەیەی کە کەوتبووە سەر لێوارەکەی تری دەریاچە بچووکەکە. بۆیە ئەوان تەنگاوییان بۆ هاتووەو ناچار خۆیان لە گوندەکە کێشاوەتەوە و ناویان لە شوێنەکەی خۆیان ناوە (كفر الكردى) و کوێخایەکیشیان بۆ داناوە. بەمشێوەیە گوندەکە بووەتە دوو گوند و دەریاچەیەکی بچووك لێکی جیاکردوونەتەوە.

## لە کەسایەتییە بەناوبانگەکانی ئەو شارۆچکەیە:

خەڵکی شارۆچکەی کوردی بەوە ناسراون، کە زۆربەی گەنجەکانی چوونەتە نێو سلکی سوپا و پۆلیس، زیاتر لە (٢٠٠) ئەفسەریان هەیە. هەندێك لەو کەسایەتییە ناسراوانەشی ئەمانەن:

- لیوا (علی محرز حسانین)، دوا پلەی ئەمینداری گشتی ئەنجوومەنی وەزیرانی پێشوو بووە.
- لیوا (احمد الدرديري بن حسانين)، دوا کاریشی: یەکێك بووە لە

دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی خەیری ئیسلامی لە شارۆچکەی کوردی.

- لیوا (دکتور محمد فتحي عيد)، دوا پلەکانی: یاریدەدەری وەزیری ناوەخۆ، سەرۆکی نەهێشتنی هۆشبەرەکان، وە دکتۆر بووە لە زانکۆی ئەمیر نایفی سەربازی.

- لیوا (احمد الدرديري الحنفي)، دوا پلەی: یاریدەدەری وەزیری ناوەخۆ بووە.

- لیوا (طارق عميرة)، دوا پلەکانی: یاریدەدەری وەزیری ناوەخۆ، و سەرۆکی یانەی (التجديف) بووە.

- لیوا (محمد فهمي عيد)، دوا پلەی: فەرماندەی پاسەوانان بووە لە ئەزهەری شەریف.

- لیوا (فوزي محمد عيد)، دوا پلەکانی: یاریدەدەری یەکەمی وەزیری ناوەخۆ و بەڕێوەبەری پۆلیسی فریاکەوتن بووە.

- لیوا (حسن محمد عيد)، دوا پلەی: فەرماندەی پاسەوانانی زانکۆی (قناة السويس) بووە.

- لیوا (محمد محمود عيد)، باوکی رۆحی پۆلیسی شارۆچکەی کوردی بووە و لە خۆبەخشە یەکەمەکان بووە.

- لیوا (عبدالحفيظ شتا) لە یەکەمەکانی ئەو کەسانە بووە کە چوونەتە ناو پۆلیسی لاسلکی لە میسر.

- مامۆستا و دکتۆر (ابراهيم الحنفي)، یەکێك لە گەورەترین مامۆستایانی بواری گەردوون بووە لە جیهان، چەندین پلەشی لە ئاژانسی گەردوونی ئەمریکی وەرگرتوون. خوالێخۆشبوو (الحاج بن محمود عيد)، رابەری رێکخراو و حزبەکانی شاری کوردی یە.

- (محمود عيد) ئەندامی پێشووی ئەنجومەنی گەل، وە دامەزرێنەری کۆمەڵەی خەیری ئیسلامی لە شاری کوردی.

- دکتۆر (محمد عبدالحليم عميرة)، جێگری یەکەمی وەزیری تەندروستی.

- (الشيخ محرز حسن سلامة)، ئەندامی لێژنەی فتوا لە ئەزهەری شەریف.
- دکتۆر (احمد رضا شتا)، دوا پلەی: راوێژکاری راگەیاندنی ئەنجوومەنی شورا.
- مامۆستا (احمد محمد عید)، یەکێك لە دامەزرێنەرانی شاری هاوچەرخ و پێشکەوتووی کوردی.
- دکتۆر (جبر عبدالسلام جبر)، مامۆستا لە ئەندازەی کارەبایی، بەرپرسیاری وێستگەی رووناکی هەردوو حەرەمی شەریفی وەرگرتووە لە سعودیە.

## پێنجەم: گوندی (کفر کردی):

گوندێکی کشتوکاڵی سەر بە سەنتەری (کفر شکر)ە لە پارێزگای قلیو. (٧کلم و نیو) لە شاری (بنها) و (٦٦کلم) لە قاهیرە دوورە. تێکڕای دانیشتووانی لەسەر چاندنی پرتەقاڵ و بەرهەمی دانەوێڵەی وەك گەنم و گەنمەشامی دەژین، رووبەرەکەی (٤٠٠ ) دۆنمە. بەناوبانگترین خێزانەکانی بریتین لە خێزانی (کردی) و خێزانی (عابدین). کە نزیکەی (٪٥٠)ی خەڵکەکەی پێکدێنن، لەچاو خەڵکەکەی تری گوند دەوڵەمەند و ساماندارن.

### هۆی ناونانی گوندەکە بەم ناوە:

بەپێی گوتەی زۆربەی ئەو بەساڵاچوو و رۆشنبیرانەی[٢٤٩] دیدارمان لەگەڵ کردن ئەوە رادەگەیەنن، کە هۆی ناونانەکە دەگەڕێتەوە بۆ دوو پیاوی کورد (دڵنیا نەبوون کە خەڵکی کام ناوچەی کوردی بوونە)، بەر لە (٢٠٠ ) ساڵ هاتوونەتە ئێرە، یەکیان پێیدەگوترا "کورد" و ئەوەی دیکەیان پێی گوتراوە "عابدین"، کاری ئەم دوو کەسە بازرگانیکردنی خوێ بووە لە گوند و ناوچەکانی لێواری لکی دمیات. جارێکیان، کە خەریکی بازرگانی بوونە لەسەر لێواری لکی دمیات، بۆ پشوودان و حەسانەوە لە گوندێك ماونەتەوە بەناوی " کفر علی شرف الدین"[٢٥٠] و بە میوانی لای کوێخای گوند (علی شرف الدین) ماونەتەوە.

کاتێك ئەوان لە میوانداری کوێخا دابوونە، کۆمەڵێك خەڵکی شەڕانگێز هاتوونەتە ئەوێ، کوێخاش لە حاڵەتی ترسێکی زۆردا بووە، هیچی بۆ نەماوەتە ئەوە نەبێ بەبێ دەنگی سەرانە و بەرتیلیان بداتێ. ئەو هەڵوێستە سەرنجی کورد و عابدینی راکێشاوەو سەبارەت بەمە لە کوێخایان پرسیوە، کوێخاش وەڵامی داونەتەوە، کە ئەوانە پیاوی ستەمکار و زۆردارن، هەرکەسێکیان لە گوندەکان مەبەست بێ ناچاری دەکەن و سەرانەی بەسەردا دەسەپێنن، کەسیش ناتوانێ داواکەیان رەت بکاتەوە، دەنا دەیکوژن. بۆیە هەریەکە لە کورد و عابدین پێشنیار بۆ کوێخا دەکەن کە ناوچەکە لەمانە رزگار بکەن. کوێخاش بە پێشنیارەکەیان رازی دەبێ. بۆیە کورد و عابدین سەرکەوتوو دەبن لە کوشتن و لەناوبردنی ئەو زۆردارانە و رزگارکردنی ناوچەکە لێیان. هەندێك دەڵێن کە کوێخا "علی شرف الدین" بە گیان لە کورد و عابدین دەترسێ، بۆیە بڕیار دەدا لەخۆیان نزیك بکاتەوە و بیانکاتە لاگیری خۆی. بۆیە دوو لە کچەکانی خۆی لێیان مارە دەکات و دەیانکاتە زاوای خۆی، تا بە هۆی ئەوانەوە دڵنیا ببێ لێیان. ئەم دوو پیاوە (کورد و عابدین) کاری بازرگانییان دەگۆڕن بە چاندنی گەنمەشامی و ئەوان سەرچاوەی ئەو دوو خێزانە گەورەی ئێستای گوندی (کفر کردی)ین.

لە کاتی پرسیارمان لە هەندێك لەوانەی سەر بە خێزانی کورد و عابدینن، دەربارەی ئەوەی داخۆ چەندە گرنگی بە هەواڵەکانی ئێستای کەرد و کوردستان ەدەن، لە وەڵامدا گوتیان:" ئێستا ئێمە بووینەتە میسریی تەواو، بۆیە گرنگیدانمان بە پلەی یەکەم بۆ نیشتمانەکەمانە. پاشان کێشەکانی عەرەبی و ئیسلامی. بەڵام هەندێکیان نەیانشاردەوە کە کاتێك کورد دەسکەوتێکی سیاسی بەدەست دێنێ، ئەوان پێی ئاسوودە دەبن.

## له کەسایەتییە ناودارەکانی ئەو گوندە:

له ئاست وەرگرتنی پله و پایه له بواری پۆلیس و سوپا، خێزانی عابدین بەشی زۆرتریان پێ براوه لەچاو خێزانی کورد. لەگەڵ هەندێش هەندێك کەسایەتی لە خێزانی کورد هەڵکەوتوون که پلەی بەرزیان بەدەست هێناوه وەك :"حاج عبدالستار الکردی" که ئێستا گەورەترین کەسی نێو خێزانی کوردییە، ئەو سکرتێری پارێزگاری پێشووی قلیو بووه، تەمەنیشی دەگاتە نەوەد ساڵ.. یەکێك له کەسایەتییەکانی ماڵباتی کوردی وەقفێکی لە گوندەکەدا کردۆتەوە بەناو (وەقفی عرفانی کوردی)[251]. که بریتییە لە دوو دۆنم زەوی، لەسەر یەکێکیان بنکەی لاوان و قوتابخانەی گوندی



تابلۆی قوتابخانەیەکی شارۆچکەی منشاه الکردی

دروست کراوه، ئەوەی تریش گۆڕستانی گوندی لەسەر دروست کراوه، که سێیەکی تەرخانکردووه بۆ ماڵباتی کوردی و سێیەکیشی تەرخان کردووه بۆ ماڵباتی عابدین و سێیەکەی تریشی تەرخان کردووه بۆ ماڵباتەکانی تری گوند.

## شەشەم: ( منشاة الكردي ) و ( عزبة الكردي ):

(منشاة الكردي) گوندێکی کشتوکاڵییه و سەر بە ناوەندی (کفر الزیات)ە لە پارێزگای غەربییە. نزیکەی (٨کلم) له (کفر الزیات) و (١١٠کلم) لە قاهیرە دووره تێکرای خەڵکەکەی لەسەر کشتوکاڵ دەژین. بە ناوبانگترین ماڵباتەکانیشی بریتین لە : ماڵباتی "الکردی"، که نزیکەی (٢٠٪)ی حەڵکەکەی پێکدێنن، لەچاو ماڵباتەکانی دیکەی گوند زۆر دەوڵەمەندن و (٦٠٠ ) دۆنم زەوییان هەیە.

**هۆی ناونانی گوندەکەیان بەم ناوە:**

بەر لە شەست ساڵ پێیدەگوترا "العداوي"، بەڵام کاتێك کە هەندێك لە ئەشرافەکانیماڵباتی کوردی (لەناویاندا سەبری کوردی پاشا) هەندێك دامەزراوەی نوێی وەك قوتابخانە و نەخۆشخانە و بنکەی لاوان و چەندانی تریان لەو گوندەدا دروست کردووە، ساڵی (١٩٤٨ن) لەسەر داوای خەڵکەکە و وەك ڕێزلێنانێك لە ماڵباتی کوردی، ناویان لێناوە "منشاه الكردی".

هەربۆیەشە ماڵباتی کوردی لە گوندەکە جێی ڕێزی تەواوی خەڵکەکەن، ماوەی (١١٥ ) ساڵیشە کوێخایەتی گوندەکە هەر بۆ ماڵباتەکەی کوردی ماوەتەوە، لە گرنگترین کوێخاکانیشی ئەمانەن:

- (محمد احمد عبدالله الكردي) یەکەم کوێخای گوند بووە لە (١٨٩٦ تا ١٩١٤ ن)، وە لەبەر ژیانی پڕ کەشخەیی و پۆزلێدان بە (ابو الذهب) ناسراوە. دوای ئەو، کوڕە مامەکەی بۆتە کوێخای گوند.
- (امین ابراهیم عبدالله الكردي) لە ( ١٩١٤ تا ١٩٣٨ن)، دوای ئەویش برازاکەی جێی گرتۆتەوە.
- (مصطفى حمدي الكردي) لە (١٩٣٨ تا ١٩٧٤ن)، دوای ئەو، کوڕی کوێخای پێشوو جێی گرتۆتەوە.
- (عبدالغفار امین ابراهیم الكردي) لە (١٩٧٤ تا ١٩٩٧ن)، دوای ئەمەش کوڕی کوێخای بەر لەخۆی جێی گرتۆتەوە.
- ئەندازیار (عباس افندي مصطفى حمدي الكردي) لە ( ١٩٩٧ تا ٢٠٠٤ن).
- کوێخای ئێستا (محمد مصطفى السيد الكردي) ناسراو بە (زەکەریا)، لە ساڵی (٢٠٠٤ن) تا ئێستا هەر کوێخای گوندە، پێشتریش نەقیب بووە لە هێزە چەکدارەکانی میسر.

ڕەچەڵەکی ماڵباتی کوردی دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەی زایینی،

کاتێك کە حکومەت لە ساڵی (١٨٩٨ز) وەفدێکی لە قاهیرەوە وەك حاکم بۆ سەر (ابیار) [٢٥٢] و ناوچەکانی دەوروبەری نارد لە ئبیار مایەوە، لەوێ خێزانی پێکەوە نا و دوو کوڕی بوون بە ناوەکانی ئەحمەد و ئیبراهیم. ئەو دوو کوڕە دوای کۆچی دوایی باوکیان، لە ساڵی (١٨٩٨ز) چوونە گوندی "العداوی" بۆ سەر زەوی و کشتوکاڵیان. ئیدی لەگەڵ خەڵکی گوندەکەدا جێگیر بوون و ژن و ژنخوازییان لەنێواندا دروست بوو.

هەرچی "عزة الكردي"یە، ئەوا ئەویش لە تەنیشت گوندی "منشاة الكردي" یە و هەر درێژکراوەی ئەویشە. یەکەم جار لە ساڵی (١٩٣٤ز) ژیان لەو گوندە دەستی پێکردووە، ئەویش دوای ئەوەی لکێك لە ماڵباتی کوردی چوونەتە ئەوێ و ئاوایان کردۆتەوە.

هەرچی سەبارەت بە کەسایەتییە بەناوبانگەکانی ئەو گوندەیە، ئەوان زۆرن و لە زۆر بواریشدا ناوبانگیان هەیە، لەوانە: "صبري باشا الكردي" ئەو (بەپێی گوتەی خوالێخۆشبوو مصطفى نبيل) یەکەم وەزیری ئاودێری میسر بووە لە سییەکانی سەدەی بیست. بەشداریشی کردووە لە دروستکردنی بەنداوی (العالی)، کچێکیشی بووە شووی بە ئەندازیار (احمد کمال)ی وەزیری پێشووی ئاودێری کردووە. هەرچی خوشکی سەبری پاشای کوردییە، ئەوا داپیرەی خوالێخۆشبوو مستەفا نەبیلە.

## حەفتەم: گوندی (الكردی) لە (قلین) لە پارێزگای (کفر شیخ):

گوندی کوردی گوندێکی کشتوکاڵییە و سەر بە ناوەندی قلینە لە پارێزگای کفر شێخ.(٤ کلم) لە شاری قلین و (١٢٤کلم) لە قاهیرە دوورە. رووبەرەکەی (١٥٠٢) دۆنمە و ژمارەی دانیشتووانی (١٨٠٠) کەسە، زۆربەی دانیشتووانەکەی لەسەر چاندنی لۆکە، برنج، گەنمەشامی، گەنم، پاقلە و چەوەندەر دەژین.

**هۆکاری ناونانی گوند بە (الکوردی):**

وێکچوونێك هەیە لە گێڕانەوەکانی خەڵکی گوند سەبارەت بە ناوی گوندەکە[٢٥٣]، ئەویش ئەوەیە کە ئەو گوندە لەنێو سنووری موڵکەکانی والی میر محەمەد عەلی دابووە، وە سەپانی ئەو زەوییانە ناوی (محەمەد عەلی کوردی) بووە و کەسێکی ناسراوی ئەو ناوچەیە بووە. گوندەکەش بەناوی ئەوەوە ناسراوە. خەڵك گوتوویانە ئێمە دەچین بۆ کوردی، واتە بۆ کێڵگەکانی کوردی. ئیدی بەمشێوەیە ناوی شوێنەکە بە ناوی کابرای کوردی لەسەر زاری خەڵکەکە سۆتە هێمای ناسینی زەوییەکان، پاشان لە نووسراوە فەرمییەکانی حکومەتی میسریش بەو ناوە ناسراوە. هەرچی سەبارەت بە چارەنووسی محەمەد عەلی کوردییە، دەڵێن ئەو لەگەڵ رابوونی شۆڕشی (٢٣ی تەمموز) ناوچەکەی بەجێ هێشتووە. تا ئێستاش کۆشکێك لە گوندەکە ماوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مەلەکی، کە سەپان (محەمەد عەلی کوردی) تێیدا نیشتەجێ بووە.

دوای رابوونی شۆڕشی (٢٣ی تەممووزی ١٩٥٢ز) و چەسپاندنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی، زەوییەکانی میر محەمەد عەلی کوردییان لە گوندەکە بەسەر ئەو جوتیار و پاڵانە دابەش کردووە، کە هەریەکەی دوو یان سێ دۆنمیان داچاندووە، بەپێی ژمارەی خێزانەکان. ئەو خەڵکەش لە پارێزگا جۆراوجۆرەکانەوە هێنراونەتە سەر زەوییەکانی میر محەمەد عەلی، بەڵام ئەوان لەسەر زەوییەکان لێیان داکوتاوە و ماونەتەوەو ماڵباتەکانی ئێستای گوندەکەیان پێکهێناوە.

---

٢٢٩- مامۆستا عەبدولڕەحمان حامد ( لە ماڵی عومەر- رێکخەری بەرنامەی خۆراکی جیهانی لە ئەسیوت) دیدارێك بوو لەگەڵیدا لە گوندی (الاکراد) رۆژی ٢ی نیسانی ٢٠١١ز.

Boris James: Saladin et les kurdes. L'Har Mattan. Mars 2006.pp 109-112. -٢٤٠

٢٤١- لەناویاندا: م.د. مەحمود عەبدولڕەحمان، هەروەها م.محەمەد عەبدولڕەزاقفیراج، وە م.عەبدولڕەحمان حامد لە گوندی (الاکراد)، ٢ی نیسانی ٢٠١١ز.

Boris James: Op Cit. pp 109-112. -٢٤٢

Boris James: Op Cit. pp 109-112. -٢٤٣

٢٤٤- هەیە دەڵێ جرابعە لە سکرا یەکێك لە سکەکانی هۆزی ربیعەن، هەشە دەڵێت ئەوان سکە هەرە بژاردەکەی باقی خێڵی ربیعەن سەبارەت بە داب و نەریتو تەنانەت لە زمانیش. ئەوان هەمیشە لە شوێنێکدا دەژیان کەس دەستی لە کاروباریان وەرنەدەدا. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ئەوان ڕۆڵیان هەبووە لە یارمەتی دانی دەوڵەتی فاتمی، تا ئەوکاتەی سەلاحەددین بەسەریاندا زاڵ بوو. جا هەڵسا بە پەرت و بڵاوکردنەوەی خێزانەکانیان لە سەراپای مسر، بڕوانە: عبدالله السید مخیمر، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٤.

٢٤٥- دیدارێك لەگەڵ تاهر ئەحمەد ئیسماعیل لە گوندی (الاکراد) ڕۆژی ٣ی نیسانی ٢٠١١ز. هەروەها دیدار لەگەڵ محەمەد عەبدولڕەزاق فراج لە ٢ی نیسانی ٢٠١١ز.

٢٤٦- دەگوترێ کە مانای وشەی میت واتە "هەڵوێست"ە و هەشە دەڵێت مانای وشەی میت واتە "زۆر" دێت.

٢٤٧- دیدارێك لەگەڵیاندا لەماڵەکەی لە گوندی "میت الاکراد"، ئەو لە لەدایکبووانی ساڵی ١٩٥٥ز، لە یەکێك لە کارگەکانی چنین و ڕستن کاری دەکرد.

٢٤٨- مامۆستا ئەحمەد محەمەد مەحمود عید، لەدایکبووی ٢٨ /١٠ /١٩٤٣ز، دەرچووی کۆلیژی بازرگانییە لە مەنسورە لە ساڵی ١٩٧٠ز، سەرەتا بە مامۆستایەتی لە قوتابخانەیەکی بازرگانی دەستی بەکار کرد. دواتر لە بازرگانیدا دەستی بەکار کرد. یەکێك لەوانەی پاڵێوراو بوو بۆ هەڵبژاردنە ئەنجوومەنی شورا لە ساڵی ٢٠٠٢ز. دیدارێکمان لە ماڵەکەی لە شاری (الکردی) لە ڕۆژی ٣٠ /٤ /٢٠١١ز، لەگەڵدا ئەنجام دا.

٢٤٩- لەناویاندا: م. محەمەد مستەفا ئیبراهیم مستەفا کوردی، ئەو لەدایکبووی ئەیلولی ١٩٧٢ز، دەرچووی ڕاژەی کۆمەڵایەتییە لە زانکۆی قاهیرە لە ساڵی ١٩٦٦ز. پسپۆری کاری لاوانە لە بنکەی لاوانی کفر کوردی. م. محەمەد عەلی حوسێن ئیبراهیم کوردی، یەکێکە لە ڕۆڵەکانی کفر کوردی، هەروەها سەرۆکی بەشی کارگێڕی زانستییە لە کفر شوکر. م. سەلاح کوردی لەدایکبووی ١٩٣٤ز. دیدارێك لەگەڵ هەموویان ئەنجامدرا لە گوندی کفر کوردی لە ڕۆژی ١٦ی نیسانی ٢٠١١ز.

٢٥٠- ناوەندی کفر شوکر سەر بە پارێزگای قلیوبی ئێستایە.

٢٥١- لە نەوەی سێیەمە لە دامەزرێنەرانی گوندی (کردی)، هەروەها کوێخای گوندەکەشە.

٢٥٢- ئێستا گوندێکە سەر بە ناوەندی (کفر الزیات)، ژمارەیەکی زۆر ناوداری تێدا هەڵکەوتوون، وەك (د. محمد البرادعین) و( د. محمد علی حله)ی مامۆستای مێژووی نوێ و هاوچەرخ لە زانکۆی ئەزهەر.

٢٥٣- لەناویاندا: حاجی محەمەد شەرنوبی حەسری، لەدایکبووی ١٩٢٧ز، ئێستا خانەنشینکراوە. لە کۆمەڵەی چاکسازی کشتوکاڵی کاری دەکرد. هەروەها حاجی عەوز مەمدوح زەعولی لەدایکبووی ١٩٤٩ز (لە ساڵی ٢٠٠٢ کوێخای گوندەکەیە). ئەندازیار حوسنی محەمەد بحەیری، لەدایکبووی ١٩٥٣ز، بەکالۆریۆسی هەیە لە کشترکاڵ لە ساڵی ١٩٧٣ز، لە زانکۆی کفر ئەلشێخ. چەندین بەرپرسیاری وەرگرتوون، ئێستا بەڕێوەبەری کۆمەڵەی چاکسازی کشتوکاڵییە لە گوندی کفر ئەلشێخ. ئەندازیار محەمەد عەبدولمەجید، لەدایکبووی ١٩٥٨ز، دەرچووی کشتوکاڵە لە کفر ئەلشێخ، ئەندازیاری کشتوکاڵە لە کۆمەڵگای گوندی کوردی.

## سەرچاوەكان ( عەرەبییەكان ):


- الانجيل
- التوراة
- القرءان الكريم
- (ابن الاثير) : عزالدين ابو الحسن علي بن ابي الكرم الجزري (ت ٦٣٠هـ/ ١٢٣٢م).
-(التاريخ انباهر في الدولة الاتابكية): تحقيق عبدالقادر احمد طليمات، دار الكتب الحديثة، القاهرة ١٩٦٣م.
-الكامل في التاريخ، تحقيق عبدالله القاضي، الطبعة الثانية، دار الكتب العلمية، بيروت.

٥- اسكندر صيفي: المنارة التاريخية في مصر الوثنية و المسيحية. المطبعة المصرية بالقاهرة.

٦- ابن اياس: محمد بن احمد بن اياس الحنفي المصري (ت ٩٣٠هـ/ ١٥٢٣م)
- بدائع الزهور في وقائع الدهور، تحقيق محمد مصطفى، مطبعة دار الشعب، ١٩٦٠م.

٧- البدليشي: الامير شرف خان بن الامير شمس الدين بن شرف خان الروزكي (ت ١٠١٠هـ/ ١٦٠١م).
- شرفنامه ترجمة محمد جميل الملا احمد الروزبياني، ط٢، موءسسة موكرياني للطباعة و النشر اربيل ٢٠٠١م.

٨- د. بله ج شيركوه: القضية الكردية، ماضي الكرد و حاضرهم. القاهرة ١٩٣٠م.

٩- ابن تغري بردي: جمال الدين ابي المحاسن يوسف الاتابكي (ت ٨٧٤هـ/ ١٤٦٩م).
- النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة. ج٥ مطابع كونستا تسوماس و شركائه، القاهرة ١٩٧٠م، ج١٥ تحقيق ابراهيم علي طرخان، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٧٢م.

١٠- جلبي: اوليا جلبي الرحالة التركي: سياحتنامه مصر، ترجمة: محمد علي عوني، تحقيق د. عبدالوهاب عزام، د. احمد السعيد سليمان، مطبعة دار الكتب و الوثائق القومية المصرية، ١٤٣٠هـ/ ٢٠٠٩م.
١١- د. جمال حمدان: شخصية مصر. الجزء الرابع، طبعة دار الهلال، القاهرة ١٩٩٥م.
١٢- د. دوال رشيد: ظهور الكرد في التاريخ، ثلاثة اجزاء، دار اراس للطباعة والنشر، اربيل، كردستان العراق، الطبعة الاولى، ٢٠٠٣م.
١٣- جوليل سامسون: نفرتيتي الجميلة، ترجمة مختار السويفي، الدار المصرية اللبنانية، الطبعة الثانية- القاهرة ١٩٩٨م.
١٤- ابن حجر العسقلاني: شهاب الدين احمد بن علي بن محمد (ت ٨٥٢هـ/ ١٤٤٨م).
١٥- الحنبلي: ابن العماد الحنبلي ابو الفلاح عبد الحي.
- شذرات الذهب في اخبار من ذهب، مكتبة القدس، (ط:بلا) القاهرة ١٩٧١م.
١٦- ن.ا. خافين: الصراع على كردستان"المساءلة الكردية في العلاقات الدولية خلال القرن التاسع عشر" ترجمة عن الروسية د. احمد عثمان ابو بكر، بغداد ١٩٦٩م.
١٧- ابن خلكان: ابو العباس شمس الدين احمد بن محمد بن ابراهيم (ت ٦٨١هـ/ ١٢٨٢م).
١٨- خير الدين الزركلي: الاعلام، دار العلم الملايين- بيروت ٢٠٠٢م.
١٩- رشيدة تيمور: السلامك. الهيئة المصرية العامة للكتاب- القاهرة ٢٠٠٨م.
٢٠- السخاوي: شمس الدين محمد بن عبدالرحمن (ت٩٠٢هـ/ ١٤٩٧م).
- الضوء االلامع لاهل القرن التاسع، دار مكتبة الحياة بيروت، (د.ت).
٢١- د. سعيد عبدالفتاح عاشور: اضواء جديدة على الحروب الصلي، الناشر الدار المصرية للتاليف والترجمة، القاهرة ١٩٦٤م.
- الايوبيون و المماليك في مصر و الشام، دار النهضة العر، القاهرة ١٩٩٦م.
٢٢- السيوطي: عبدالرحمن بن الكمال ابي بكر (ت ٩١١هـ/ ١٥٠٥م).
- نظم العقيان في اعيان الاعيان. تحقيق فليب حتي، مكتبة الثقافة الدينية، القاهرة ١٩٩٨م.

٢٣– ابن الشداد: عزالدين ابو عبدالله محمد بن علي ابراهيم الانصاري (٦٨٤هـ/ ١٢٨٥م).
– سيرة صلاح الدين "النوادر السلطانية و المحاسن اليوسفية"، دار المنار، القاهرة ٢٠٠٠م.
٢٤– د. شوقي ضيف: شوقي شاعر العصر الحديث، مكتبة الاسرة، القاهرة ٢٠١٠م.
٢٥– الصفدي: صلاح الدين خليل بن ايبك (ت٧٦٤هـ/ ١٣٦٢م).
– الوافي بالوفيات، حققه الارناوءوط و تركي مصطفى، دار احياء التراث العربي، بيروت ٢٠٠٠م.
٢٦– د. عادل عبد الحافظ حمزة: العلاقات السياسية بين الدولة الايوبية و الامبراطورية الرومانية المقدسة زمن الحروب الصليبية. الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ٢٠٠١م.
٢٧– عبدالرحمن الرافعي: تاريخ الحركة القومية، ج ٢، مكتبة الاسرة، القاهرة ١٩٩٩م.
٢٨– د. عبدالرحمن قاسملو: كردستان و الاكراد، دراسة سياسية و اقتصادية، بلبيروت، طبعة الاولى ١٩٧٠م.
٢٩– د. عبدالعزيز سليمان نوار: تاريخ العراق الحديث من نهاية حكم داود باشا الى نهاية حكم مدحت باشا. دار الكاتب العربي، القاهرة (١٣٨٧هـ/ ١٩٦٨م).
٣٠– عبدالله السيد مخيمر: انساب العرب فيما اهماه العرب في مروج الصحاري بانبوب و الفتح و البداري. المركز العلمي للطباعة– القاهرة ١٩٩٨م.
٣١– د. عفاف لطفي السيد: مصر في عهد محمد علي، ترجمة عبدالسميع عمر زين الدين، و مراجعة السيد امين شلبي، منشورات المجلس الاعلى للثقافة (المشروع القومي للترجمة)، الطبعة الاولى، القاهرة عام ٢٠٠٤م.
٣٢– عمر الاسكندري: الميجر ا.ج. سفدج، القاهرة ١٩٢٠م.
٣٣– ابو الفداء: الملك الموءيد عمادالدين اسماعيل الايوبي (ت ٧٣٢هـ/ ١٣٣١م).
– تاريخ ابي الفداء المسمي المختصر في اخبار البشر، حققه محمود ايوب، دار الكتب العلمية، بيروت ١٩٩٧م.

٣٤- فيليب حتي: تاريخ سورية و لبنان و فلسطين، بيروت دار الثقافة، ١٩٥١م.
٣٥- قادر اسحاق ناتخو: التاريخ الشركس، ترجمة محمد ازوقة، ط١، دار ورد الاردنية للنشر و التوزيع ٢٠٠٩م.
٣٦- د. قاسم عبده قاسم: عصر سلاطين المماليك/ط١، دار الشروق، القاهرة ١٩٩٤م.
٣٧- القلقشندي: ابو العباس احمد بن علي (ت ٨٢١هـ/ ١٤١٨م).
٣٨- د.كمال الدين سامح: العمارة الاسلامية، مطبوعات معهد الدراسات الاسلامي، القاهرة ١٩٩١م.
٣٩- دكتور ب. ليرخ: دراسات حول الاكراد و اسلافهم الخالدين الشماليين، ترجمه عن الروسية د. عبدي حاجي، منشورات دار علاءالدين، حلب ١٩٩٢م.
٤٠- محمدامين الكردي: تنوير القلوب في معاملة علام الخيوب، القاهرة ( ١٣٨٤هـ/ ١٩٦٤م).
٤١- د. محمد علي الصويركي: الكرد في بلاد مصر، بحث ضمن كتاب عنوانه: محمد علي عوني الموءرخ والاديب الكردي المصري (١٨٩٧- ١٩٥٢م).
٤٢- محمد امين زكي بك: خلاصة تاريخ الكرد و الكردستان، ترجمة محمد علي عوني/ منشورات الجمعية اللبنانية- بيروت، الطبعة الثانية ٢٠٠٣م.
٤٣- محمد امين زكي بك: مشاهير الكرد و الكردستان، ترجمة محمد علي عوني، دار الزمان دمشق ٢٠٠٦م.
٤٤- محمد علي عوني: الرسالة العونية في الاسرة التيمورية، مخطوطة غير منشورة، وهو محفوظة بمكتبة ابنته الاستاذة درية عوني.
٤٥- محمد فريد بك: البهجة التوفيقية في تاريخ موءسس العائلة إلخديوية، منشورات دار الوثائق القومية، الطبعة الثانية، القاهرة ٢٠٠٦م.
٤٦- مصطفى مختار: امة الكرد بين ظلم اعدائها وجهل اصدقائها، مكتبة جزيري بدهوك (كردستان العراق)، الطبعة الاولى ٢٠٠٧م.
٤٧- د. مصطفى العبادي: الامبراطورية الرومانية " النظام الامبراطوري و مصر الرومانية"، دار المعرفة الجامعية، الاسكندرية، ١٩٩٩م.
٤٨- المقريزي: تقي الدين احمد بن علي بن عبدالقادر بن محمد (ت ٨٤٥هـ/ ١٤٤١م).

- السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق محمد عبدالقادر عطا، دار الكتب العلمية، بيروت ١٩٩٧م.
- المقفي الكبير، تحقيق محمد البعلاوي، ط٢، دار الغرب الاسلامي، بيروت ٢٠٠٦م.
- المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والاثار المعروف بالخطط القريزية، وضع حواشيه خليل منصور، دار الكتب العلمية، بيروت ١٩٩٨م.
٤٩- ميري بصري: اعلام الكرد.
٥٠- د. نجم الدين الكردي: خلاصة كتاب المواهب السرمدية في مناقب السادة النقشبندية، القاهرة (١٣٨٤هـ/ ١٩٦٤م).
٥١- نشاءت الديهي: محمد علي باشا بدايات قاسية و مجد عظيم. طبع دار الجمهورية للصحافة ضمن سلسلة " كتاب الجمهورية"، القاهرة، اغسطس ٢٠٠٩م.
٥٢- د. نظير حسان سعداوي: التاريخ الحربي المصري، مكتبة النهضة، بغداد ١٩٥٧م.
٥٣- نيكتين: الكرد، دراسة سوسيولوجية تاريخية، ترجمه عن الفرنسية و علق عليه د. نوري طالباني، منشورات مكتب الفكر والتوعية في الاتحاد الوطني الكردستاني، السليمانية، الطبعة الثالثة ٢٠٠٧م.
٥٤- هنري باركي، واخرون: القضية الكردية في تركيا، ترجمة هفال، موءسسة موكرياني للبحوث والنشر- اربيل، الطبعة الاولى ٢٠٠٧م.
٥٥- ابن واصل: ابو عبدالله بن محمد بن سالم بن نصرالله المازني التميمي الحموي الشافعي الملقب ب ابن واصل (ت ٦٩٧هـ).
٥٦- ياقوت الحموي: شهاب الدين ابو عبدالله ياقوت الحموي الرومي البغدادي (ت ٦٢٦هـ).
- معجم البلدان، تصحيح الشيخ احمد بن الامين الشنقيطي، ط١، مطبعة السعادة، القاهرة (١٣٢٤هـ/ ١٩٠٦م).

### سەرچاوە بە زمانی تر:

1- Boris James: Saladin et les Kurdes. L"HarMattan. Mars 2006.
2- Hassan Arafat: The Kurds An historical and political study. Oxford University Press. London- New York- Toronto. 1966.

### تۆڕی ئینتەرنێتی نێودەوڵەتی:

1-http: //www.iraqhurr.org/content/ articale/ 1681769.html.
2- http: //kurdsyria.wordpress.com.
3- http: //www.toutankharton.com/monatada/ view-topic. Php?id=331.
4- http: //www.gilgamish.org/viewarticle.php? id=Kurdish_persons-20061118-324.
5- http: //www.mriraq.com/vb/showthread.php? p=435270.
6- http: //3raqi-ana.com/ vb/showthread.php? p=437026.
7- http: //www.bingeh.com/news.php? action=view&id=30.

## دیدار و چاوپێکەوتنەکان (سەرچاوە مەیدانییەکان):

١- دیدار لەگەڵ (ا. طاهر احمد اسماعیل) لە گوندی (جزیرة الاكراد) رۆژی (٣ی نیسانی ٢٠١١ن).

٢- دیدار لەگەڵ هەریەکە لە (ا.محمد عبدالرزاق فراج، ا.د. محمود عبدالرحمن، ا. عبدالرحمن حامد) لە گوندی (الاكراد) لە (٢ی نیسانی ٢٠٠١ن).

٣- دیدار لەگەڵ (ا. احمد محمد محمود عید) لە ماڵەکەی خۆی لە شاری (الكردی) رۆژی (٣٠-٤-٢٠١١ن).

٤- دیدار لەگەڵ هەریەکە لە (ا. محمد مصطفى ابراهيم مصطفى الكردي، ا. ممدوح محمد علي حسين ابراهيم الكردي، ا.صلاح كردي) لە گوندی (کفر کردی) رۆژی (١٦ی نیسانی ٢٠١١ن).

٥- دیدار لەگەڵ هەریەکە لە (الحاج محمد الشرنوبي الحصري، الحاج عوض ممدوح الزعولي (کوێخای گوند)، المهندس حسني محمد البحيري، المهندس محمد عبدالمجيد) لە گوندی (الكردی) لە قلین سەر بە پارێزگای کفر شێخ.

٦- دیدار لەگەڵ (ا. ماجد فرج) لە گەڕەکی (العجوزة) لە قاهیرە، لە (٢٨ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٠ن).

٧- دیدار لەگەڵ (د. عمرو محي الدين) لە ماڵەکەی خۆی لە (٢٣ی حوزەیرانی ٢٠١١ن).

٨- دیدار لەگەڵ (ا. محمود الحلوجي) جێگری بەڕێوەبەری مۆزەخانەی میسر، لە (٢١ی یولیۆ ٢٠١١ن).

## گۆوار و ڕۆژنامەکان:

١- ڕۆژنامەی (الاهرام المصرية)، ژمارەی ڕۆژی (١٢ی کانونی یەکەمی ٢٠٠٥ز).
٢- ڕۆژنامەی (الحياة)، ژمارە (١١٠٠٨)، ڕێکەوتی (٣ی نیسانی ١٩٩٣ز).
٣- ڕۆژنامەی (اليوم)، ریکەوتی (٢٠-٧- ٢٠٠٩ز).
٤- گۆواری (المصور)ی میسری، ژمارە (١٣١١) ڕێکەوتی (٢٥ی تشرینی دووەمی ١٩٤٩ز).

## نووسەرانی کتێب:



*(**خاتوو دوڕەییە عەونی**- نووسەر و ڕۆژنامەوانی مسری و بە ڕەسەن کورد. ماوەی (٢٧ ساڵ) لە ئاژانسی هەواڵی فەرەنسی لە پاریس کاری کردووە، هەروەها پەیامنێری (دار الهلال) و (دار الاخبار الیوم) بووە لە پاریس، دوو کتێبی چاپکراوی هەیە لەسەر پێشوەچوونی پرسی کورد).



*(**مەحمود زاید** – مامۆستای یاریدەدەر لە زانکۆی ئەزهەر و پسپۆر لە کاروباری کورد لە مێژووی هاوچەرخ) .



*(**مستەفا عەومز**- مامۆستای مێژوو و شارستانیەتی ئیسلامی لە زانکۆی ئەزهەر)



## بەرهەمەکانی وەرگێڕ:



حوسێن مستەفا

• لە بنی دەریا... مرواری

– ئەندێشە، ( لە ٢٠١٢ چاپکراوە)

• ئاوداران

– وەرگێڕانە لە عەرەبی، (لە ٢٠١٢ چاپکراوە)

• بۆنی غەریبان دێ

– کورتە چیرۆک و نۆڤلێت، (لە ٢٠١٣ چاپکراوە)

• رواندز لە ئێستاو رابردوودا

– مێژوو، (لە ٢٠١٣ چاپکراوە)

.......................................................

• شوێنەوارەکانی خنس و گرنگییان

– وەرگێڕانە لە عەرەبی (ئامادەی چاپە)

• لەگەڵ کۆمەڵێك شیعر (ئامادەی چاپن)

* دەیان وتاری لە گۆڤارو رۆژنامەکان بڵاوکراوەتەوە.



لەناو ئەو ململانێ سەخت و دژوارانەدا.

هەرچەندە کە کورد خۆی گرت و نەتوایەوە. بەڵام لەهەندێك قۆناغ و وێستگەی ئەو کاروانە خوێناویەدا. چ بۆ دەربازکردنی سەر و گیان بووبێ تا دەرفەتی هەڵسانەوەی بۆ دێتە پێش.چ بۆ کەڕان بەدوای سەرچاوەکانی ژیان و ژیاری و خوێندەواری و زانست بووبێ. چ وەك دوورخستنەوەی بێ ویستی خۆی بووبێ. لێرەو لەوێ. پەنای وەبەر پەسیوان بردووەو لە وڵاتانی دوور یان نزیك. لەبەرچاوان یان لاتەریك. خۆی گرتۆتەوەو تێکەڵ بە کۆمەڵکاکانیان بووەو وەك میوانێکی ڕەزا قورس نا. بەڵکو وەك هاوڵاتییەکی خۆجێیی وەفای نواندووەو دڵسۆز و ئەمەك لەچاو بووە بۆ نیشتمانی دووەم و پەناگەی ژیانی. بەڵام وەنەبێ لە بنەچەی ڕەسەنی خۆی هەترە بووبێ و حاشای لەشوناسی کوردبوونیەوە کردبێ. خۆ ئەگەر بەدوای سەلماندنی ئەو رایەشماندا بگەڕێین و بمانەوێ سۆراخ لەدۆتمام و پسمامەکانمان لە قوژبنەکانی جیهاندا بکەین. دەبێ بست بە بستی وڵاتانیان بەدوادا بپشکنین و دۆکیۆمێنتە مێژووییەکان هەڵدەینەوەو بە ڕەچەڵەکی هەر یەکەیاندا بچینەوەو سەریان ببەینەوە بەر دەرگای ماڵە باوانیان لە هەوارە بەجێماوەکانیان ......

....... لەپێشەکی کتێبەکەدا هاتووە




چاپخانەی ڕۆژهەڵات / هەولێر